

# مێژوو

٧

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،
کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات







# مێژوو

**گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی رۆشن[illegible]ژووی کوردستان دەریدەکات**



خاوەنی ئیمتیاز

پرۆفیسۆر د. ئەرسن موسا ردشید

سەرنوسەر

د. محەمەد عەبدوڵلا کاکەسوور

٤٧٨٠٥٣٨

makakasur@yahoo.com

سکرتێری نووسین

م. فارس قادر فەقێ عەبدوڵلا



تایپیست

احمد عمر علی

٠٧٥٠٣٠٣٠٥٠٥

بەرگ و نەخشەساز

هیمداد محەمەد ئەرگوشی

ژمارە (١٧)     ساڵی پێنجەم     زستانی ٢٠١١








* گۆڤار : مێژوو
* ژمارە : [ ١٧ ]
* تیراژ : [ ٥٠٠ ] دانە
* چاپخانە : رۆژهەلاْت

**کوردستان / هەولێر - کۆلاْنی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێر**

g.mezhu@yahoo.com

g.mezhu@hotmail.com

# پێرست

## ◄ سەروتار

**با هەموومان لە خزمەتی مێژووی کوردا بین**

## ◄ توێژینەوە



## ◄ وەرگێڕان



## ◄ القسم العربي

## ◂ کەشکۆڵی گۆڤار

# با هەموومان لە خزمەتی مێژووی کوردا بین

سەرنووسەر

شتێکی لۆژیکییە کە مێژوونووس , مێژوو ناس , و نوسەری بواری مێژوو لە خزمەتی مێژووی کوردا بن .

بەلاّم ئەوەی نا ئاساییە کە مێژووی کورد و کارکردن و نووسین لە بواری مێژووی کوردا بکرێتە ئامراز بۆ خزمەت کردنی ناوێك یان هەندێك ناو لە بواری مێژووی کوردا . ئەوەی جێگای دلّخۆشییە یەکێك لەکارە گرنگەکانی کۆمەلّەی رۆشنبیری مێژوویی کوردستان بریتی بووە لەکاری هاوبەشی مێژوو نووس , مێژوو ناس , و نووسەرانی بواری مێژوو و رزگارکردنی مێژووی کورد لەوەی ببێتە ئامرازێك بۆ بە دەست هێنانی دەستکەوتی ماددی و مەعنەوی بۆ ناوێك یان چەند ناوێك . ئەوەتا ئێستا خزمەت کردنی مێژووی کورد بووەتە ئامانج و هەموو لە خزمەت کردنی ئەو ئامانجەدان , بۆیە شتێکی ئاساییە کە ئەم کارە ببێتە مایەی نارەحەت بوونی هەندێك کەس کە خۆیان لە سەرووی هەموو شتێك دەبیننەوە .

بەلاّم ئەوەی جێگای دلّخۆشییە کە هۆکارێکی تر هەیە بۆ پتر خزمەت کردنی مێژووی کورد کە بریتی یە لە بەشەکانی مێژوو لە زانکۆکانی کوردستان کە سالاّنە ژمارەیەکی باش لەنامەی ماستەر و دکتورا بەرهەم دەهێنن واتە سالاّنە ژمارەیەکی باش لە هەلّگر ـی بروانامەی ماستەر و دکتۆرا پێ دەگەیەنن بەشی مێژووی کۆلێجی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین لەم رووەوە زیاترین خزمەتی

کردووە بەمەش وایان کردووە کە زۆر کەس لە خزمەتی مێژووی کوردا بن و ئەم بوارە گرنگە لەسەر ناوێك یان چەند ناوێك پەکی نەکەوێت .

لە کۆتایدا دەڵێم هەر مێژوو نووسێکی گەورە یان مامۆستایەکی گەورە یان هەر زانایەك لە هەر بوارێك لە بوارەکانی دا گەورەییەکەی بەوە تەواو دەبێت کە زانستەکەی بڵاو بکاتەوە و قوتابی و شاگرد پێ بگەیەنێت نەك پێ ی وابێ کە هەر ئەو هەیە و خزمەتی کردووە و خزمەت دەکات و ئەگەر ئەو نەبێ زانست نەمێنێ !؟

# ڕەوتی ژیان و بەرهەمەکانی یاقوت حەمەوی

م.ی.تارا محەمەد دەشتی

پەرەسەندنی ڕەوتی زانستی لە هەر بوارێکدا پەیوەستە بە ڕۆڵی ئەو کارەکتەرانەی کە ئیشیان لەناو کردووە ، واتە زانست لەبەرەو پێشەوە چوونیدا، بە بەهرەو هەوڵدانی زاناکان و کاری بەردەوامیان لەم بوارەدا بەندە، هەڵبەت مێژوو یەکێکە لەو زانستە گرنگانەی کە کار لەناو ڕابردوو دەکات و هەوڵی ساغ کردنەوەی ئەو ڕابردووە دەدات ، بەشێوەی هەڵکۆڵینێکی زانستیانە ، هەروەها زانستێکە پشت بە ئارکۆلۆژیای مەعریفە دەبەستێ بۆ ئەوەی تەواوی ڕابردووەکان بەهەموو گرفت و کارەساتەکان بخاتە بەردەستی خوێنەر، هەربۆیەش ئەمڕۆکە بۆتە پێداویستیەکی سەرەکی بناغەی زۆر لە زانستەکانی تر لە بواری گۆڕینەوە یاخود سود لە یەك وەرگرتن.

ئەوەی یارمەتی دەدات و پشتگیریی دەکات ، لەبەیەك گرێدانی سەردەمەکان و بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی، ئەو بەرهەم و نوسراوانەیە کە ڕۆچوونەتە ناو زەمینەی مێژوو و کار لەناو کایەکانی ڕابردوو دەکەن ، یەکێ لەو ولأتناسانەی کەخاوەن بەرهەمێکی زۆرە ، سەرچاوەکانیشی و هەندێ لایەنی مێژوویی و مۆرك و ڕەسەنایەتی زۆر لەنەتەوەکان بەدیار دەخات، مێژووی کوردیش لەبەشێکی زۆری بەرهەمەکانی ئەم گەریدەو ولأتناسانە خۆی دەبینێتەوە ، بەتایبەتی لە کتێبی (معجم البلدان)ی ، کە بەشێوەیەکی بەربلأو و فراوان مێژووی شار ە کوردیەکان پیشان دەدات . زانیاریەکانیشی ، لەو گەڕان و گەشتانەی کەخاوەنی بەرهەم پێی هەڵساوە سەرچاوەی گرتووە ، جگە

لەکۆکردنەوەو سود وەرگرتن لەزانیاری سەرچاوەی جۆراو جۆری هەموو ئەمانە وەکو کۆڵەگەیەکی پڕ لەزانستی کردۆتە بەرهەمێکی بەنرخ و لێکۆڵە رەوەکان و مێژوونووسان تاوەکو ئیستاش پشتیان پێ بەستووە.

لەم کورتە باسەشدا تیشك دەخەینە سەر (( **ژیان وبەرهەمەکانی یاقوت**)) باس لە ناو و رەچەڵەك و نازناوو شوێنی لە دایك بوون و چۆنیەتی پێگەیشتن و گەشتەکانی یاقوت دەکات، وە رۆڵی ناوبراو لە بواری بازرگانی و دواتر تیشك خراوەتەوە سەر دوا سەرنجی بۆ ژیان ،هەروەها بەکورتی باس لەو بەرهەمانە کراوە کە لەبەردەستدا بوون وناوی ئەو بەرهەمانەش هێنراوە کەبەردەست نەکەوتوون.

## یەکەم: بنەچە و رەچەڵەکی:

ناوی (ابو عبدالله یاقوت بن عبدالله الرومی البغدادی) [1]. یاخود (یاقوت بن عبدالله الحموی الرومی) یە [2] ئەگەرچی سەبارەت بە ناوەکەی وا بەدیار دەکەوێ کە گۆڕانی تێکەوتبێ، بەڵام بەگشتی بە ناوی یاقوت ناسراوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەیەکی چەسپاومان لەبەردەست دا نییە، کە یاقوت ناوی راستەقینەی خۆی بێت. چونکە کۆیلە و بەندەکانیش لەسەردەمانێ بەناوی بەردە بە نرخەکانی (یاقوت، کافور، زمرود) ناوبراون [3]. ناوبراویش یەکێك بووە لەو کەسانەی بۆتە دیل و بە کۆیلە کراوە، کۆیلەش وەکو دەستکەوت سەیر دەکرا. (کافور ابو مسك)[4]ی ش کە خاوەنەکەی سولتانی میسر (ئەخشیدی)[5] بوو، ئەمیش هەر بەم سامانە ناوبراوە. ئەگەر چی دوای ئەوەی یاقوت پێگەیشتووە، ناوی لەخۆی ناوە (یعقوب) [6] ئەمیش لەکاتێکدا، کەئازاد بوو و کاری بۆ ژیانی رۆژانەی خۆی کردووە،وە رەنگە ئەم ناوەی لەبەر ئەوە هەڵبژاردبێت، لەناوەکەی

خۆی نزیکە و ،بەلام مانایەکی کۆیلەی نادات. لەگەل ئەمەشدا ناوەکۆنەکەی بەگشتی لەلای خەلك بەسەریدا چەسپاوە .

لە پالّ ناوی یاقوت لەکاتی ناساندنی، نازناوی تـر بـە دی دەکرێـت، کـە ژیـان و بەسەرهاتی ئەو پیشان دەدەن. وەکو (حەمەوی) [٧] بۆ خاوەنەکـەی (عـسکر بـن نـصر بـن ابـراهیم الحمـوی) دەگەڕێتـەوە، خـەریکی بازرگـانی بـووە و یـاقوتی بەکۆیلـە کڕیوەتـەوە [٨]. بـەدیلی هێنراوەتـە بەغدادو پاشـان لەگـەلّ یـاقوت لـە شـاری بەغـدا نیـشتەجێ بـووە، هەربۆیـەش نـاوبراو بـە (بەغـدادی)ش ناسـراوە [٩]. وەنازنـاوی (شەهابەدین)ی [١٠] کە پێوە لکاوە بۆ گەورەی وناوبانگی کەسایتی یاقوت دەگەڕێتەوە.

بەلاّم وشەی (رۆمی) [١١] رەچەلّەکی یاقوت پێ دیار دەکرێت، چونکە لە ولاّتـی رۆم (ئاسیای بچوك) لەدایك بووەو هەر لەوێشەوە بە دیل گیراوە و کراوەتە کۆیلە [١٢]. بـەلاّم لە رایەکی تردا هاتووە، رۆمی نەبووبێ، بەلّکو عەبدوللاّی باوکی، لەولاتی رۆم دەستگیر کراوە، ماوەیەك لەوێ ماوەتەوە، هەر لەوێـشەوە خێزانـی پێـك هێنـاوە، یـاقوتیش لـەو کاتـە لـەدایك بـووە، پاشـان لـە شـەڕێکی نێـوان عەرەبـە موسـولمانەکان و ڕۆم بـەدیل گیراوەو کەوتۆتـە دەسـت عەرەبـەکان و بـە ڕۆمیـان لـە قەلّـەم داوە ، یـاخود مامەلّـەی ڕۆمیان لەگەلّ کردووە [١٣]. لەگەلّ ئەمەشدا گومان لە ڕاستیی ناوی باوکی یـاقوت هەیـە، کە (عەبدوللاّ) بێت، چونکە لای عەرەب وا باو بووە کەسێکی نەناسـراو بێـت یـان نـاوی باوکی یا باپیری دیار نەبێت پێی دەلّێن (عەبدوللاّ یاخود ئەبوعەبدوللاّ) [١٤].

هەر سەبارەت بە بنەچەکەی، ڕۆژهەلاّتناس (جان. س. ریسلەر) لە کتێبی شارستانی عەرەبیدا دەلّێ:- (یاقوت کۆیلەیەکی یۆنانی بووە). [١٥] بەلام(کمال الدین ابی البرکـات) ناسراوبە (ابن الشعار الموصلی) (م:٦٥٤ ك/١٢٥٦ز) وەسفی دەکات و دەلّێـت: ((یـاقوتم لـە شـاری موسـل بینیـوە پیـاوێکی ڕەنـگ سـووری چاوشـینی پـرچ زەرد بـووە)) [١٦].هـەروەها لەرایـەکی تـردا هـاتووە، کـەدایك وبـاوکی یۆنـانی بـوون.( [١٧] )، ئەمـەش ڕەچەلەکە گریکیەکەی دەسەلمێنێت.

## دووەم: لەدایکبوون و پێگەیشتنی:

ئەدیب و زمانزان و شاعیری مێژوونووس، گەشتیاری جوگراف ولاتناس[١٨] یاقوت لە نێوان سالانی (٥٧٤-٥٧٥ك/١١٧٩-١١٨٠ن) هاتۆتە دونیاوە[١٩]. سەرەتا بەدیلی هێنراوەتە بەغداو بازرگانێکی خەلکی شاری حەما ،دانیشتوی شاری بەغدا کڕیویەتیەوە([٢٠]) ،وە دوای بەکۆیلە بوونی کاتێ پێگەیشتووە، بە کاری بازرگانی خەریك دەبێت، کە هاندەری سەرەکی بۆ ئەم کارە خاوەنەکەی بووە، ڕێگەی بۆ خۆش دەکات و بە بەڕێوەبەری کارە بازرگانییەکانی خۆی داناوە، چونکە خۆی جگە لە بازرگانی ، شارەزایی لە نووسین و زانستی تر نەبوو[٢١]،هەربۆیەش پێویستی بە کەسێك دەبێت بۆ هەلسووڕاننی کاروبارەکانی،بەمەش یاقوتی ناردۆتە بەر خوێندن و لەسەر کارە بازرگانییەکانی رایهێناوە [٢٢].

سەبارەت بە خوێندنی یاقوت ، سەرەتا لەبارەی زانستی زمان و ڕێزمان ڕووەو خوێندن چووە، زانیاری لە زانایان وەرگرتووە[٢٣]. هەندێك لەو زانایانەی کە یاقوت بە مامۆستای خۆی داناون و زانیاری لێیانەوە فێر بووە، هەروەها ناویان لەبەرهەمەکانی بەرچاو دەکەوێت ئەمانەن:

١- ئەدیبی زمانەوان (عکبری)[٢٤] بەمامۆستایەکی یاقوت دادەنرێت ،لەبەر ئەوەی سەرەتای خوێندنی لای ئەو زانایە بووە،جگە لەوەش زانیاریەکانی لە فەرهەنگەکانی ناوبراودا ڕەنگ دەداتەوە [٢٥].

٢- (ابن یعیش)[٢٦] زانایەکی نەحوی بوو[٢٧] ، بە مامۆستای خۆی بۆ بەرهەمەکانی دادەنێت[٢٨].

٣- (علی بن المرجی) [٢٩]یاقوت لە بەرهەمەکانی پێمان رادەگەیەنێت، کەوا لەسەر دەستی ئەم زانایە فێری زمانی عەرەبی و زانستی هۆنراوە زانی (عروض) بووە.)[٣٠]

٤- (ابن الدبیثي)[٣١] ئەمەش خاوەنی ڕۆشەنبیری زانستی بووەو پایەیەکی بەرزو دیاری لای یاقوت

هەبووە[٣٢]. زانیاری لێوەرگرتووە بۆ کتێبی (معجم البلدان)[٣٣].

٥- (عبدالعزیز بن المبارك الجنباذي)[٣٤] یەکێك بووە لە مامۆستا ناسراوەکانی یاقوت[٣٥].

سەرەڕای ئەوەی بەردەوام بووە لە خۆفێرکردنی زانست، هەندێ لە کاتەکانیشی بۆ جێبەجێکردنی کاروباری خاوەنەکەی تەرخان کردووە ، هەروەها کاتێ ئەم شار و ئەو شاری دەکرد بۆ هەڵسەنگاندنی کارە بازرگانییەکانی، هەوڵی دەدا چاوی بە زانا و ئەدیبەکان بکەوێت ، هەروەکو کاتێ سەردانی (دوورگەی کیش)[٣٦]. کردووە[٣٧]، ئامادەی کۆڕوکۆبوونەوەکانی خەڵکانی ئەم ناوچەیە بووە، جگە لەو بەرهەمە جۆراوجۆرانەی چاوی پێکەوتوون، وەکو (ما اتفق لفظه واختلف معناه) کە لە دوو بەرگ پێك هاتبوو[٣٨]. وە لە ڕێگەی بینین و خوێندنەوەی بەرهەمی جۆراوجۆر فێری زانیاری بووە[٣٩].

بەم شێوەیە یاقوت لە سەردەستی چەندین مامۆستای زانست پەروەر و شارەزا و هەروەها بەشداری کردنی کۆڕ وکۆبوونەوەکان، توانیویەتی خۆی پڕ زانیاری بکات و لە دواییدا بەرهەمەکانی پێ دەوڵەمەند بکات.

## سێیەم: سەرچاوەی بیری زانستی:

روون و ئاشکرایە هەر تاکێك ئارەزوومەندی ئەوە بێت لە ڕیزی پێشەوەی زانست خوازەکان خۆی ببینێتەوە، ناوی خۆی تۆمار بکات لە ڕیزی هاوچەرخانی زانستی سەردەمی خۆی، ئەوا پێویستی بە هیممەتی گەورە و ماندووبوونی زۆرەوە هەیە، تا بەو پلە و پایە بگات کە دەیەوێ، زانستی لێرەدا بەو مەبەستە نایەت کە یاقوت وەکوئەوەی لە قوتابخانە وەریگرتبێت، بەڵکو وەکو ئەزمونی ژیان وهەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی زانست، گەران وسوران بووە، ئەمەوجگە لە هەندێ هۆکاری دیکە، کە بوونەتە هۆی گەورەیی یاقوت و ناوبانگی، لە خوارەوە باسی دەکەین:

## ١- بازرگانی:

ئەو چالاکییە ئابوورییە، کە مرۆڤ هەر لە کۆنەوە ئەنجامی داوە و بەردەوامە، (ابن خلدون) لەبارەیەوە دەڵێت: ((بازرگانی هەوڵدانە بۆ بەدەست هێنان و بوژاندنەوەی سامان و دارایی لە رێگەی کڕین و فرۆشتنەوەی کەلوپەل بە نرخی جیاواز، کە لە کۆتاییدا ئەم جیاوازییە دەبێتە قازانج))[٤٠].

یاقوت لەتەمەنێکی زووەوە کاری بازرگانی بۆ خاوەنەکەی ئەنجامداوە، لەبەر ئەوەی یەکێك لە کارە

سروشتیەکانی کۆیلە، بە جێگەیاندنی ئەو کاروبارەیە کە خاوەنەکەی پێیدەسپێرێت. گەشتە بازرگانییە سەرەتاکانی بۆ دوورگەی کیش ولاتی شام بووە[٤١].

بەڵام دوای ئەمە واتا لە ساڵی (٥٩٦ك/ ١١٩٩ز) ناکۆکی لە نێوان یاقوت و خاوەنەکەی ڕوو دەدات[٤٢]. ئەوکاتیش تەمەنی بیست و یەك ساڵ بووە، بۆیە لەکاری بازرگانی دەوەستێت و بەکاری لەبەرگرتنەوەی کتێب خەریك دەبێت[٤٣]. بینینی ئەو کتێبانەی کە کاری تێدا کردوون، سوودی بەلایەنی زانستیی کەسایەتی یاقوت گەیاندووە.

دوای ئاشتبوونەوەی لەگەڵ خاوەنەکەی، دووبارە ناوبراو بەلای کاری بازرگانییەوە دەچێت، بەڵام لەکاتی گەڕانەوەی لە یەکێك لە گەشتە بازرگانییەکانی، خاوەنەکەی کۆچی دوای کردبوو، بۆیە ئەو دەسکەوتەی کە بەدەستی هێنابوو هەندێکی بەخشییە ماڵ و خێزانی خاوەنەکەی، بەشێکیش کاری بازرگانی کتێبی

پێدەکرد[٤٤]، تاکو سوود لەو شارەزاییە بازرگانییەی کە هەیبوو وەربگرێت، پاشان سەردانی شاری (مەرو)[٤٥] دەکات هەر لەوێ دەگیرسێتەوە، سوودی لە کتێبخانەکانی ئەم شارە کە بە (خزانە الکتب)ناودەبران ، وەردەگرن[٤٦]. خواستنی کتێب لەو کتێبخانانە بەخۆرایی بووە، بۆیە یاقوت تا رادەیەکی زۆر بایەخی لێوەرگرتووە ونەنانەت هەندێکی لەم کتێبانەی لاماونەتەوە[٤٧].

بەڵام کاتێ هێرشی تەتەر و مەغۆلەکان بۆسەر جیهانی ئیسلامی دەستیپێکرد[٤٨]. هێرشەکانیان گەیشتە شاری (مەرو) لەساڵی (٦١٦ك/ ١٢١٩ز) ناوبراو ئەم شارە جێدەهێڵێت وبە تەواوی ماڵ وحاڵی کتێبەکانیەوە[٤٩]. لەگەشتێکی تری بازرگانی بۆ شاری حەلەب چاوی بە ئەبوعەلی قەیولی کەوتووە، کە کاریەدەستی وەزیر (ابن القفطي)[٥٠] بوو، کاری کڕینی کتێبی بۆ وەزیر دەکرد، چونکە وەزیر خولیای کتێب کۆکردنەوە بوو[٥١]. بەڵام دەربارەی ئەو کتێبانەی یاقوت کە بۆ ئەم شارەی بردووە، (ابن القفطي) دەڵێت:(( تەنیا دوو لە کتێبەکانیم بەدڵ بووە))[٥٢] بەم جۆرە یاقوت لە ڕێگەی بازرگانییەوە ئاشنایەتی لەگەڵ کتێب و کتێبخانەکان پەیدا کردووە، لەبەرهەمەکانیشی دا ڕەنگدانەوەی ئاشکرای ئێ بەدی دەکرێت.

## ٢- گەشت وگوزار:

گەشت جۆرێکە لە بزاوت و جوڵەوگەڕا ن وسووران بەشوێنە جوگرافیە جیاجیاکان دا، تێکەڵاوبوونە لەگەڵ سروشت و خەڵك و نەتەوەکان، بەهاکەشی دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ پەیداکردنی ڕۆشنبیریی مرۆڤایەتی، کەبەهۆی ئەو ئاشنایەتییەی لە هەندێ لایەنی ژیانی خەڵك و کۆمەڵگایەکی دیاریکراو لەکاتی دیاریکراودا سەرهەڵدەدات[٥٣]. گەشت و گەشتکاریش لەلایەن یاقوتەوە لە کتێبی (معجم البلدان) دا باسکراوە؛ بەتایبەتی ناوبراو وشەی (بینیم/رأیت)ی زۆری دووبارەکردۆتەوە[٥٤]، جگە لەو تێبینیانەی کە لە لای کۆبووەتەوە، لەکاتی باسکردنی هەرجێگایەك کە سەردانی کردووە.

یەکەمین گەشتی کە ئەنجامی داوە، هۆکاری بازرگانی دەبێت؛ هەروەکو ئامازەمان پێکرد بۆ دوورگەی کیش[٥٥]، لەماوەی ژیانیدا چوار جار[٥٦] بە ڕێگای وشکانی وئاوی بۆ ئەم ناوچەیە سەفەری کردووە؛ لە کاتێکدا کە مەڵبەندی بازرگانی و ژمارەیەکی زۆری بازرگانانی جیهانی ئیسلامی لەم ناوچەیە کۆ دەبوونەوە[٥٧]. دواتر سەردانی تەوریز و ئەرسل دەکات و لە ڕێگەی شادەوە بۆ ..مسر دەچێت[٥٨]. بەم شێوەیە لە دوای

تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەردەستپێکردنی گەشتەکانی، واتا ساڵی (٦١٣ك/ ١٢١٦ز) دا سەردانی دیمەشق و حەلەب دەکات، لە ڕێگەی موسڵەوە گەیشتۆتە هەولێر و لەم شوێنەشەوە ڕێگای خوراسانی گرتۆتەبەر[٥٩]. کاتێ دەچێتە (نیسابوور)([٦٠]) لەوێ نیشتەجێ دەبێت[٦١]. سەردانی شارەکانی خوراسان دەکات و دەچێتە شاری (نەسا)[٦٢]

هەروەها لە نێوان شاری (مەڕو) و (خەوارزم) هاتوچۆی بازرگانی دەکرد[٦٣]. هەر لەو کاتیشەوە تەتەرەکان بەدیارکەوتوون.بۆیە لەرێگەی شاری (الری) و قەزوین گەیشتۆتە هەولێر[٦٤]. دووبارە چۆتەوە موسڵ و

سەردانی سنجاریشی کردووە[٦٥]. لە کۆتاییدا لەشاری حەلەب گیرساوەتەوە[٦٦] تا دوایین تەمەنی. بەم جۆرە گەشت و گەڕانەکانی ماوەی شازدە ساڵی خایاندووە[٦٧].

## چوارەم: کۆچی دوایی کردنی:

یاقوت هەر لەو کاتەوەی شاری مەڕو بەجێدەهێڵێت، رووە و شاری موسل کەوتۆتە ڕێ و دواتر ماوەیەك لەم شارە دەمێنێتەوە. نامەیەك بۆ وەزیر (ابن القفطي) دەنێرێت[٦٨]. کە باس لە جیهانی ئیسلامی و هێرشی مەغۆلەکان دەکات. هەروەها لە نامەکەی دەردەکەوێت کە خواستی ئەوەی هەبووە بچێتە شاری حەلەب و بە پاڵپشتی وەزیری ناوچەکە نیشتەجێبێت[٦٩]. هەر بۆیەش پێویستی بە پشتگیری دەبێت، چونکە کاتێ یەکەم جار سەردانی وڵاتی شام دەکات، لە شاری دیمەشق لەگەڵ هەندێ کەسایەتی ئەم شارە تووشی گیروگرفت دەبێت ، لەبەر ئەوەی بیروڕای (خەوارجەکان)[٧٠]ی دەربڕیوە و پاڵپشتیانی کردووە، کەئەمەش بۆ ئەوەدەگەڕێتەوە جیهانی ئیسلامی تووشی پەرتەوازەی هات :کاتێ ناکۆکی لەنێوان عەلی ومەعاویە روویداوهەروەها خوێندنەوەی کتێب دەربارەی بیروڕای خەواریجەکان کاریگەر بووە لەسەر خودی یاقوت.بۆیەش رایەکانی دەربارەی عەلی کوڕی ئەبی تالب (٣٥-٤٠ ك/ ٦٥٦-٦٦١ز) خەلیفەی چوارەمی راشیدینیش نابەجێ بووە، لەوکاتیدا خەڵکی شارەکە

رووبـەرووی دەبنــەوە و تــەنگی پــێ هەڵدەچـنن، هــەر لەهــەمان کاتــدا شــارەکە بەجێدەهێڵێت[٧١].

جگە لەو بارودۆخەی کە بەلەدەستدانی ماڵ وسامانی لەشاری(مەڕو) تووشی هـاتبوو، بەڵام وەزیر وەڵامی نەداوەتەوە، پـاش ماوەیـەکی تـر یـاقوت سـەردانی شـاری حەلـەب دەکات و چاوی بەوەزیر (ابن القفطي) دەکەوێت و پێی دەڵێت :-((ئەوا بـە گوچـانەکەم لە دەرگای تۆم داوە و هیوام وایە لەتـەك جەنابتـەوە بم))[٧٢] سـەرەڕای ئـەوەی وەزیـر سـەرەتا نەکەوتۆتــە بــەر دڵـی، بـەڵام پێـشوازی لـێ دەکـات و مەعیـشەتی بـۆ دابـین کردووە[٧٣]. بۆیە لەم شارە دەمێنێتەوە، خەریکی زانست و کتێب دەبێت بەشداری لـە کۆڕوکۆبوونـەوەکانی ئـەم شـارە دەکـات، هـەروەها خـەریکی داڕشتنی بەرهەمـەکانی دەبێت و تاوەکو ساڵی (٦٢٦ك/ ١٢٢٩ز) ماڵئاوای لـەژیان دەکـات.[٧٤] (ابـن خلکـان)ش باسی رۆژی کۆچی دواییەکەی دەکـات و دەڵێـت: ((خـەڵکی بەسـەریان دا هەڵـدەگوت و باسی گەورەیی و خوورەوشتی بەرزیان دەکرد))[٧٥].

## پێنجەم: بەرهەمەکانی

هەموو بەرهەمەکانی یاقوت دەکرێ وەك سەرچاوەی زانستی وەری بگرین چونکە هەڵگری لایەنێکی دیار و پەرەسەندووی تیایە سەبارەت بەزانستی جوگرافیـا وئـەدەب و مێژوو و بابەتی جۆراوجۆر، کە دەکرێ بکرێت بە بنچینە بۆ لێکۆڵینەوە و نووسین، بەڵام هەنـدێ لـەو بەرهەمانــەی کــە مێژوونووســان ناویــان هێنــاوە، گەڕاندوویانەتــەوە بــۆ خاوەنەکەی، کە یاقوت حەمەویە. هەنـدێکیان لەبەردەسـت نـین و بەرچـاو نەکـەوتوون، تەنانەت دەست نووسەکانیشیان هەر بزرن ، بۆیە بەرهەمەکانی دەکەین بە دوو بەش:

### ١- بەرهەمە بەردەستکەوتووەکان:

أ- (معجم الادباء):

یەکێکە لـە بەرهەمـە بـە پێزەکـانی یـاقوت، کـە بـەناوی جیـاواز سەرچـاوەکان ئاماژەیـان بـۆ کـردووە ، بـەڵام هــەموو کـۆکن لەسـەر ئـەوەی ناوەرۆکەکـەی بـاس لـە

ئەدیبەکان و زانایان دەکات. بە ناوی (ارشادالالباء الى معرفـة الادبـاء)[٧٦] یـان تـەنیا بـە (الادباء)[٧٧] یا کتێبی (تحفة الادباء في اخبار الادباء)[٧٨]، هەروەها بـە (ائمـة الادب)[٧٩]، یان (ارشاد الاريب الي معرفة الاديب)[٨٠] لەگەڵ (طبقات النحـاة)[٨١] ش نـاوبردراوە، ئـەم جیاوازییەی کە لـەم دەسـتەواژانەی بـەدی دەکرێـت ئـەوە ناگەیـەنێت کـە هەریەکـەیان بەرهەمی سەربەخۆن یان جیاوازن، لەگـەڵ ئەمەشـدا هەنـدێك لەمێژوونووسـان دابەشـی دەکەن بۆ دوو بەرهەم هەروەکو (ابن المستوفي الاربلي)[٨٢] وەسفی کتێبەکە دەکـات بـە نـــــاوی (ارشاد الاريب الى معرفه الاديب)،[٨٣] بەڵام دواتر لەڕیزی بەرهەمی یاقوت ناوی (معجم الادباء) ی بەسەرچاوەیەکی تری یاقوت داناوە.[٨٤]

لەم کتێبـەدا باسـێکی زۆری لـە بـارەی زانایـانی زمـان و رەچـەڵەکناس و خـاوەن بەرهەمە ئەدەبیەکان و نامەبەر تێدایە، هەریەکەش بە نموونـە کـراوە و خـستراونەتەوە ڕوو[٨٥].

بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە بەرهەمـەکانیان[٨٦] ،تـەنیا بـاس لـە ئـەدیبی یـەك ناوچـە یاخود سەردەم ناکات ، بـەڵکو بـە شـێوەی گشتی تەنانـەت ئامـاژە بـە هـەواڵی چـەند نەتەوەیەك دەکات زاناکانیان بە نموونە دەهێنێتەوە، بەتایبـەتی ئەوانـەی سـوودیان بـە زانستی ناو قورئان و فەرموودەکان گەیاندووە[٨٧]. هـەروەها سـوودی زۆری لـە زانایـان وەرگرتووە، جا چ زانایانی سەردەمی خۆی بێت یاخود بەرهەمی ئەو کەسانەی بەچـاوی خۆی نەیبینیون[٨٨].

ب-المشترك وضعا و المفترق صقعاً:[٨٩]

ئەم بەرهەمە لای مێژوونووسان هەر بەم ناوە ناسراوە، بەڵام یـاقوت کـاتێ خـۆی ئاماژەی پێدەکات، کەمێك جیاوازی هەیە لە ناوەکە وەکو (المتفق و المفترق)[٩٠] یان لە باسکردنی دێڕی (عاقول)[٩١] دەڵێت :(( لە "المتفق خطا و ضبطا" باسم کردووە))[٩٢]. بەڵام یاقوت لێرەدا بەپێی ناوەڕۆکی کتێبەکە ئەم دەربڕینەو ناوەی داوەتێ. هەمان ئـەو

بەرهەمە بریتییە لە جۆرێك لەدانانی (تالیف)، کە سەرچاوەکەی (معجم البلدان)[٩٣].
بەڵام کورتکراوەی ئەم کتێبە نییە، چونکە ئەو رایسپاردووە، کە بە هیچ جۆرێ کتێبەکەی کورت نەکرێتەوە و نەشێوێنرێت بەشێوەیەك کەواتاو سوودەکەی لەدەست بچێ[٩٤].

جـ- الخزل و الدال:

دوای دۆزینەوەی دەست نووسی ئەم کتێبە و لێکۆڵینەوە لەبارەی دانەری ئەم بەرهەمە، لێکۆڵەرەوان گەیشتوونەتە سەر ئەوەی کە ئەمە بەرهەمی یاقوتە، ئەگەرچی هیچ لە سەرچاوەکان ئاماژەی بەناوی کتێبی یاقوت نەکردووە، کە بەم ناوە بێت، بەڵام بەڵگەی ئەو لێکۆلەرانە لەم بارەیەوە روونە، کاتێ دەست نووسەکەیان شی کردۆتەوە، وەکو دەرکەوتووە لەلاپەرەی یەکەم وسەرەوەی دەست نووسەکە بە خەتێکی (ثلثي) عەرەبی نووسراوە (کتاب الخزل و الدال لیاقوت رحمه الله)[٩٥]. یاخود دانەرەکە دەڵێ ((ناوم لێ ناوە خەزەل و دال لە نێوان (دور و دارات و دیره) یە، بە پشتیوانی خوا سوودمەند دەبێت، هەروەکو چۆن (معجم البلدان) سوودمەندە))[٩٦]. جگە لەمە هەمان شێواز ومیتۆدی کتێبی (معجم البلدان)ە، کە کاری شیکردنەوە و زمانەوانی و بە نموونە هێنانی هۆنراوە ئەنجام داوە، لە باسەکانی سوودی لە چەندین کەسایەتی وەرگرتووە، لە پێکهاتەی کتێبەکەدا وتارێك کە بەکورتی باس لە پێشەکی و سێ بەشی بەرهەمەکەی دەکات، پاشان لە پێشەکییەکەی، ئەو بابەتانەی (دور[٩٧] و دارات[٩٨] و دیره)[٩٩] کە بەشەکانی کتێبەکەی لێپێکهاتووە روون دەکاتەوە. بە جۆرێك وشەی (دار) هەر بۆ خانووی بەکار نەهێناوە، بەڵکو بۆ (بلد) واتا ناوچەشی بەکارهێناوە، هەروەکو لە قورئانی پیرۆز داهاتووە، ﴿فاصبحوا في دارهم جاثمين﴾[١٠٠] بەم شێوەیە هەموو بابەتەکانی ئەم کتێبە چەندین مانا و مەبەست وشوێن لەخۆ دەگرێت.

د-کتێبی (معجم البلدان) : سەبارەت بە میتۆدی ئەم کتێبە بەراوردکردن لەگەڵ سەرچاوەکان و تاوتۆکردنی زانیاریەکان، هەروا شیکردنەوەی دەقەکانی تایبەت بە

ناوچە کوردنشینەکان ، وە سەرژمێری کردنی بابەتەکانی ئەم فەرهەنگەدا ، لە ژمارەی داهاتوودەخەینە روو.

## ٢- بەرهەمە چاپ نەکراوەکان و بەردەستنەکەوتووەکان:

أ- (المقتضب في كتاب جمهرة النسب): (ابن خلكان ) وەسفی ئەم سەرچاوەیەی کردووە، کە باس لە ئەسل و فەسڵی عەرەب دەکات و ناویشی بردووە بە (المقتطف في النسب)ش ناوی هاتووە.[١٠١] [١٠٢] ئەم بەرهەمە دەستنووسێکی لە شاری قاهیرەی وڵاتی میسردا بەرچاوکەوتووە[١٠٣].

ب- (المبدأ و المآل)[١٠٤]: ئەم بەرهەمە باس لە مێژووی ئیسلام و گرووپە ئیسلامییەکان دەکات، خۆیشی ئاماژە بەو سەرچاوەیە دەکات لەکاتی باسکردنی هۆزە بەریەرەکان لە (مبدا و المال)ی زیاتری روونکردۆتەوە[١٠٥].

ج- (كتاب الدول): ناوی لە ریزی بەرهەمەکانی یاقوت داهاتووە[١٠٦]. بێ ئەوەی هیچ زانیارییەك دەربارەی بزانرێت.[١٠٧]

د- (اخبار المتنبى).[١٠٨]

هـ-(كتاب مجموع كلام ابي علي فارسي)[١٠٩].

و- (عنوان الاغاني)[١١٠]، هەروەها بە (المنتخب كتاب الاغاني)[١١١] ناوی هاتووە.

ز- (اخبار الشعراء المتاخرين و القدماء)[١١٢] بە (معجم الشعراء)ش[١١٣] هاتووە.

ح- (كتاب نهاية العجب في الابنية لكلام العرب)[١١٤] یان تەنیا (كتاب الابنية)[١١٥].

ط- (كتاب في الاشتقاق اسماء المواضع)[١١٦].

ی- (اخبار اهل الملل والقصص اهل النحل)[١١٧].

ك- (كتاب الاوزان الاسماء و الافعال الحاصرة للكلام العرب)[١١٨].

ل- (اخبار الحسن)[١١٩].

م-(كتاب الانساب)[١٢٠] کە رەنگە هەمان کتێبی (المقتضب في النسب) بێت.

ن- كتاب الرد على ابن جنى و كلامه[١٢١].

# سەرچاوەکان

## *سەرچاوەی ڕەسەن :-

*ابن تغرى بردي: جمال الدين ابي المحاسن يوسف الاتابكي (ت:٨٧٤هـ/١٤٦٩م).

١-النجـوم الزاهـرة في ملـوك مـصر و القاهرة،علقـة: محمـد حـسين، دار الكتـب العليمـه، (بيروت:١٩٩٢م).

*حاجي خليفه:مصطفى بن عبدالله (ت:١٠٦٧هـ/١٦٥٦م).

٢-كشف الظنون عن اسامي الكتب الفنون ،دار الفكر، (بيروت:١٩٩٩م) .

*ابن خلدون:ابي زيد عبدالرحمن بن محمد (ت:٨٠٨هـ/١٤٠٥م).

٣- مقدمه ابن خلدون ، تحقيق : حامد احمد طاهر، (القاهرة:٢٠٠٤م).

*ابن خلكان: ابو العباس شمس الدين احمد بن محمد (ت:٦٨١هـ/١٢٨٢م).

٤- وفيات الاعيان وانباء أبناء الزمان، تحقيق: احسان عباس، دار صادر، (بيروت :د/ت).

*الداؤدي: شمس الدين بن علي بن احمد (ت:٩٤٥هـ/١٥٣٩م).

٥- طبقات المفسرين ، الطبعه الاولى، تحقيق : علي محمد عمر ، مكتبـه وهبـة للنـشر، (القـاهرة: ١٩٧٦م)

*الذهبي: شمس الدين محمد بن احمد بن عثمان (ت:٧٤٨هـ/١٣٧٤م).

٦- تاريخ الاسلام ووفيات المشاهر والا علام، الطبعه الثانيـة ،تحقيـق: عبدالـسلام تـدمري ، دار الكتاب العربي، (بيروت: ١٩٩٨ م).

٧- نزهة الفضلاء تهذيب سـير اعـلام النـبلاء ،اعـداد: محمـد موسـى الـشريف، دار ابـن الكـثير، (بيروت:١٩٩٧ م).

*السخاوي: شمس الدين محمد بن عبدالرحمن (ت: ٩٠٢هـ/١٤٩٧م).

٨-الاعلان بالتوبيخ لمن ذم اهل التاريخ، الطبعـه الاولى ،تحقيـق: صـالح احمـد العلـي، مؤسـسه الرساله للطبع، (بيروت:١٩٨٦م).

*السمعاني: ابو سعد عبدالكريم بن محمد (ت:٥٦٢هـ/١١٦٦م).

٩-الانساب، تحقيق : عبدالله عمر البارودي، دار الفكر، (بيروت:١٩٨٨م).

*السيوطي: جلال الدين عبدالرحمن بن ابي بكر (ت:٩١١هـ/١٥٠٥م).

١٠- بغية الوعاة في طبقات اللغويين والنحاة ،الطبعه الثانية ،تحقيق : محمد ابي الفضل ابراهيم ، دار الفكر، (بيروت :١٩٧٩م).

١١- طبقات المفسرين، تحقيق : علي محمد عمر ، مكتبة وهبة للنشر ،(القاهرة: ١٩٧٦م).

*ابن الشعار الموصلي: كمال الدين ابي بركات المبارك، (ت: ٦٥٤هـ/١٢٥٦م).

١٢-قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان، تحقيق: كامل سلمان الجبوري ، دار الكتب العلمية، (بيروت:٢٠٠٥م).

*الشهرستاني: ابو الفتح محمد بن عبدالكريم (ت:٥٤٨هـ/١١٥٣م).

١٣-الملل والنحل، علق: احمد فهمي، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٧م).

*الصفدي: صلاح الدين خليل ابيك (ت:٧٦٤هـ/١٣٦٣م).

١٤-الوافي بالوفيات:

أ- تحقيق واعتناء: احمد الارناؤوط وتركي مصطفى، دار الاحياء التراث العربي ،(بيروت:٢٠٠٢م).

تحقيق : س. درید ینغ، فرانز شتاير رستوتغارث، (د/م:١٩٩١م).

*طاش كبرى زادة: احمد بن مصطفى (ت: ٩٦٢هـ/١٥٥٤م).

١٥-مفتاح السعادة ومصباح السيادة، الطبعه الاولى، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٩٨٥م).

*ابن العظم: خليل بن مصطفى بن محمد حافظ (ت: ؟).

١٦-السير المصون ذيل على كشف الظنون، تحقيق : سليم يوسف ، دار الفكر، (بيروت:٢٠٠٢م).

*ابن العماد الحنبلي : ابي الفلاح عبد الحي (ت:١٠٨٩ه/١٦٧٨م).

١٧- شذرات الذهب في اخبار من الذهب، دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع ،(بيروت: د/ت).

*ابن القفطي: جمال الدين ابي الحسن علي بن يوسف (ت:٦٤٢هـ/١٢٤٦م).

١٨- اخبار العلماء بأخبار الحكماء، عني بتصحيحه: احمد الخانجي، مطبعه السعادة، (د/م:١٣٢٦هـ).

١٩- انباه الرواة على انباه النحاة،الطبعه الاولى ، تحقيق: محمد ابو ابراهيم: ،

ا- مطبعة دار الكتب المصرية (القاهرة:١٩٥٥م).

ب-المكتبه العصرية ،(بيروت:٢٠٠٤م).

*ابن المستوفي الاربلي: شرف الدين ابو البركات المبارك بن احمد (ت:٦٣٧هـ/١٢٣٩م)

٢٠- تاريخ اربل المسمي (نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل)،تحقيق:سامي بن السيد خماس الصقار،دار الرشيد (بغداد:١٩٨٠م).

*ابن منظور: الفضل جمال الدين محمد بن مكرم الافريقى (ت:٧١١هـ/١٣١١م)

٢١- لسان العرب،مراجعه ومصححه بمعرفه نخبه من الاسادة والاساتذه،دار الحديث،(القاهرة: ٢٠٠٣م).

*اليافعي: ابو محمد عبدالله بن أسعد بن علي بن سليمان المكي (ت:٧٦٨هـ/١٣٦٦م)

٢٢-مرأة الجنان وعبرة اليقظان، تحقيق:خليل المنصور،دار الكتب العلميه،(بيروت:١٩٩٧م).

*ياقوت الحموي: شهاب الدين ياقوت بن عبدالله الرومي البغدادي (ت:٦٢٦هـ/١٢٢٩م)

٢٣- الخزل والدال (بين الدور والدارات والديرة) تحقيق:يحيى زكريا عبارة ومحمد أديب جمران منشورات وزارة الثقافه السورية (دمشق: ١٩٩٨ م).

٢٤- المشترك وضعا والمفترق صقعا ،طبعه كوتنكن، (د/م:١٨٤٦م).اعادت طبعه بالاوسفت مكتبة المثنى ،بغداد .

٢٥- معجم الادباء (الارشاد الاريب الى معرفه الاديب)، اعداد:احمد شمس الدين، دار الكتب العلميه،(بيروت: ١٩٩٣م).

٢٦- معجم البلدان،الطبعه الاولى ،دار صادر، (بيروت:٢٠٠٧م).

## **سەرچاوەی نوێ:-

*باقر امين الورد:

٢٧- معجم العلماء العرب،الطبعه الاولى،راجعه:گورگيس عواد،(بغداد:١٩٨٢م).

*بسام عبدالوهاب الجابي:

٢٨-معجم الاعلام،الطبعه الاولى،دار النشر الجفان الجابي،(د/م:١٩٨٧م).

*حسين محمد فهيم:

٢٩-ادب الرحلات،مطبعه الرسالة الكويتي (د/م:١٩٨٩ م).

*خيرالله سعيد:

٣٠- وراقو بغداد في العصر العباسي،مركز الملك فيصل للبحوث والدراسات والاسلاميه،(رياض:٢٠٠٠م).

*راجي عنايت:

٣١- ياقوت الحموي (العالم الجغرافي الاديب)،الطبعه الاولى،المؤسسة العربية للدراسات والنشر،(بيروت:١٩٧٧م).

*ربحي مصطفى عليان:

٣٢- المكتبات في الحضارة العربية الاسلامية،الطبعه الاولى،دار صفاء للنشر،(عمان:١٩٩٩م).

*الزركلي:

٣٣- الاعلام قاموس التراجم،الطبعه الاولى،دار العلم للملايين،(بيروت:٢٠٠٢م).

*زكي محمد حسين:

٣٤- الرحالة المسلمون في عصور الوسطى،دار المعارف للطباعه والنشر،(مصر:١٩٤٥م).

*سليمان فياض:

٣٥- ياقوت الحموي (ابو الموسوعات الجغرافيه)،مركز الاهرام للترجمه والنشر،(القاهرة:١٩٩٩م).

*شاكر مصطفى:

٣٦- تاريخ العرب المؤرخون،الطبعه الثانية،دار العلم للملايين،(بيروت:١٩٧٩م).

*صلاح الدين المنجد:

٣٧- اعلام التاريخ والجغرافيا عند العرب،مؤسسة التراث العربي،(بيروت:١٩٥٩م).

*علي ادهم:

٣٨-- بعض مؤرخي الاسلام، الطبعه الاولى،مكتبه نهضه مصر بالفجاله للنشر،(القاهرة:٢٠٠٣م).

*علي عبدالله الدفاع:

٣٩-رواد العلم الجغرافي،مكتبه التوبة،(بيروت:١٩٨٧م).

*عمر رضا كحالة:

٤٠- معجم المؤلفين،مؤسسه الرساله للطباعة ونشر،(بيروت:١٩٩٣م).

*عمر فروخ:

٤١- تاريخ الادب العربي،دار العلم للملايين،(بيروت:١٩٨٠م).

*ابو الفتوح محمد التوانسي:

٤٢- الجغرافي الرحالة الاديب ياقوت الحموي،الهيئة مصريه العامه للتأليف والنشر،(مصر:١٩٧١م)

*كامل سليمان الجبوري:

٤٣- معجم الشعراء من العصر الجاهلي حتى سنة ( ٢٠٠٠م)،الطبعه الاولى،دار الكتب العلميه،(بيروت:٢٠٠٣م).

*كراتشكوفسي: اغنا طيوس يوليا

٤٤- تارخ الادب الجغرافي العربي،ترجمه:صلاح الدين عثمان هاشم،(القاهرة:١٩٥٧م).

*محمد امين الخانجي:

٤٥- منجم العمران في المستدرك على معجم البلدان،الطبعه الاولى،مطبعه السعادة (مصر:١٩٠٧م).

*محمد مؤنس أحمد عوض:

٤٦- الجغرافيون والرحالة المسلمون في بلاد الشام،الطبعه الاولى،الناشر:عين الدراسات والبحوث الانسانية والاجتماعيه،(د/م:١٩٩٥م).

*نقولا زيادة:

٤٧- الجغرافيا والرحلات عند العرب،دار الكتاب اللبناني للطباعه والنشر،(بيروت:١٩٦٢م).

## پاشكۆی ژمارە (٦)

## ڕێڕەوی گەشتەكانی یاقوت حەمەوی



(١) – یاقوت الحموي. معجم الادباء. اعداد: احمد شمس الدین.(بیروت: ١٩٩٣). ج١. ص ١١؛ ابن المستوفي الاربلي. نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل. المعروف ب(تاریخ اربل). حققه و علق علیه: سامي بن سید خماس الصقار (بغداد: ١٩٨٠). ق١. ص ٣١٩ ؛ عمر رضا كحاله. معجم المؤلفین. (بیروت: ١٩٩٣). ج٤. ص ٨٣ ؛ابو الفتوح محمد التوانسی. الجغرافي الرحاله الادیب یاقوت الحموي. (مصر: ١٩٧١). ص ٦٠.

(٢) – ابن القفطي. انباه الرواة علي انباه النحاة. حققه: فاضل ابراهیم .(بیروت: ٢٠٠٤). ج ٤. ص ٨٠.

(٣) – یاقوت الحموي. الخزل و الدال. حققه: یحي زكریا. محمد ادیب. (دمشق: ١٩٨٨). ق١. ص ٨ ؛ كراتشكوفسكي. تاریخ الادب الجغرافي العربي. نقله الى العربیة. صلاح الدین عثمان هاشم. ق١. ص ٣٨٨؛ ابو الفتوح محمد التوانسی. المرجع السابق. ص ٦٢؛ نەبەز مەجید ئەمین. یاقوتی حەمەوی. (سلیمانی: ٢٠٠٢) .ل ٨.

(٤) – كافوری ئەبو مسك: رەش پێستێكی حەبەشی بوو سەرەتا لەلای خەڵكی میسر كۆیلە بوو. دواتر سوڵتانی میسر كڕیوەتیەوە. الصفدي. الوافي بالوفیات. تحقیق : احمد الآرناؤوط. تركي مصطفى. (بیروت: ٢٠٠٠). مج ٢٤. ص ٣٣١.

(٥) – سوڵتانی ئەخشیدی: یەكێكە لە سوڵتانەكانی میسر ناوی (ابوبكر بن محمد طغج) بووە. كە خاوەنی میسر وشام و حیجاز بووە لەساڵی (٢٤٧ك ٨٦٢ز) مردووە. ابن خلكان. وفیات الاعیان و انباء ابناء الزمان. حققه: احسان عباس. (بیروت: د/ت). مج٥. ص ٥٦.

(٦) – ابن العماد الحنبلي. شذرات الذهب في اخبار من الذهب. (بیروت: د/ت). ج ٥. ص ١٢٢.

(٧) – حەمەوی: ئەم ناوە بۆ شاری حەما دەگەڕێتەوە. كە لە نێوان حەلەب و حمصە لە وڵاتی شام. السمعاني. الانساب. تقدیم: عبدالله عمر باروردي. (بیروت: ١٩٨٨). ج ٢ .ص ٢٦٧.

(٨) – ابن القفطي. المصدر السابق. ج ٤. ص ٨٠؛ بروانە: ابن الشعار الموصلي. قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان: تحقیق: كامل سلیمان الجبوري. (بیروت: ٢٠٠٥). ج ٩. ص ١٩٧ ؛ ابن خلكان. المصدر السابق. مج٦. ص ١٢٧ ؛ الزركلي. الاعلام. (بیروت: ٢٠٠٤) .ج ٨. ص ١٣١.

(٩) – یاقوت الحموی.معجم الادباء. ج١. ص ١١ ؛ابن المستوفي الاربلي. المصدر السابق. ق١. ص ٣١٩.

(١٠) – ابـن خلكـان. المـصدر السـابق. مـج٦. ص ١٢٦؛ علـي ادهـم. بعـض مـؤرخي الاسـلام. (القاهرة: ٢٠٠٣)، ص ١٢٦.

(١١) – ابن القفطي. انباه الرواة . ج٤. ص ٨٠؛ اليافعي. مراة الجنان و عبرة اليقظان فى المعرفة مايعتبر من الحوادث الزمان، وضحه: خليل منصور. (بيروت: ١٩٩٧)، ج ٤. ص ٤٨ ؛البغدادي، هدية العارفين، (بيروت: ١٩٩٥)، مج٢. ص ٥١٣.

(١٢) – ابو الفتوح محمد التوانسي، المرجع السابق. ص ٦٠ ؛عمر فروخ. تاريخ الادب العربي (بيروت: ١٩٨٠)، ج٣. ص ٤٩٠.

(١٠) – بروانه: راجي عنايت، ياقوت الحموي (العالم الجغرافي الاديب). ( بيروت: ١٩٧٧)، ص ١٦ ؛ سليمان فياض. ياقوت الحموي (ابو الموسوعات الجغرافية). (القاهرة: ١٩٩٩)، ص ص٤–٥.

(١٤) – يـاقوت الحمـوى . الخـزل و الـدال، ق١، ص ٩ ؛ابـو الفتـوح محمـد التوانـسى. المرجـع السابق، ص ٦٢.

(١٥) – ابو الفتوح محمد التوانسى، المرجع السابق، ص ٦١.

(١٦) – قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان، ج٩، ص ١٩٨.

(٣) – ابو الفتوح محمد التوانسى، المرجع السابق. ص ٦٠.

(١٨) – الذهبي. نزهة الفضلاء تهذيب سير اعلام النبلاء، اعداد: محمد موسى شريف، (بيروت: ٢٠٠٧)، ج ٣: ص ١٦٧٨ ؛ اليـافعي. المـصدر السـابق، ج ٤. ص ٤٨.بروانـه: كامـل سـلمان الجبـوري، معجـم الـشعراء. (بيروت: ٢٠٠٣)، ج ٦، ص ١٢٠ ؛ بسام عبدالوهاب الجابي، معجم الاعلام. (د/م: ١٩٨٧)، ص ٩٣٤.

(١٩) – حـاجي خليفـه. كـشف الظنـون عـن اسـامي الكتـب و الفنـون، (بـيروت: ١٩٩١)، ج٦، ص ٣٩٩. البغدادي، المرجع السابق، مج ٢. ص ٥١٣.

(٦)– ابن خلكان. المصدر السابق،مج٦،ص١٢٧.

(٢١) – ابن القفطي، انباه الرواة ، ج٤، ص ٨١؛ ابن خلكان، المصدر السابق. مج ٦: ص ١٢٧.

(٢٢) – معجم الادباء، ج ١. ص ١١؛ كراتشكوفسكي. المرجع السابق، ق١، ص ٢٣٨.

(٢٣) – ابـن القفطـي، انبـاه الـرواة. ج ٤. ص ٨١؛ اليـافعي، المـصدر الـسابق، ج ٤، ص ٤٨؛ محمدامين الخانجي، منجم العمران في المستدرك على معجم البلدان، (مصر: ١٩٠٧) . ج١، ص ٥.

[٢٤] – عكبرى: ناوى (ابو البقاء عبدالله ابن ابي عبدالله حسيني عكبري) لەشارى بەغدا سالْى (٥٣٨ك/١١٤٣ز) لەدايك بووە. لە (٦١٦ك/١٢١٩ز) كۆچى دوايى كردووە خاوەن بەرهەمى زۆر بووە. ابن خلكان ،المصدر السابق، مج٣، ص ١٠٠؛ الداودي، طبقات المفسرين، تحقيق: علي عمر، (د/م: ١٩٧٢)، ج ١، ص ص ٢٢٤-٢٢٧.

[٢٥] – ياقوت الحموي، معجم البلدان، (بيروت: ٢٠٠٧)، مج ٣، ص ٣٠٠؛ مج ٤، ص ٤٨، ص ١٤٢ .

[٢٦] – ئيبن يەعيش ناوى (يعيش بن على بن يعيشى بن محمد ابى سرايا بن يحى) لە حەلەب سالْى (٥٥٣ك/١١٥٧ز) لەدايك بووە لە (٦٤٣ك/١٢٤٥ز) كۆچى دوايى كردووە، خاوەن بەرهەم بووە وەكو (شرح المفصل، شرح تصريف ابن جني). السيوطي، بغية الوعاة، تحقيق: محمد ابي فضل ابراهيم، (بيروت: ١٩٧٩)، ج٢، ص ص ٣٥١-٣٥٢

[٢٧] – راجي عنايت، المرجع السابق، ص ١٧؛ كراتشكۆفسكي، المرجع السابق، ق١، ص ٣٣٨؛ نەبەز مەجيدئەمين، سەرچاوەى پێشوو، ل ١١.

[٢٨] – بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ٥٠٨.

[٢٩] –(علي بن المرجي) : ناوى (سالم بن احمد بن سالم المرجي) ناسراو بە ڕێزمان زان و هۆنراوە زانى بەغدادى لە بەغدا سالْى (٦١٢ك/١٢٥١ز) كۆچى دوايى كردووە. معجم الادباء، ج ٣، ص ٣٥٧ .

(٨)- المصدر نفسه،ج٣،ص٣٥٩.

[٣١] – (ابن الدبيثي): ناوى ( عبدالله محمد بن سعيد بن يحي الواسطي) لە بەغدا سالى (٥٨٨ك/ ١١٤٤ز) لەدايك بووە، لە (٦٣٧ك/ ١٢٣٩ز) مردووە. ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج ١، ص ١٦٠ ؛ ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٤، ص ص ٣٩٤- ٣٩٥.

[٣٢] – معجم البلدان، مج ٢، ص ٣٧١.

[٣٣] – المصدر نفسه، مج ١، ص ٢٦٤، ص ٣٣٢؛ مج ٤، ص ٣١.

[٣٤] – (عبدالعزيز بن المبارك الجنباذي) ناسراو بة (ابن الاخضر) لە بەغدا لە دايك بووە. لە سالْى (٥٢٤ك/ ١١٢٩ز) لە سالْى (٦١١ك/١٢١٤) مردووە. حاجي خليفە، المصدر السابق، ج ٥، ص ٤٦٧.

[٣٥] – بۆنمونە بڕوانە : معجم ا لبلدان، مج ٢، ص١٦٥؛ مج ٣، ص ١٢٦؛ ص ٢٢٨، مج ٤، ص ٢٥١؛ مج ٥، ص ٤٣٦.

[٣٦] – دوورگەی کیش: ئەم دوورگەیە دەکەوێتە ناوەڕاستی دەریای عومان.معجم البلدان. مج ٤، ص ٤٨٧.

[٣٧] – ابن القفطي، انباه الرواة ، ج ٤، ص ٨١.

[٣٨] – ر.م الهي، ياقوت الحموي البغدادي. ترجمه. يوسف حداد، مجله المورد، (بغداد: ١٩٨٧) ، مج ٧، عدد ١،ص ١٥.

[٣٩] – الذهبي، المصدر السابق، ج ٣، ص ١٦٨٧.

[٤٠] – مقدمة، تحقيق: حامد احمد طاهر. (القاهرة: ٢٠٠٤) ، ص ٤٧٧.

[٤١] – ابن القفطي، انباه الرواة ، ج ٤، ص ٨١ ؛ ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج٩،ص ١٩٧ ؛الذهبي، المصدر السابق، ج ٣، ص ١٦٨٧؛ نقولا زيادة. الجغرافيا و الرحلات عند العرب، (بيروت: ١٩٦٢) ص ٦١؛ علي ادهم. المرجع السابق. ص ١٢٥.

[٤٢] – الذهبي. تاريخ الاسلام و وفيات المشاهر الاعلام، تحقيق، عبدالسلام تدمري. (بيروت:١٩٩٨) ، ج ٤٥، ص ٦٦ ؛محمد محمود محمدين. التراث الجغرافي الاسلامي. (الرياض: ١٩٩٩)، ص ١٨١ ؛محمد مونس. الجغرافيون و الرحالة المسلمون في بلاد الشام، (د/م: ١٩٩٥)، ص ١٨٣.

[٤٣] – ابن خلكان. المصدر السابق، مج٦، ص ١٢٧؛ ربحي مصطفى. المكتبات في الحضارة الاسلامية، (عمان: ١٩٩١) ،ص ٧٦ ؛خيرالله سعيد، و راقو بغداد في العصر العباسي، (رياض: ٢٠٠٠) ،ص ٥١٠.

[٤٤] – معجم الادباء، ج ١. ص ١١ ؛ ابن القفطي. انباه الرواة ، ج ٤، ص ٨١. باقر امين الورد. معجم العلماء العرب. راجعه: گورگيس عواد. (بغداد: ١٩٨٢)، ج ١. ص ٢٥٦.

[٤٥] – مەرو: یەکێکە لە گەورەترین شارەکانی خوراسان. معجم البلدان، مج ٥، ص ص ١١٢-١١٣.

[٤٦] – دوو لەم کتێبخانانە یەکێکیان بەناوی عەزیزیە و ئەوەی تریان کەمالییە بووە. معجم البدان، مج٥، ص ١١٤.

[٤٧] – زكي محمد حسين، الرحالة المسلمون في عصور الوسطي. (مصر، ١٩٤٥)،ص ١٠٥ ؛ محمد مؤنس، المرجع السابق. ص ٧٦.

[٤٨] – یەکەمین هێرشی مەغولەکان بۆ ئەو دیو رووبار (ماورا النهر) لە ساڵی( ٦١٥ك/ ١٢٨١ز) دەستی پێکردووە، پێش ڕۆیشتنیان بۆ کەنارەکانی رووباری جەیحون و پەرینەوەیان

گەیشتوونەتە شاری بوخارا و سەمەرقەند، لە ڕێگەی خوارەزمیشەوە گەیشتوونەتە شاری قەزوین و هەمەدان. خەڵکیان کوشتووەو مزگەوتەکانیان سووتاندووە. ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة في ملوك مصر و القاهرة. تحقيق: محمد حسين. (بيروت: ١٩٩٢). ج ٥. ص ٢٢٥.

(٤٩) – ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٦، ص ٢٧؛ كراتشكوفسكي، المرجع السابق. ق١، ص ٣٣٨ ؛ باقر امين الورد، المرجع السابق. ج ١، ص ٢٥٦.

(٥٠) – (ابن القفطي): ناوی (علي بن يوسف بن ابراهيم بن عبدالواحد بن موسى) ناسراو بە (قاضي الاكرم) بووە لە ساڵی (٥٦٨ك/ ١١٧٢ز) لەدایك بووە، بە گەورەیی و جوامێری و مەردایەتی ناسراوە. تواناداربووە لە زانستی زمان و ڕێزمان و خوێندنەوە و ئەستێرە ناسی و بیناسازی و مێژوو و بەرهەمی وەکو (اصلاع الملل، الواقع في صحاح الجوهري، الضاد و الظاد، تاريخ النحاة، تاريخ المصر، تاريخ الحكماء)، هەبووە. معجم الادباء. ج ٥، ص ٣٨١؛ ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق. ج١، ص ١٣٣؛ السيوطي، المصدر السابق، ج ٢، ص ص ٢١٢-٢١٣.

(٥١) – ربحي مصطفى، المرجع السابق، ص ١٢٦.

(٥٢) – انباه الرواة، ج٤، ص ٨١؛ معجم الادباء. ج ٥، ص ٣٩٥.

(٥٣) – حسين محمد فهيم، ادب الرحلات ، (د/م: ١٩٨٩) ،ص ٩٠.

(٥٤) – بۆنموونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ١٤٤، ص ١٥٩، ص ٢٠١، ص ٣٨٠؛ مج٢ ، ص ٧٥، ص ١١٢، ص ٢٠١، ص ٢١٢، ص ٤٤١؛ مج ٣، ص ١٣.

(٥٥) – بڕوانە: ئەم لێکۆڵینەوەیە، ل١٠، پەراوێزی ژمارە (٤).

(٥٦) – ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق. ج ٩، ص ١٩٧.

(٥٧) – ابو الفتوح محمد التوانسي، المرجع السابق، ص ٦٦؛ نەبەز مەجید ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠.

(٥٨) – ياقوت الحموي،الخزل و الدال، ق ١، ص ١٢؛ كراتشكوفسكي. المرجع السابق، ق١، ص ٣٩٩.

(٥٩) – الذهبي، تاريخ السلام، ج ٤٥، ص ٢٦٦؛ نزهة الفضلاء، ج٣. ص ١٦٧٨؛ صلاح الدين المنجد، اعلام التاريخ والجغرافيا عند العرب. (بيروت: ١٩٥٩)، ج ١، ص ٦٥.

(٨)–نیسابوور:شارێکی بەناوبانگی خۆراسانەو، دەکەوێتەنێوان قادسیەو جەیحون نێوانی لەکەل شاری رەی سەدو شەست فەرسەخە .معجم البلدان،مج٥،ص٣٣١.

(٦١) – معجم البلدان، مج ٥، ص ٣٣١.

(٦٢) – نەسا : شارێکی خوراسانە و بەناوبانگە بەوەی کەشاوهەوای خۆشەوەو زۆر لەزانای لێهەلکەوتووە.. معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٨٢.

(٦٣) – الذهبي، تاريخ الاسلام، ج ٤٥؛ ص٢٦٦؛ علي ادهم، المرجع السابق، ص ١٢٦.

(٦٤) – ابن المستوفي الاربلي، المصدر السابق، ق١، ص ٣١٩.

(٦٥) – ياقوت الحموي، الخزل و االدال، ق١، ص١٣؛ ابن القفطي، انباه الرواة ، ج ٤، ص ٨٣؛ عمر رضا كحاله، المرجع السابق، ج٤، ص٨٣.

(٦٦) – الذهبي، تاريخ الاسلام، ج ٤٥، ص ٢٦٦؛ كامل سلمان الجبوري، المرجع السابق، ج٦، ص ص ١٢٠– ١٢١ ؛ نقولا زياده، المرجع السابق، ص ٨٧.

(٦٧) – كراتشكوفسكي، المرجع السابق، ص ٣٩٩.

(٦٨) – ابن خلكان، المصدر السابق، مج٦، ص ١٣٠؛اليافعي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٤٨.

(٦٩) – ابن القفطي: انباه الرواة ، ج ٤، ص ٨٤؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج ٤٥، ص ٢٦٧.

(٧٠) – خەوارجەکان، کۆمەڵەیەکی سیاسی و دینی بوون. سەرەتا بەشداریان لە دژایەتی مەعاویە کوڕی ئەبی سەفیان (٤٠–٦١ك/٦٦١–٦٨٠ز) دەکرد، بەڵام دوای مەسەلەی تەحکیم لە عەلیش دوورکەوتنەوەو بەرامبەر ئەویش وەستان ، چونکە بڕوایان بە تەحکیم نەبوو. الشهرستاني، الملل والنحل، حقق: احمد فهمي، (بيروت: ٢٠٠٧)، ج ١، ص ١٠٦.

(٧١) – ابن خلكان، المصدر السابق، مج٦، ص ١٢٨.

(٧٢) – ابن القفطي: انباه الرواة ، ج ٤، ص ٨٣؛ علي ادهم، المرجع السابق، ص ١٢٨.

(٧٣) – ابن القفطي، انباه الرواة ، ج ٤، ص ٨٣.

(٧٤) – ابن الشعار، المصدر السابق، ج ٩، ص ١٩٧؛ الذهبي، نزهة الفضلاء، ج ٣، ص ١٦٧٨؛ ابن تغري بردي، المصدر السابق، ج٦، ص ٢٧٤. بڕوانە: حاجي خليفه، المصدر السابق، ج٦، ص ٣٩٩؛ ابن العظم، السير الموصون ذيل على كشف الظنون، حققه: سليم يوسف، (بيروت: ٢٠٠٢) ،ص ١٠٠.

(٧٥) – وفيات الاعيان، مج ٦، ص ١٣٩.

(٧٦) – اليافعي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٤٨؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج ٤٥، ص ٦٦.

(٧٧) – الذهبي، نزهة الفضلاء، ج ٣، ص ١٦٧٨؛ السخاوي، الاعلان بالتوبيخ لمن ذم اهل التاريخ، ترجمة: صالح احمد علي، (بيروت: ١٩٨٦) ،ص ١٨٦.

(٧٨) – حاجي خليفه، المصدر السابق، ج ٦، ص ٣٩٩.

(٧٩) – ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج ٩، ص ١٩٨.

(٨٠) – معجم الادباء، ج ١، ص ٣٩ ؛ ابن المستوفي الاربلي، المصدر السابق، ق١، ص ٣٢٢

(٨١) –طاش كبري زادة، مفتاح السعادة و المصباح السيادة، (بيروت: ١٩٨٥)، مج ١، ص ٢٦٢" القنوجي،ابجد العلوم والوشي المرقوم في بيان الاحوال العلوم،ج٢ ،،تحقيق:عبدالجبار زكار،(بيروت:١٩٧٨) ،ص٣٦٤.

(٨٢) – ابن المستوفي الاربلي ناوی (الموهب بن غنيمه بن علي بن شمس الدين ابوالبركات) لە ساڵی (٥٦٤ك/ ١١٦٨ز) لە دایك بووە، و لە (٦٣٧ك/ ١٢٣٩ز) كۆچی دوایی كردووە. خاوەن زانیاری بووە لە بواری فەرموودە و ئەدەب و زمان و ڕێزمان و عروز و بەیان. بەرهەمەكانی وەكو (ديوان المتنبی وابی تمام، تاريخ اربل). ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٤، ص ١٤٧. بڕوانە: ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج٦، ص ١٥٠؛ السيوطي، المصدر السابق، ج٢، ص ٢٧٢.

(٨٣) – تاريخ اربل، ق ١، ص ٣٢٢.

(٨٤) – المصدر نفسه، ق ١، ص ٣٢٤.

(٨٥) – المصدر نفسه ، ق١، ص ٣١٩؛ معجم الادباء، ج١، ص ٢٩؛ عمر فروخ، المرجع السابق، ج ٣، ص ٣٩١.

(٨٦) – معجم الادباء، ج ١، ص ٢٧.

(٨٧) – المصدر نفسه ، ج ١، ص ٣٢.

(٨٨)– یەكێك لەو خاوەن بەرهەمەی كە خۆی نەیبینیوە ناوی (عبدالملك التاريخی) ناسراو بە (سراج البغدادی)یە. كە ئەدیبێكی خاوەن چاكە و هەواڵ گێڕەوە بووە ناسراوە بە تاریخی، چونكە بەردەوام خەریكی مێژوو بووە . السمعانی، المصدر السابق، ج ١، ص ٤٢٢. یاقوتیش ئاماژە بەوە دەكات لاپەرە سپییەكانی كتێبەكەی بە زانیارییەكانی ئەم زانایە ڕەش كردووە. معجم الادباء، ج ١، ص ٢٨.

(٨٩) – ابن خلكان ، المصدر السابق، مج ٦، ص ١٢٩؛ ابن العماد الحنبلي، المصدر السابق، ج ٥، ص ١٢٢.؛ حاجي خليفه، المصدر السابق، ج ٦، ص ٣٩٩.

(٩٠) – معجم البلدان، مج ٥، ص ٧٨.

(٩١) – دێری عاقول: ئەو دێرەیە لە نێوان مەدائینی کسری و نەعمانیە ، دووری لە بەغدا نزیکەی (١٥ فەرسەخ/ ٩٠کم) دەبێت. معجم البلدان، مج ٢، ص ٥٢٠.

(٩٢) – المصدر نفسه والصفحه.

(٩٣) – یاقوت الحموي، المشترك وضعا و المفترق صقعاً، اعداد: قاسم محمد رحیب، (د/م:١٨٤٦م) ،ص ٣.

(٩٤) – معجم البلدان، مج ١، ص ١٤.

(٩٥) – یاقوت الحموی، الخزل و الدال، ق ١، ص ٤٠.

(٩٦) – المصدر نفسه، ق١، ص ٤٠؛ ص ٤٦.

(٩٧) – دور: چاوگەکەی (دار) ە ، کە مانای کوچە کەیلەکۆنە واتا بەگشتی ناوچە و گەڕەك، هەر شوێنێك خەڵکی تێدا کۆببێتەوە دەگرێتەوە، جۆرێك ناوێکی کۆکراوەیە لە نێوان ئەم دەستەواژانە. ابن المنظور، لسان العرب، (القاهرة: ٢٠٠٢)، مج ٣، ص ٤٤٦.

(٩٨) – دارات: تاکەکەی (دارە) یە مەبەستی ئەو ناوچەیەیە، کە بە شتێك دەورە درابێت، وەکو ئەو رووناکییەی لە دەوری مانگ دایە، پێی دەڵێن خەرمانەی مانگ یاخود ئەو زەویەی لە نێوان چیاکانە. یاقوت الحموی، الخزل و الدال، ق ١، ص ١٥١؛ ابن المنظور، المصدر السابق، مج ٣، ص ٤٤٥.

(٩٩) – دیر: واتا رەبەنگەکان و بونیات نراوێکە لە زۆر شوێندا هەیە و بەو ماڵە دەوترێت کە رەبەنەکان (لێبراو بۆ ژینی دوای) پەرستنی خوای تێدا دەکەن. الخزل و الدال، ق١، ص ١٥٧.

(١٠٠) – سورة هود: الاية ٦٧.

(١٠١) – وفیات الاعیان، مج ٦، ص ١٢٩؛ الزرکلي، المرجع السابق، ج ٨ ،ص ١٣١.

(١٠٢) – حاجي خلیفة: المصدر السابق، ج ٦، ص ٤٠٠؛ البغدادي، المرجع السابق، مج ٢، ص ٥١٣.

(١٠٣) –یاقوت الحموی، الخزل و الدال، ق١، ص ٣٠؛ ر.ن الهي، یاقوت الحموي البغدادي، ص ٣٦.

(١٠٤) – حاجي خلیفه، المصدر السابق، ج ٦، ص ٣٩٩؛ ابن العماد الحنبلي، المصدر السابق، ج ٥، ص ١٢٢؛ کامل سلمان الجبوري، المرجع السابق، ج ٦، ص ٢١؛ باقر امین الورد، المرجع السابق، ج١، ص ٢٥٦.

(١٠٥) – معجم البلدان، مج ١، ص ٤٣٣.

(١٠٦) – ابن العماد الحنبلي، المصدر السابق، ج ٥، ص ١٢٢؛ البغدادي، المرجع السابق، مج ٢، ص ٥٠٣.

(١٠٧) – ياقوت الحموى، الخزل و الدال، ق ١، ص ٣١؛ ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٦، ص ١٢٩ .

(١٠٨) – ابن العظم، المصدر السابق، ص ١٠٣؛ الزركلي، المرجع السابق ، ج ٨، ص ١٣١.

(١٠٩) – ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٦، ص ١٢٩؛ ابن العماد الحنبلي، المصدر السابق، ج ٥، ص ١٢٢.

(١١٠) – نفس المصادر والصفحه.

(١١١) – ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج ٩، ص ١٩٨.

(١١٢) – اليافعي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٤٨.

(١١٣) – ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج ٩، ص ١٩٨؛ الزركلي، المرجع السابق، ج ٨، ص ١٣١.

(١١٤) – ر.ن الهي، ياقوت الحموي البغدادي، ص ٣٨.

(١١٥) – ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج٩، ص ١٩٨.

(١١٦) –ياقوت الحموى، الخزل و الدال، ق١، ص ٣٥.

(١١٧) – معجم البلدان، مج ١، ص ٣٦٩.

١١٨ –ياقوت الحموى، الخزل و الدال، ق١، ص ٣٥؛ ابن القفطي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٨٥.

(١١٩) – ابن العظم، المصدر السابق، ص ١٠٠.

(١٢٠) – الذهبي، نزهة الفضلاء، ج٣، ص ١٦٧٨.

(١٢١) – ابن القفطي، انباه الرواة ، ج ٤، ص ٨٥.

# بارودۆخی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و پیشەگەری کوردستان لەسەردەمی عەباسی

پ.ی.د. ئاکۆ برهان محمد

پێشەکی:

کوردستان لە سەردەمی عەباسیدا مێژوویەکی دیاری هەیە بەو پێیە کە لەدیارترین ناوچەکان بووە ڕۆڵی گێڕاوە لە سەرجەم ڕووەکانی شارستانێتی لەوانە بارودۆخی ئابووری ، لەم سەردەمەدا بزاوتێکی هەست پێکراو درك پێدەکرێت کە لەسەردەمانی تردا کەمتر درکی پێدەکرا ، ئەوەی کەیارمەتیدەر بووە شوێنە جوگرافیەکەیەتی کەوا بازنەی پێگەیاندنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە و باری سروشتی و تۆبۆگرافیاکەی یارمەتیدەر بووە بۆ ئەوەی شارەکانی گەشە بکەن لە ڕووی ئابووریەوە .

وڵاتی کوردان ڕۆڵێکی جیاکەرەوەی لە شارستانێتی ئیسلام گێڕاوە ، وەکو بوونی پیشەو دروستکراوی جۆراوجۆر و بەرهەم هێنانی بەروبومی کشتوکاڵی جیاواز ، دیارە زانیاری کۆکردنەوە لەسەر ئەم بابەتە ئاوا ئاسان نییە وەکو زانیاریەکانی تری سیاسی وسەربازی بەڵکو پێویستی بە بەدواداچوونی زۆرترین سەرچاوە هەیە بۆدەوڵەمەند کردنی ئەم بابەتە و بەشێوەیەکی ڕاست و شیاو بخرێتە ڕوو .

یەکەم/ باروددۆخی کشتوکاڵ :-

باروددۆخی کوردستان لەم سەردەمەدا بەوە جیا دەکرێتەوە کەپێشکەوتووتر بووە لەسەردەمەکانی ترو هەمەجۆری بەرهەمی تیادا بەدی دەکرێت ، زەویەکی زۆرو بەرفراوان بەروبوومی کشتوکاڵیان لێ بەرهەم دەهێنرا ، خوێنەر گەر لاپەڕەی سەرچاوەکانی شارناسان و جوگرافیناسان هەڵبداتەوە بۆی دیاردەکەوێت کە لە ناوچە جیاجیاکانیدا بەروبومی کشتوکاڵی لەڕووی چەندێتی وجۆرێتی زۆربووینە .

ئەوەی یارمەتیدەری بووە بەپیتی زەوی کشتوکاڵی و زۆری وجۆری سەرچاوەکانی ئاو بووە لە ڕێژەی باران و ڕووبارەکان و بیرو کانیاوو دەریاچەو ئاووهەوای گونجاو ، سروشت ڕووباری پێ بەخشیوە کەڕۆڵی خۆی هەبووە لە گەشەسەندنی ئابووریەکەی(١) ، ڕووباری دیجلە سەرچاوەیەکی گرنگی کشتوکاڵ بووە سەرچاوەکەی لەشوێنە چیاییەکانەوە هەڵدەقوڵێت(٢) ، لەکوردستانی باکوور ، شارناس (**ابن خرداذبة** ) دەڵێت: ((دیجلە لەچیاکانی ئامەدەوە دەردەچێت وبەزنجیرە چیایەکدا تێدەپەڕێت ... )) (٣) ، پاشان هەردوو ڕووباری (سریت وساتید) ی تێکەڵ دەبێت ودواتریش لەنزیك شارەکانی (ئەرزن ومیافارقین) لەگەڵ ڕووباری (دووشا ) و پاشان (خابوور) تێکەڵ دەبێت(٤) ، شاری (جزیرە ابن عمر) جەزیرە ـ بۆتان لەچەند لایەکەوە دەور دەدات لەبەر ئەمەپێیان گووتوە دوورگە(٥) ، وەلەباشووریشەوە چەند ڕووباێك تێکەڵی دەبێت لەوانە زێی سەروو زێی خواروو(٦) ، ئەم دوو زێیە ڕۆڵێکی دیاریان گێڕاوە لەپەرەسەندنی باری کشتوکاڵیداو بەروبوومی زۆر هەبووە لەدەوروبەریدا(٧) .

ڕووباری فورات ئەمیشیان ڕۆڵی خۆی بینیوە لەگەڵ لقەکانی لە پەرەسەندنی باری کشتوکاڵیدا ، کە لەبەرزاییەکاندا هەڵدەقولا(٨) ،وەیەکەم شارێکیش بەنزیکیدا تێدەپەڕی (مەلاتی) یە(٩) ، دواتر بەناوچەکانی تری باکوری ڕۆژئاوای

هەرێمی جەزیرەدا تێدەپەڕێ ،بەلأم لەدیجلە کەمتر سوودی هەبووە بەهۆی کورتی بەسەر خاکی کوردستان و تیژڕەوی لەهەندێ شوێندا .

دوودەریاچەی ئاوداری هەیە کەرۆلیان هەبووە لەکشتوکاڵ وبەرووبوومی سروشتی وولات ، دەریاچەی (ورمێ) رۆڵی ئابووری خۆی هەبووە بەسەر شارەکانی دەووبەری بەتایبەتی شارەکانی (ورمێ) و(داخرقان) (١٠) ، دەریاچەی (وان ) ئاوێکی زۆری رووبارە بچوکەکانی دەووبەری دەرژێتە ناوی و رۆڵی خۆی هەبووە لە پەرەسەندنی کشتوکاڵ بەسەر شارەکانی دەووبەری وەکو (وان) و(بەرکری)و (ئەرجیش) و(وەستان) (١١) .

دانیشتوان لەم سەردەمەدا دەستیان کردووە بەهەڵکەندنی کەناڵی ئاوو دروستکردنی ئەمباری ئاوو پەمپی ئاو (الدوالیب ) بۆمەسەلەی ئاودێری زەوی کشتوکاڵی بەکاریان هێناون ، هەروەك نموونەی یەکێك لەدەقە مێژوویەکان باسکراوە کە چۆن جووتیارانی شاری (ماردین) دەستیان کردووە بەدروستکردنی ئەمبارێکی ئاو بە مەبەستی ئاودێری کشتوکاڵی(١٢) ، هەروەها مێژوونوس (فارقی) چەند ئاماژەیەکی هەیە سەبارەت بە هەڵکەندنی کەناڵێکی ئاودێری لە(رأس العین) سەرکانی ەوە بۆناوچەکانی (میافارقین) درێژبۆتەوە ، هەروەها لەناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچی / یازدەمی زایینی بە فەرمانی میر (نەسرولدەولەی مەروانی٤٠١-٤٥٣ ك/١٠١١-١٠٦١ ز) کەفەرمانڕەوای میرنشینی مەروانی بوو پرۆژەی کەناڵێکی ئاو لەچەند کانیەکەوە ئاراستەی ناوچە کشتوکاڵیەکانی (میافارقین) کرا لەوانە بێستانی فەیسەڵ ،خەرجیەکی زۆری لێ سەرفکرا(١٣) .

لەزۆربەی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان وشاروگوندەکانیدا بەروبومی کشتوکاڵی جۆراوجۆر بەرهەم هێنراوە ، لەشاری (ئامەد ) دیاربەکر ئاماژە کراوە کە گوندێکی کشتوکاڵی زۆری بەسەرەوە هەیە ئابووریەکی بەرفراوانی پێ

بەخشیوە(١٤) ، تەنانەت شارەکانی تریش سوودیان لە بەروبومەکانی وەردەگرت تاببووە ناودارترین ناوچەو شارە ئابووریەکانی سەدەکانی ناوەڕاست(١٥) .

شاری (ماردین) رووبەرێکی بەرفراوانی کشتوکاڵی هەبووە کە خاکێکی بەپیت وبەرهەمێکی زۆری لێ دەرئەنجام دەهات ، دیارە ئەمەش دەگەڕایەوە بۆبوونی ئاودێری پێویست بەتایبەتی لەزۆری کانیەکان کەسەرچاوەکەی چیاکانی دەوروبەری بوو ، سەرەرای توانایی وهەوڵی جوتیارانی ناوچەکەی لەبزاوتە کشتوکاڵیەکاندا(١٦) ، بەتایبەتی لەبەشی رۆژهەڵاتیدا رووبەرێکی زۆری بەرفراوانی بەپیتی هەبووەو هەمیشە ئاوەدان بوو بەکێڵگەو بێستانەوە تەنانەت ناوی لێنراوە(فەردۆس) (١٧) .

گوندە کشتوکاڵیەکان جێی سەرنجی بەشێك لە شارناسان بووینە ،وەکو شارناس (المستوفی القزوینی ) باس لە شاری (جەزیرە ) بۆتان دەکات کە دەوڵەمەندە بەهەمە جۆری بەرهەمە کشتوکاڵیەکان وتەنها گوندەکانی دەوروبەری پێك هاتووە لەسەد گوند(١٨) وە ئاماژەی تری زۆری لەسەرە لە مەڕ پەرە سەندنی باری کشتوکاڵی و بەرهەمەکانی (١٩) .

وەشاری (میافارقین ) کەش و هەوایەکەی کاریگەری تەواو بەسەر پەرەسەندنی بەرهەمی کشتوکاڵدا بوو(٢٠) ، هاوشانی بەپیتی زەویەکەی و بوونی سەرچاوەی ئاوی زۆر کاری کردۆتە سەر چەندێتی و جۆرێتیەکەی (٢١) ، بە هەمان شێوە شاری (حصن کیفا) حەسکێف جێی ئاماژەی شارناس (ابن حوقل ) ەلەوەی کە گوندێکی کشتوکاڵی زۆری بەسەرەوە بوو (٢٢) .

هەندێ لەشارەکان زۆر دەوڵەمەند بوون بە بەروبومەکان دەبینین لە (نصیبین ) نسێبین ئەوەندە کێڵگەی کشتوکاڵی لێبووە کە مەزەندەی چل هەزار کێڵگەی لێ دەکرێت (٢٣) ، جگە لە ناوبانگی بە زۆری بەرهەمی میوە (٢٤) ، شاری (سنجار ) شەنگار ناسراو بوو بە بەرهەمهێنانی باشترین وچاکترین جۆری

بەرهەمی کشتوکاڵی (٢٥) و زۆری میوەی هاوینی و زستانی تیایدا (٢٦) ، لە شارە گرنگەکانی تری هەرێمی جەزیرەی بەناوبانگ بەبەرووبومی کشتوکاڵی شاری (الرها ) ئۆرفە کە زەویەکی پانتایی بەپیتی هەیە وتەواو چواردەوری دەوردراوە بەبەرهەمە کشتوکاڵیەکانەوە (٢٧) ، ئاودێری و بێستانێکی زۆری هەیە (٢٨) .

لەشارو ناوچەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان کە ناسراون بە بەرهەمی کشتوکاڵی (دینەوەر ) کە جۆراوجۆری هەبوو لە کشتوکاڵداو زەویەکەشی بە پیتە (٢٩) ، شاری (هەمەدان) ئاماژەی بوونی زۆری ئاوو بەپیتی زەوی و جۆراوجۆرێتی بەرووبومی لەسەرە (٣٠) ،وە لەبەرئەوەی شاری (قرمیسین ) کرمانشا بەرووبومی ئەوەندە زۆر بوو نرخەکەی هەمیشە هەرزان بوو لە کاتی کڕین وفرۆشتن (٣١) .

شارە کوردیەکان هەمیشە جێی ستایشی شارناسەکانن وەکو شارەکانی هەرێمی ئازەربێجان ، کاتێك شارناس (ابن حوقل) باس لە شاری (شنۆ ) دەکات و دەڵێت :(( شارێکە درەخت و سەوزایی و خێرو میوەو ترێیەکی زۆری لێیە و بازاڕەکانی گەرمن لە کڕین و فرۆشتن )) (٣٢) ، هەروەها شاری (دوین) بە ناوبانگ بووە بە کێڵگەی کشتوکاڵی و بێستان و زۆری میوەو زیاتریش گرنگیان بە برنج و لۆکە داوە (٣٣) .

لەدیارترین بەروبومە کشتوکاڵیەکانی کوردستان ئەمانەن :

١- گەنم وجۆ :

لەبەر ئەوەی خواردنێکی زۆر سەرەکین گرنگیان پێدراوە لەم سەردەمەدا بەتایبەتی کە بارودۆخە سروشتیەکەی یارمەتیدەر بوو ، لە دیارترین ئەو شارو ناوچانەی پێی ناسراوە (نسێبین) بە شێوەیەکی بەرفراوان گەنم وجۆی لێ دەچێنرا تا وای لێهاتبووە نرخەکانیان زۆر نزم بوون (٣٤) ، هەروەها لە ناوچەی (تەل فافان ) ی باکووری هەرێمی جەزیرە بەشێوەیەکی فراوان گەنم و جۆی لێدەچێنرا

(٣٥) ، بەشی زۆری دەنێردرایە شارەکانی تر (٣٦) ، جگە لە بەرهەم هێنانی بە ڕێژەیەکی زۆر لە ناوچەکانی (ئامەد) و(شەنگار) (٣٧) .

هەروەها لەناوچەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان ئاماژە هەیە کە ڕێژەیەکی زۆری لە گەنم بەرهەم دەهێنرا بەڕادەیەك کە بەشی دانیشتوانی زیاتری کردووە ونێردراوەتە دەرەوەی کوردستان لەوانە شاری (بەسرە) (٣٨) .

٢- میـــوە :

لە کوردستاندا سەرجەم میوەکانی لێ بەرهەم دەهێنرا بە هۆی شیاوی ئاوو هەواو سروشتی زەویەکەی ، لە دیارترین میوەکانی (ترێ ) یە بەتایبەتی لە ناوچە چیایی و نیمچە چیاییەکان کە بەرهەمێکی بێ شماری لێ بەرهەم دەهات (٣٩) ، بەتایبەتی لەناوچەی (شقلاباد ) شەقلاوە لەم کاتەدا بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەم بەرهەمەی هەبوو تەنانەت بەدرێژایی ساڵ ناردەی شاری (اربل ) هەولێر دەکرا (٤٠) ، هەروەها شاری (جەزیرە ) بنکەیەکی گرنگی بەرهەمی ترێ بوو (٤١) ، هەندێ ناوچەش بەوە جیا دەکرایەوە کە جۆری ترێیەکەی زۆر بەناوبانگە وەکو ترێ ی ماسەبزی کەدەگەڕایەوە بۆشاری (ماسەبزان ) ی ڕۆژئاوای هەرێمی چیا (٤٢) ، وە ترێ ی ناوچەکانی (ماردین ) و (رأس العین ) سەرکانی زۆر ڕەواجی لەسەر هەبوو (٤٣) ، وە (شارەزوور ) جۆرە ترێیەکی جیاوازوو بەناو بانگی هەبوو بەناوی (سۆنایە ) (٤٤) ، جگە لە ناوداری شاری (شنۆ ) بە زۆری بەرهەمی ترێ (٤٥) .

سێو جۆرێك بووە لە بەروبومە کشتوکاڵیەکان زۆری لێ بەرهەم دەهێنرا بەتایبەتی لەشاری (بەدلیس ) تەنانەت وەکو نموونەیەکی نایاب ناوی دەهات و جگە لەمەش هەرزان بوو (٤٦) ، بە هەمان شێوە سێوی شاری (خەڵات ) ناودار بووە و زۆری لێ بەرهەم دەهێنرا (٤٧) ، هەروەها بەناوبانگی و زۆری سێوی (حولوان ) (٤٨) .

جۆرێکی تری بەرهەمی کشتوکاڵی هەرمێ یە بەتایبەتی شاری (شنۆ ) کە باشترین جۆری لێ بەرهەم دەهێنرا ، شارناس (یاقوت الحموی ) ئاماژە دەکات کە جۆرەکەی زاڵە بەسەر سەرجەم جۆرەکانی تری هەرمێ (٤٩) .

لەم سەردەمەدا کوردستان بەرهەمی هەناری زۆر بووە لەوانە (حولوان ) (٥٠) ، هەروەها لە (شەنگار ) کە زۆری لێ بەرهەم دەهێنرا تەنانەت تۆوی هەنارەکەی بەوە جیا دەکرایەوە گەورە بوو (٥١) ، لە ناودارترین جۆری هەناری کوردستان لەم سەردەمەدا هەنارێك بووە بەناوی (هەناری شۆشی ) نزیك (عقر الحمیدیە ) ئاکرێ ، تامیشی خۆش بووە (٥٢) ، هەروەها لە ناوچەکانی (نسێبین ) و (دارا ) جۆرێکی بەتام و چێژی لێ بووە (٥٣) .

بەرهەمێکی تری ناوداری کوردستان لەم سەردەمەدا هەنجیرە کە بە ڕادەیەکی زۆری لێ بەرهەم دەهێنرا بەتایبەتی شاری (حولوان ) (٥٤) ، بەتایبەتی جۆرێکی نایابی هەبوو بەناوی (شا هەنجیر ) (٥٥) ، جگە لە بەرهەم هێنانی بە ڕێژەیەکی زۆر لەناوچەکانی شاری (جەزیرە ) (٥٦) .

لەدیارترین میوەکانی تری کوردستان کە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێت ( الاترج ) کەباد کە شاری (شەنگار ) پێی ناسراو بوو (٥٧) ، جگە لەبەناوبانگی ئەم شارە بە نارنج (٥٨) ، لیمۆش زیاتر لە ناوچەکانی (سیروان ) و ( سەیمەڕە ) لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیا زۆر بەرهەم دەهێنرا (٥٩) ، وە زەیتون چاندنی زۆر بووە بەتایبەتی لە (شەنگار ) (٦٠) و (ماردین ) و (سەیمەڕە ) کەتەنانەت بۆدروست کردنی زەیت سوودی لێ بینراوە (٦١) ، کاڵەك جۆرێکی تری میوە بوو لە بیستانەکاندا دەچێنرا ، بەڵام جۆرێکی تایبەتی هەبوو بەناوی (الدستنبویە ) (٦٢) یاخود شەمامە بەتایبەتی ناوچەکانی (سیروان ) و (سەیمەڕە ) پێی ناسراوبوو (٦٣) .

لە بەرووبومە کشتوکاڵیەکانی تر کونجی و گوێز و سماق بەتایبەتی لە (سنجار ) زۆری لێ بەرهەم دەهێنرا (٦٤) ، بەرهەمی فستق بەهەمان شێوە بەرهەم

هێنانی زۆر بوو لە دیارترین شارەکان (جەزیرە ) یە کە شارەکانی هەرێمی چیا سوودیان لێ بینیوە (٦٥) ، وە شاری (ورمێ ) گوێزی زۆری بەرهەم دەهێنا (٦٦) ، لەپاڵ شارەکانی (حولوان ) (٦٧) و (جەزیرە ) (٦٨) ، بەرهەمی بندق لەشارەکانی (جەزیرە ) (٦٩) و (حیزان ) لە هەرێمی جەزیرەدا زۆر بوو (٧٠) ، بەڕوو جۆرە بەرهەمێکی ترە بەتایبەت لە ناوچەی (نسێبین ) لەبەر نایابیەکەی ناوی لێنراوە شابەڕوو (٧١) ، جگە لە بوونی بەشێوەیەکی بەرفراوان لە شاری (حیزان ) کە جۆرەکەی شارناس (یاقوت الحموی) ئاماژەی پێدەکات باشتر بووە لە هی وولاتی شام (٧٢) ، وە سەبارەت بە دارخورما تەنها لەشاری (بەندەنیجین ) مەندەلی هەبووە (٧٣) .

٣- لۆکە :

جۆرێکی گرنگ بوو لەبەرهەمە کشتوکاڵیەکان بە شێوەیەکی زۆرتر لە ناوچەی (شارەزوور ) بەرهەم دەهێنرا (٧٤) ، هەروەها لە شاری (سەرکانی ) (٧٥) .

دووەم / ئاژەڵداری :-

سروشتی جوگرافیایی کوردستان لە بوونی دەشت و چیاو دۆڵ ودارستان و بەرزایی و ئاوو گژوگیا یارمەتیدەر بوو بۆ زۆری بڵاوبوونەوەی ئاژەڵداری بەتایبەتی چێڵ و مەڕو بزن وهی تر بۆ سوود وەرگرتن لە بەروبومەکانی وەکو ماست و پەنیرو خوری و گۆشت و بەکارهێنانی هەندێکی تر لە پرۆسەی چاندن لە کێڵگەکان و گواستنەوە و کڕین و فرۆشتن لەسەری ، لە دیارترین ناوچەکانی ئاژەڵداری ناوچەی (هەمەدان ) بەناو بانگ بوو بە بەخێوکردنی مەڕ (٧٦) ، بە هەمان شێوە ناوچەی (شارەزوور) لەم کاتەدا دانیشتوانەکەی بەرێژەیەکی بەرفراوان کاری ئاژەڵداریان دەکرد بەتایبەتی بەخێوکردنی مەڕ ( ٧٧) ، لە ناوچەی (شنۆ ) لەهەرێمی ئازەربێجان ڕێژەی مەڕ بەخێوکردنیان ئەوەندە زۆر بوو

دەنێردرایە دەرەوەی وولات جگە لەشاری (ورمێ) ناسراو بوو بە بەخێوکردنی مەڕ (٧٨) ، سەرەرای چێڵ و مانگاو هی تریش (٧٩) .

سەبارەت بە مەل بە هەموو جۆرەکانیەوە هەبوو بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت بەخێوکردنی کەو لەم سەردەمەدا باوبووە جا چ لەبەر جوانیەکەی یا دەنگ خۆشی یا لەبەر کەمی ، کەبەنرخێکی گران دەخرایە بازاڕەکانەوە تەنانەت بۆ دەرەوەش ناردە دەکرا (٨٠) ، جگە لە بوونی بەخێوکردنی هەنگ کە بۆبەرهەمی هەنگوین بەخێودەکرا (٨١) .

ماسی بەخێوکردن لەماوەی باسەکەماندا باوبوو ، دیارترین جۆری بە ناوی (الطريخ) کە جۆرە ماسیەکی بچووکەو لە دەریاچەی (وان) دەژیاو دەردەهێنراو کۆدەکرایەوە (٨٢) ، وە لەناوچەی (سەرکانی) جۆرە ماسیەکی بەتام هەبوو گەشتەوان (ابن جبير) باسی دەکات کە لەبەتامترین جۆری ماسیە تەنانەت دەنێردرایە شارەکانی تر (٨٣) .

سێیەم/ بارودۆخی پیشەگەری :-

گەر بەراوردێك بکەین لەسەر باری پیشەگەری لەم ماوەیەدا ئەوا زانیاری زۆرمان بەردەست ناکەوێت ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئاماژە کراوە لەسەر جۆراوجۆری پیشەکان و بوونی پیشەسازی سادە ، تەنانەت هەندێك لە دروستکراوەکان دەنێردرایە دەرەوەی وولات ، دەقە مێژوویەکان ئامازە بەچەند شارێك دەکەن کە ناسراون بەبوونی جۆرەها پیشەسازی تیایاندا وەکو (هەمەدان) (٨٤) و (نسيبين) (٨٥) و (ميافارقين) (٨٦) .

لە دیارترین جۆرەکانی پیشەگەری ئەمانەن :

١- پیشەسازی ڕستن و چنین :

شارەکوردیەکان بەوە ناسراوبوون کە ڕستن و چنینی هەمە جۆریان هەبوو (٨٧) ، کوردستانیش بەگشتی بنکەیەکی سەرەکی ئەم پیشەسازیە بوو چونکە بنەما سەرەکیەکانی ئەم پیشەسازیەی تێدایە لە دەستی کار کەتوانایی و لێهاتوویی و شارەزاییان پەیداکرووە ، جگە لە باری سروشتی شیاو بۆچاندنی لۆکە و بوونی مەڕو مەڵات بۆ خوریەکەی لەزۆربەی شارو ناوچەکاندا ، ناوبانگی شاری (ئامەد) لەوە دابوو کەڕستن و چنینی جۆراوجۆری هەبوو لەوانە (المقارم) کە جۆرێکە لە پۆشاکی دروستکراوی خوری ڕەنگاو ڕەنگ هەروەها (تالیسان ) (٨٨) زیاتر زانایان و پیاو ماقولان لەبەریان دەکرد جل و بەرگێك بوو تایبەت بە کوردان (٨٩) ، هەروەها دروستکردنی دەستەسر (٩٠) کە لەلۆکە دروست دەکرا (٩١) .

لەبەر ئەوەی ماددەی لۆکە زۆر سپی و بێگەردو نەرمە پۆشاکی زۆری لێ دروست دەکرا ، دەبینین ئاماژە هەیە لەسەر شاری (سەرکانی ) بە دروستکردنی جل و بەرگی لۆکەیی (٩٢) ، وەلەشاری (ماردین ) جۆرە قوماشێکی نایاب بەرهەم دەهێنرا بەناوی (بۆکاسینی ) جێی ڕامان و سەرنجی گەشتەوان (مارکۆ پۆلۆ ) یە (٩٣) ، جۆرێکی تری قوماشی بەرهەم هێنراو لەم شارەدا ناسراوە بە (بۆشیرام ) (٩٤) ، هەروەها لەشاری (بەرزەند ) لە هەرێمی ئازەربێجان جل و بەرگی لۆکەیی دروست دەکرا ، جگە لەجۆرێکی تر لەناوچەکانی تری ئەم دەڤەرە بەرهەم دەهێنرا بەناوی (بەرود ) (٩٥) .

لەم سەردەمەدا پۆشاکی جۆراوجۆر دروست دەکرا لەماددەی ئاوریشم بەتایبەتی جۆرێك بەناوی (سەقلاتون ) (٩٦) ، جل و بەرگی تایبەتی کوردی هەبوو بریتیە لە مەرەز کە ڕانك و چۆغەی لێ دروست دەکرا ، شاری (ماردین ) زیاتر بە جل وبەرگی مەرەز ناسراوبوو (٩٧) ، جۆرێکی تر بەناوی (تکك ) بە مانای دۆخین دێت بۆبەستنی شەرواڵ بەکاردەهات بەتایبەتی شاری (دوین ) زۆری لێ دروست دەکرا (٩٨) .

پیشەی دروستکردنی قوماشی کەتان باوبووە بەتایبەتی لە شارەکانی (هەمەدان ) (٩٩) و (نسێبین ) (١٠٠) ، لە پیشەسازیە بەناوبانگەکانی تری کوردستان پۆشاکی (حە زە ) کەشارۆچکەیەکە لە نزیك شاری (هەولێر ) لەبەر نایابی و جیاوازیەکەی ئەم ناوەی لێنراوە (١٠١) .

جۆری نایاب لە ڕایەخ و فەرش دروست دەکرا بەهۆی بوونی کەرەستەی خاوی سەرەتایی وەکو خوری وکەتان شاری (بەدلیس ) دیارترین مەڵبەندەکانی ئەم پیشەیەیە (١٠٢) ، بەڵام جۆرێکی ناسراو لە فەرش دروست دەکرا بەناوی (زەلی ) بەتایبەتی لە شارەکانی (خەلات ) و (بەدلیس) زۆری لێ بەرهەم دەهێنرا (١٠٣) .

سەبارەت بە پەردە لە کوردستاندا رستن وچنینی بۆ دەکرا بەتایبەتی لەشاری (بە دلیس ) (١٠٤) .

٢- پیشە خۆراکیەکان :

بەهۆی شیاوی ئاوو هەواو زەوی بەپیت ئەمەش وای کردووە کە کوردستان وولاتێکی دەوڵەمەند بێت لە بەروبومی کشتوکاڵی و سروشتیەوە ، لەوانە بەروبومەکانی شیر (الالبان ) بەتایبەتی دروست کردنی پەنیر لەدیارترین شارەکانی ناودار بەم پیشەیە (حولوان ) (١٠٥) و (دینەوەر ) (١٠٦) ، هەروەها گوندەکانی دەوروبەری (هەمەدان ) زۆری لێ بەرهەم دەهات (١٠٧) , جگە لە ناوبانگی هەندێ شار بە دروستکردنی دۆ وەکو شاری (نسێبین) (١٠٨) .

لەبەرهەمە خۆراکیەکانی تر هەنگوینە (١٠٩) ، هەندێ ناوچەکان بە هەنگوینی نایاب ناویان دەرکردبوو وەکو شارەکانی (جەزیرە) (١١٠) و (شنۆ ) (١١١) ، دروستکردنی دۆشاوی ترێ یەکێك بوو لە پیشەکانی تر بەتایبەتی لەشارەکانی (جەزیرە ) (١١٢) و (الحسنیە) زاخۆ (١١٣) ، هەروەها پیشەی دروستکردنی جۆرەکانی شیرنەمەنی هەبوو لە هەمووان چاکتر لە شاری (هەمەدان) بوو (١١٤) .

ناوچەی هەرێمی جەزیرە ناسراو بوو بە پیشەی بەرهەم هێنانی (النمکسود)

(١١٥) ، ئەمەش کرداری پارچەکردنی گۆشتە بەشێوەیەکی ڕێك وپێك وپێداکردنی خوێ و بەهارات وئامادەکردنی بۆبازار (١١٦) .

لە پیشەسازیە گرنگەکانی تر دروستکردنی مـــەی بەتایبەتی لەم ناوچەو شـارانەی کەخـەڵکی مەسـیحی لێ دەژیـا وەکـو شـارەکانی هـەرێمی جـەزیرە و لێهاتوویەکی باشیان هەبوو (١١٧) ، لە نایابترین جۆرەکانی ئـەوەی کـە لـە دێـری (ئەحویـشا ) دروسـت دەکـرا لـە نزیـك شـاری (سـەعەرد ) کـە لـە چـواردەوریدا کێڵگەیەکی زۆری ترێ و جۆرەها میـوەی لێبـوو پیشەگەران توانیویانـە نایـابترین جۆرەکانی مـــەی دروست بکەن (١١٨) , هەروەها شاری (ئاکرێ ) بـەناوبانگ بـوو بـە دروسـتکردنی مـــەی لـەترێ (١١٩) ، وە لـە مـــەیە نایابـەکانی تـر ئـەوەی لـە گوندی (قەرتەبل ) (١٢٠) دروست دەکرا لە نزیك شاری (ئامەد) (١٢١) .

٣- دەرمانی چارەسەری پزیشکی :

دەوڵەمەندی ناوچەکانی کوردستان بە ڕووەکی جۆراوجۆر یارمەتیدەر بـوو بۆدروستکردنی دەرمانی چارەسەری پزیشکی جیاواز و خەڵکیش پابەندی دەبوون وەك دەستکاری کردنی ڕووەکی زەعفـەران (١٢٢) ، بـۆ چارەسـەری نەخۆشـی لـە سەردەمی ئیسلامدا زۆر بەکاردەهات (١٢٣) ، بەڕێژەیەکی بەربلاو لە (نەهاوەنـد ) و (حولوان) (١٢٤) و (هەمەدان ) (١٢٥) دروسـت دەکـرا ، وەبـۆ چارەسـەرکردنی نەخۆشیەکانی پشت و بەهێزکردنی توانای مرۆڤ جۆرێك دەرمان دروست دەکرا کـە خواردنەوەیەك بوو لە ڕووەکی (هلیۆن) ئەمـەش جـۆرە گیایەکـە پـەلکێکی هەیـە هەنـدێکیان چیایی و هەنـدێکیان دەشـتاییە (١٢٦) ، ڕێژەیـەکی زۆری دەرمـان لێ دروست دەکرا (١٢٧) .

لە دەرمانەکانی تری چارەسەری پزیشکی تێکەڵاویەك بـەناوی خواردنـەوەی دیناریە (١٢٨) ، کە بەکاردەهێنرا لەلایەن پزیشکانی هەرێمی دیاربەکر (١٢٩) .

٤- پیشەسازیە کانزاییەکان :

لەبەرئەوەی لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان کانزای تێدا هەبوو (١٣٠) ، بۆسوود وەرگرتنی دەردەهێنراو لە دوای دەستکاری کردنی لە زۆربەی پێداویستیەکانی رۆژانەی مرۆڤ بەکاردەهێنرا وەکو ئاسن ، هەروەها زێرو زیو (١٣١) ، زێرو زیو کە لە کانزا بەهاکانن بۆمەسەلەی جوانکاری و خشڵ و دراو دروست دەکران کانەکانیان لە ناوچەکانی هەرێمی چیاکان زۆر بووینە (١٣٢) .

دەقە مێژوویەکان ئاماژەی گرنگی بەرهەمەکانی ئاسنین دەکەن چونکە ماددەیەکی رەقە (١٣٣) ، وەکو شاری (نسێبین) کە زۆری لێ بەرهەم دەهێنرا (١٣٤) ، لە دیارترین دروستکراوەکانی ئاسن کێشەکانی تەرازووە (١٣٥) ، هەروەها ئاشی هارینی دانەوێڵە کە لە ماددەکانی ئاسن و دار دروست دەکرا لە چەند شارێك هەبوو وەکو (ئامەد) و (نسێبین) (١٣٦) ، جگە لە دروستکردنی دەرگاو پەنجەرەو پێداویستی تر وەکو نمونەی پەنجەرە دروستکردنی شاری (سەرکانی ) (١٣٧) ، هەروەها نمونەی دروستکردنی پایەی ئاسنین لەشاری (جەزیرە) (١٣٨) .

ماددەی مس کەل وپەلی زۆری لێ دروست دەکرا وەکو شاری (سەعەرد) کە پێی ناسراوبوو (١٣٩) ، هەروەها شاری (ئەرزەن) (١٤٠) ، جۆرێکی تایبەتیش سوودی لێبینراوە بەناوی (الاسبیژروی) (١٤١) ، لە رۆژئاوای هەرێمی چیاو (١٤٢) هەرێمی جەزیرە سوودی لێبینراوە وەکو نموونە لە شاری (ئامەد) بۆڕی ئاوی لێدروستکراوە (١٤٣) .

ماددەی قیر یەکێك بووە لەم ماددانەی کە بەرهەم هێنراوە ولەدوای دەستکاری کردن وچارەسەر کردنی لەکارگەکاندا بۆ پێداویستی بیناکاری دروستکراوە بەتایبەتی گەرماوەکان جگەلەدروستکردنی کەشتی (١٤٤) ، لەلایەن پیشەگەرانەوە لەکارگەکاندا بە چەند قۆناغێکەوە دروستی دەکەن لە سەرەتادا

قالبی ئاسنین ئامادە دەکەن و دەیخەنە ناوی و زۆری دەکوڵێنن تا دەتاوێتەوە پاشان لەسەر خۆڵی نەرم دایدەنێن و تێکەڵی دەکەن تاقایم دەبێت ودواتریش پارچە پارچەی دەکەن و ماوەیەك بەجێی دەهێڵن تا ڕەق دەبێتەوە ، بە ڕێژەیەکی زۆریش لە ناوچەکانی هەرێمی جەزیرە بەرهەم دەهات (١٤٥) .

٥- دروستکراوەکانی بۆن وبەهارات :

کوردستان بەوە جیا دەکرێتەوە کە بۆنی جۆراوجۆری دروستکردووە ،وا دیارە جۆراو جۆری لە بوونی ڕووەکی بۆنداردا یارمەتی پیشەکەی داوە، گوڵ بەکاردەهێنرا بۆدروستکردنی بۆنی دیاریکراوی وەك (ماو الورد ) گوڵاو کە زۆر بەکاردەهێنرا بۆ خۆشبوونی بۆنی لەش و لابردنی بۆنی ئارەق ، زیاتریش ئافرەت بەکاری دەهێنا (١٤٦) ، شاری (نسێبین) ناوداربوو بە بەرهەم هێنانی گوڵاو (١٤٧)، ڕووەکی زەعفەران کە بۆندار بووە ئەویش بەرهەم هێنراوە بۆ زۆر پێداویستی لەوانە بۆدروستکردنی بۆن (١٤٨) ، هەروەها ڕووەکی نیلۆفەر کە جۆرە بۆنیکی لێدروست دەکرا (١٤٩) ،جگە لە گوڵە نێرگز بە هەمان شێوە بۆنی لێدروست دەکرا (١٥٠) .

لە بەهاراتە دروستکراوەکانیش زۆر هەبوون کە بۆ تام و چێژی خواردن بەکاریان دەهێنا زیاتر لە درەخت بەرهەم دەهێنرا (١٥١) ، هەروەها زەعفەران جگە لەوەی بۆ بۆن و پێداویستی تریش بەکارهاتووە ، بۆ بەهاراتیش بەکار هێنراوە کەوا دوای دەستکاری و چارەسەرکردنی بەچەندین قۆناغدا بۆ تام وچێژی خواردن بەکاردەهات و ناوبانگێکی زۆریشی پەیدا کردووە (١٥٢)، هەروەها لەشاری (نسێبین) جۆرێك لە بەهارات دروست دەکرا لە درەختێك بە ناوی کوازین (١٥٣) .

٦- دروستکراوەکانی پێست :

لە کوردستاندا لەم ماوەیەدا پیشەی دروستکردنی پێداویستی لەپێست

هەبوو تەنانەت بەشێکی لێ دەنێردرایە دەرەوە (١٥٤) ، یەکێك لەدروستکراوەکانی پێڵاو بوو وەك لەشاری (هەمەدان) (١٥٥) .

٧- دروستکراوە میکانیکیەکان :

لە دیارترین دروستکراوەکانی وڵات بوون ، دیارە ئەمەش پیشەگەریەك بووە پێویستی بە زانایانی داهێنەر هەیە کە پشتیان بەستووە بە زانستی تیۆری و پراکتیکی (١٥٦) ، هەروەکو دروستکردنی کاتژمێرێکی گەورە لە شاری (میافارقین) (١٥٧) ، کە بەپێی چەند رێسایەکی میکانیکی و حیسابی وورد کاری دەکرد لە مزگەوتی سەرەکی شارەکە قایم کرابوو (١٥٨) ، هەروەها دروستکردنی پەمپی ئاو ڕاکێشان لە ناوچەی دیاربەکر (١٥٩) ، هەروەها دروستکردنی ئامێری بەرزکردنەوەی ئاو لە ڕووبار و بیرەکان ، جگە لەکاتژمێری جۆراوجۆرو ئامێری خواردنەوە کە بە شێوەی ئاڵۆز لە کانزای جۆر بەجۆر دروست کراوە هەروەها ئامێری تریش (١٦٠) .

هەروەها دروستکردنی ئامێری ئەسترلاب کە زیاتر لە ماددەکانی ئاسن و مس دروست دەکرا بۆ مەبەستی پێوانەیی بەرزایی ئەستێرەکان و مانگ و ڕۆژ هەروەها چەند پێوانەیەکی تری ئەندازەیی ، شاری (حەڕان ) بەهاران پێی ناسراوبوو (١٦١) ،وە لە شاری (سەعەرد ) پیشەی دروستکردنی ئەم ئامێرە هەبوو (١٦٢) .

٨- پیشە گەریەکانی تر :

لە دروستکراوەکانی تر دروستکردنی پێداویستیەکانی دارە ، بەحوکمی ئەوەی درەختێکی زۆر لەکوردستاندا دەڕوا کەلوپەلی جۆراوجۆری لێدروست دەکرا بەتایبەتی لەشاری (نەهاوەند) ی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان (١٦٣) ، هەروەها دروستکردنی سابون لە هەرێمی جەزیرە (١٦٤) ، وە پیشەسازی دروستکردنی کاغەز لەشاری (ئورفە ) (١٦٥) ، هەروەها پیشەگەری دروستکردنی شوشەوات لە شاری (نسێبین) (١٦٦) .

## پەراوێزەکان :

(١) كانار : مادة الجزيرة ،دائرة المعارف الاسلامية ، ج١٣ ، ص٤٣٦.

(٢) سهراب : عجائب الاقاليم السبعة الى نهاية العمارة ،ص١١٨.

(٣) المسالك والممالك ،ص١٤٩.

(٤) كي لسترنج : بلدان الخلافة الشرقية ،ص ص١٤٢-١٤٤.

(٥) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٢، ج٣،ص٥٧.

(٦) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٢، ج٤،ص٢٩٠" ابن عبد الحق :مراصد الاطلاع ، ج٢، ص٦٥٢.

(٧) ابن سعيد المغربي : الجغرافيا ، ص٣١٦.

(٨) جاسم الخلف : جغرافية العراق الطبيعية ، ص١٧٨.

(٩) ابن خرداذبة :المسالك والممالك، ص١٤٩.

(١٠) الاصطخري :مسالك الممالك ،ص١٨٩" ابن حوقل :صورة الارض ،ص٢٩٦.

(١١) بروانە: ابن حوقل: صورة الارض ،ص٢٩٧" كي لسترنج : بلدان الخلافة الشرقية،ص ص٢١٧-٢١٨.

(١٢) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٠٢ .

(١٣) مێذووی میافارقین وئامەد،ل ٩٢.

(١٤) ابن حوقل: صورة الارض ،ص٢٠١ .

(١٥) Adil Tekin :Diayrbakir p.٢٠.

(١٦) حسن شميساني : مدينة ماردين ،ص٢٥.

(١٧) ابن شداد: الاعلاق الخطيرة ،ج٣،ق٢ ،ص٥٤٣ .

(١٨) نزهة القلوب ، ص١٢١ .

(١٩) بروانە: ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٠٢ " ابو الفداء : تقويم البلدان ، ص٣٨٣ .

(٢٠) المستوفي القزويني : نزهة القلوب ،ص١٢٦.

(٢١) الاصطخري :مسالك الممالك ، ص٧٦ .

(٢٢) صورة الارض ،ص٢٠٢ .

(٢٣) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٤، ج٨،ص٣٩٠.

(٢٤) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٢٧ .

(٢٥) المستوفي القزويني : نزهة القلوب ،ص١٢٤.

(٢٦) ابن حوقل:صورة الارض ،ص١٩٩ .

(٢٧) ابن شداد الاعلاق الخطيرة ، ج٣،ق١ ، ص٨٦ .

(٢٨) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٠٤ .

(٢٩) الاصطخري :الاقاليم ،ص٨٥ .

(٣٠) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٣٠٨ " القلقشندي :صبح الاعشى ،ج٤،ص٣٧٠ .

(٣١) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٣٠٦ .

(٣٢) صورة الارض ،ص٢٨٩ .

(٣٣) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٩٠ .

(٣٤) ابن حوقل:صورة الارض ،ص١٩١ .

(٣٥) التنوخي نشوار المحاضرة ،ج٣ ، ص١٨١ .

(٣٦) التنوخي :الفرج بعد الشدة ،ج٣ ،ص٤٠ .

(٣٧) ابن حوقل:صورة الارض ،ص ص٢٠٢–٢٠٣ .

(٣٨) التنوخي: نشوار المحاضرة ،ج٨ ، ص١١٦ .

(٣٩) د.محسن محمد حسين :اربيل في العهد الاتابكي ،ص٢٤٠ .

(٤٠) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٦، ج٥،ص١٥٠ " عبد الرزاق الحسني : العراق قديما وحديثا ، ص٢٤٠ .

(٤١) اليسيف :مادة جزيرة ابن عمر ، دائرة المعارف الاسلامية ، ج١١، ص٤٤٦ .

(٤٢) ابن الفقيه :مختصر كتاب البلدان ، ص١٩٩ .

(٤٣) ابن حوقل:صورة الارض ،ص ص٢٠٠–٢٠١ .

(٤٤) ابن مهلهل : الرسالة الثانية ، ص٢٠ .

(٤٥) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٩٨.

(٤٦) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج١، ج٢،ص٢٨٤ .

(٤٧) د.زرار صديق توفيق : كردستان في القرن الثامن الهجري ، ص٣٠٧ .

(٤٨) البدري :نزهة الانام في محاسن الشام ، ص١٢٠ .

(٤٩) معجم البلدان ،مج١ ،ج١ ،ص١٦٤ .

(٥٠) القزويني :اثار البلاد واخبار العباد ،ص٣٥٧ .

(٥١) ابن حوقل:صورة الارض ،ص١٩٩.

(٥٢) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٣، ج٦،ص١٦٢ .

(٥٣) ابن سعيد المغربي : الجغرافيا ، ص١٥٦.

(٥٤) القزويني :اثار البلاد واخبار العباد ،ص٣٥٧ .

(٥٥) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٢، ج٣،ص١٧٣ .

(٥٦) ابن الفقيه :مختصر كتاب البلدان ، ص١٩٩ .

(٥٧) ابن حوقل:صورة الارض ،ص١٩٩.

(٥٨) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٣، ج٥،ص٧٨ .

(٥٩) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٣١٥.

(٦٠) كي لسترنج : بلدان الخلافة الشرقية ،ص ١٢٨.

(٦١) ابن مهلهل : الرسالة الثانية ،ص٢٣·" ابن حوقل:صورة الارض ،ص٣١٤.

(٦٢) الدستنبوية :بريتية لة كالَةكى شةمامة لةووشةى ليَكدراوى كوردى هاتووة بةماناى بؤنى دةست .ادي شير : الالفاظ الفارسية المعربة ،ص٦٣ .

(٦٣) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٣١٥.

(٦٤) ابن حوقل:صورة الارض ،ص١٩٩.

(٦٥) اليسيف :مادة جزيرة ابن عمر، ج١١،ص٤٤٤.

(٦٦) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٨٩.

(٦٧) ابن خلكان :وفيات الاعيان ،مج٢،ص٢١٦

(٦٨) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٠٣.

(٦٩) اليسيف :مادة جزيرة ابن عمر، ج١١،ص٤٤٤.

(٧٠) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٢، ج٤،ص٢٠٤ .

(٧١) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٣١ .

(٧٢) معجم البلدان ،مج٢،ج٣ ،ص٢٠٤.

(٧٣) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج١، ج٢،ص٣٩٣ .

(٧٤) السمعاني :الانساب ،ج١٠ ،ص١٣٠ .

(٧٥) ابن حوقل:صورة الارض ،ص١٩٩.

(٧٦) ابن حجر: لسان الميزان ،ج٢، ص٤٤٤ .

(٧٧) ابن مهلهل : الرسالة الثانية ،ص١٨ .

(٧٨) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٨٩.

(٧٩) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٠٢.

(٨٠) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٣١ .

(٨١) ف .هايد :تاريخ التجارة ،ج٤ ،ص١٣٧" عمادالدين خليل :الامارات الارتقية ،ص٤٥٣ .

(٨٢) همداني :عجايب نامة ،ص٣٥١.

(٨٣) رحلة ابن جبير ،ص١٩٦.

(٨٤) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٤، ج٨،ص ص٤٨٢–٤٨٣ .

(٨٥) الحميري:الروض المعطار في خبر الاقطار ،ص٥٧٧.

(٨٦) الحميري:الروض المعطار في خبر الاقطار ،ص٥٦٧.

(٨٧) الجاحظ : التبصر بالتجارة ،ص٣٠ "الاصطخري :مسالك الممالك ،ص١٨٨.

(٨٨) الجاحظ : التبصر بالتجارة ،ص٣٠.

(٨٩) ادي شير:الالفاظ الفارسية المعربة ،ص١١٣.

(٩٠) الجاحظ : التبصر بالتجارة ،ص٣٠.

(٩١) رينهارت دوزي :المعجم المفصل باسماء الملابس،ص٢٣٥.

(٩٢) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٠٠.

(٩٣) رحلة ماركو بولو ، ص٥٧ .

(٩٤) ف .هايد :تاريخ التجارة ،ج٤ ،ص٢١٥.

(٩٥) مؤلف مجهول :حدود العالم ،ص١٢٠.

(٩٦) القزويني : اثار البلاد ،ص٢٤٠.

(٩٧) ابن سعيد المغربي : بسط الارض ،ص٩٠" الجغرافيا ،ص١٥٧ .

(٩٨) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٩٤.

(٩٩) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص٢٩٦ .

(١٠٠) الثعالبي : ثمار القلوب ،ص٥٣٨ .

(١٠١) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٢، ج٣،ص ١٤٦ " د.محسن محمد حسين :اربيل في العهد الاتابكي ،ص٢٤٢.

(١٠٢) الجاحظ : التبصر بالتجارة ،ص٣٤" الثعالبي : ثمار القلوب ،ص٢٣٦.

(١٠٣) مؤلف مجهول :حدود العالم ،ص١٢١.

(١٠٤) الثعالبي : ثمار القلوب ،ص٥٣٨.

(١٠٥) بروانة : ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٥، ج١٠،ص٢٩٣

(١٠٦) كي لسترنج : بلدان الخلافة الشرقية ،ص ٢٦٢.

(١٠٧) ابن رستة :الاعلاق النفيسة ،ص١٥٢.

(١٠٨) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٢٧.

(١٠٩) ف .هايد :تاريخ التجارة ،ج٤ ،ص١٣٧.

(١١٠) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٠٢" اليسيف :مادة جزيرة ابن عمر ،ج١١ ،ص٤٤٤.

(١١١) ابن حوقل:صورة الارض ،ص٢٨٩.

(١١٢) ابن حوقل:صورة الارض ،ص ص٢٠٢-٢٠٣.

(١١٣) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٣١.

(١١٤) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص٢٩٦.

(١١٥) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٣١.

(١١٦) حكيم احمد مام بكر: الكورد وبلادهم عند البلدانيين والرحالة المسلمين ،ص٢٠١.

(١١٧) سوادي عبد محمد:الاحوال الاجتماعية والاقتصادية في بلاد الجزيرة ،ص٢٩٤.ئەم توێژەرە لە لاپەڕەی (٢٩٥) ی هەمان کتێب هەڵەیەکی کردووە کاتێك لەسەر زاری (اسامه بن منقذ) دەگێڕێتەوە کە جۆرە مەیەك لەشاری حەسنکێفەوە ناردەی موسڵ دەکرا ،بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئەم زانیاریە لەکتێبی(الاعتبار) ی(اسامه بن منقذ) دانییە .

(١١٨) العمري :مسالك الابصار،ج١،ص٣١٠.

(١١٩) نوري العاني :العراق في العهد الجلائري ،ص٢٥٢.

(١٢٠) ياقوت الحموی لێی تێکچووە کاتێك لەکتێبەکەی خۆی (المشترك وضعا) دەڵێت (قرطبل) وەلە (معجم البلدان) دەڵێت (قطربل). المشترك ،ص٣٠٣" معجم البلدان ،مج٤ ،ج٧ ،ص٦٩ .

(١٢١) ياقوت الحموي : المشترك وضعا ،٣٠٣ .

(١٢٢) زەعفەران: لەڕووی شێوە بەپیاز دەچێت ودەستکاری دەکرێت تاسوود لەئاوەکەی وەردەگیرێت کەوەکو شیر دەردەچێت ودەشێت ووشك بکرێتەوە وەکو ئارد هەڵبگیرێت

،بۆچارەسەری چاوو بەهێزی دڵ ولەشزاغی وخەو باشە .القزويني: عجائب المخلوقات ،ص٢١٦.

(١٢٣) ف .هايد :تاريخ التجارة ،ج٤ ،ص١٧٧–١٧٨.

(١٢٤) الصابي :الوزراء، ص٣٤٥ " .Minorsky :Nihawand .p٩١٢

(١٢٥) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص٢٩٦.

(١٢٦) القزويني : اثار البلاد ،ص٢٢٦.

(١٢٧) البدري :نزهة الانام في محاسن الشام ، ص١٦٦ .

(١٢٨) خواردنەوەی دینـاری : ناوەکـەی دەگەڕێتـەوە بۆکەسـێك بـەناوی (ابـن دینـار) سـاڵی مردنـی٤٥٦ك/١٠٦٣ز کـە لـەمیافارقین لەسـەردەمی نەسـرولدەولەی مـەروانی لەبیمارسـتانی شارەکە کاری کردووە. ابن ابي اصيبعة :عيون الانباءفي طبقات الاطباء ،ص٣٢٩.

(١٢٩) ابن ابي اصيبعة :عيون الانباءفي طبقات الاطباء ،ص٣٢٩.

(١٣٠) ابن الاكفاني :نخب الذخائر ،ص٦٤ .

(١٣١) سعيد الديوه جي :الموصل في العهد الاتابكي ،ص٥١ .

(١٣٢) الاصـــطخري :مـــسالك الممالـــك ، ص٢٠٣ " يـــاقوت الحمـــوي : معجـــم البلـــدان ، مج٣،ج٥،ص١٧١.

(١٣٣) الانطاكي :تذكرة داود الانطاكي ،ص١٢٠ .

(١٣٤) ابن الوردي :خريدة العجائب ، ص٤٣ " نوري العاني :العراق في العهد الجلائري ،ص٢٥٩.

(١٣٥) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٣١.

(١٣٦) ابن حوقل:صورة الارض ،ص ص١٩٤، ٢٠١.

(١٣٧) ابن حوقل:صورة الارض ، ص٢٠٠.

(١٣٨) سبط ابن الجوزي : مراة الزمان ،ج٨،ق١ ،ص٢٤٩.

(١٣٩) القزويني : اثار البلاد ،ص٣٥٧.

(١٤٠) ابن بطوطة :رحلة ابن بطوطة ،ص٢٩٨ .

(١٤١) الاسبیذروی :بە مانای مسی سثی دێت .البيروني :الجماهر في معرفة الجواهر ،ص٢٩٦.

(١٤٢) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص٢٩٦.

(١٤٣) ناصر خسرو :سفرنامة ، ص٩ .

(١٤٤) نوري العاني :العراق في العهد الجلائري،ص٢٥٨.

(١٤٥) سوادي عبد محمد:الاحوال الاجتماعية والاقتصادية،ص٢٨٩ .

(١٤٦) القزويني :عجائب المخلوقات ، ص٢٠٥.

(١٤٧) ابن بطوطة :رحلة ابن بطوطة ،ص٢٣٧ .

(١٤٨) شاكر مصطفى : المدن في الاسلام ،ج٢،ص٤٩٥.

(١٤٩) ابن سعيد المغربي : بسط الارض ،ص٨٩.

(١٥٠) سوادي عبد محمد:الاحوال الاجتماعية والاقتصادية،ص٢٩٧ .

(١٥١) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٢، ج٤،ص٢٧٣ .

(١٥٢) ف .هايد :تاريخ التجارة ،ج٤ ،ص١٧٨.

(١٥٣) بروانه : المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٣١.

(١٥٤) عبد الرقيب يوسف :الدولة الدوستكية ،ج٢ ،ص٢٢٦.

(١٥٥) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص٢٩٦.

(١٥٦) Adil Tekin :Diayrbakir p.٢٥.

(١٥٧) Minorsky:Mayafarkin ,p١٦٠.

(١٥٨) فارقی :مێذووی میافارقین وئامەد ،ل٧٩.

(١٥٩) فارقی :مێذووی میافارقین وئامەد ،ل٧٧.

(١٦٠) حاجي خليفة:كشف الظنون ،ج٢،ص١٣٩٥.

(١٦١) عبد العزيز الدوري :تاريخ العراق الاقتصادي ،ص١١١.

(١٦٢) ابن حجر :الدرر الكامنة ،ج٢ ،ص٣٨ .

(١٦٣) Minorsky :Nihawand ,p٩١٢.

(١٦٤) المقدسي : احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٣١.

(١٦٥) البكري :معجم ما استعجم ،ج٢،ص٦٧٨.

(١٦٦) مؤلف مجهول :حدود العالم ،ص١١٨ .

## لێکۆلینەوەیەك دەربارەی:

# پێگەی کورد لە دەوڵەتی ساسانی

کۆچەر حسن حسین

پێشەکی

واچاکە لەسەرەتادا ئەوە بزانین کە دەوڵەتی ساسانی دەوڵەتێکی ئێرانی بوە بەبەژداری هەردوو رەگەزی کوردو فارسەوە, چونکە ئەم دەوڵەتەو باقی دەوڵەتانی ئەوسەردەمە لەسەر بنەمای نەتەوە( بەمانای کورد, یان فارس , یان عەرەب ) دروست نەبوونە بەڵکو لەسەر بنەمای ئایین یاخود چینایەتی دروست بونە هەر وەکو ووتەکەی محمد ئەمین زەکی بەگ لە پێشەکی ((خولاصەدا)) دەیخاتە روو کە دەڵێت: تاوەکو کەسی بەرامبەرم نەیووت تورکم منیش هەستم بەکوردی خۆم نەکردبوو, بەڵکو لەوکاتەوە ووتم مادام ئەو تورك بێت دەبێت منیش شتێك بم ئینجا ئەو ووتەی محمد ئەمین زەکی لەسەدەی بیست کراوە جا چ جای سەدەکانی (٣,٤,٥,....هتد ) وەدەوڵەتی ساسانی دەوڵەتێکی ئاینی زەردەشت بووە بەجیاوازی نەتەوەکانەوە واتە ئەوەی ئاینی زەردەشتی بێت پلەو پایەی دراوەتێ و ئازار نەدراوە جا چ کورد بوبێ یان فارس وەلەهەمان کاتدا ئەگەر ئاینی جیابوایە کەمەسیحی یان مەزدەکی بوایە ئازار دەدرا جاچ کوردبا یان فارس.وەجگەلەوەش دەوڵەتێك بووە پەیرەوی چینایەتی کردوە.ئینجائەم کەسە ئەگەر لەچینی بەرزبایە لە کورد یان فارس ئەوارێزی لێ گیراوە وەبەپێچەوانەوە گەر لەچینەکانی خوارەوە بووایە لەوانەیە ئازار بدرایە بەکوردو فارسەوە لەبیرشمان نەچێت کە ئەم

دەوڵەتەلەحەوت بنەماڵەی خانەدان پێك هاتبوو جاکێ لەم بازنەدابووایە ئەوا دەسەڵاتی هەبوو بەپێچەوانەوە لەوانەیە بێ دەسەڵات بوایە.وەدەوڵەتی ساسانی دەوڵەتێکی مەرکەزی بووە جا دەوڵەتی مەرکەزیش وادەخوازێت کەدەسەڵاتی هرێمەکان کەم بکاتەوە ئەمەش زۆرجار بۆتەهۆی روودانی جەنگ لەگەڵ هەرێمەکان جا چ کوردبێ یاخود فارس بێ چونکە رەچاوی ئەوەکراوە کەکێ گوێرایەڵە کێ گوێرایەڵ نیە بە بێ سەیرکردنی نەتەوە

**پەیوەندی کۆمەلآیەتی کوردو فارس وەرۆڵی کورد لەدامەزراندنی دەوڵەتی ساسانیدا**

فارس و کورد هەردوکیان لەیەك رەگەزن کەئەویش ئاریەو ئاینیشیان کە زەردەشتیبووە یەك ئاین بووە وەهەروەها لەرووی پەیوەندی ژن و ژنخوازی دا تێکەڵ بوونە (١) وەکوردو فارس زۆر تێکەڵ بوونە لەرووی کۆمەلآیەتی و زمانیشیان دەکرێ بڵێین وەکو لەهجەوابووە(٢) بەلگە بۆ بوونی ئەوتێکەلآوییە پەیوەندیە ووتەکەی مینۆرسکی کە دەڵێ: یەکێك لەهۆکارەکانی بلآوبونەوەوتێکەڵ بوونی کوردو فارس ئەوەیە کەخزم بوونە وە ئەگەر برا نەبن ئەوا بەلایەنی کەم ئامۆزا بونە (٣) بەمە دەزانین کورد پەیوەندیەکی توندو تۆڵی هەبووە لەگەڵ ساسانیەکان وەهەرچەندە هەندێ بۆچوون هەیە کەپێ ی وایە بنەماڵەی ساسانی لەبنەچدا کوردن بەلآم ئەمە پێویستی بە بەلگەهەیە, لەکاتێکدا ئەردەوانی پێنجەم پاشای ئەشکانی نامە بۆ ئەردەشێر دەنوسێ و دەڵێت// ئەی کوردی لەنێو خێوەتی کوردان ژیاوی چۆن رێگەی تاجنان لەسەرت بەخۆت داوە (٤) هەندێك پێیان وایە کورد لێرەدا بەمانای کورد دێت بەلآم هەندێکی تر دەڵێن بەمانای رەشماڵی نشین دێن. هەرچۆنێك بێت ساسانیەکان لە رووی جوگرافیاوە لەکوردستان سەریان هەڵداوە و دەستیان بە بووژانەوە کردووە(٥) ساسان باپیرەی ئەردەشێر کە لەپەرستگای ئاناهید(ئاناهیتا) بوو پیاوێکی رۆمانی

زەردەشتی بووە لەشاری ئیستەخردا ساسان باپیرەی ئەردەشێر پەیوەندی ژنخوازی لەگەڵ بنەماڵەی بازریخان بەست کەحاکمی هەرێمی فارس بوون وە مەسعودی لەریزی خێڵە کوردیەکان ناوی دێنی(٦) وەکورد لە ناوچەی فارسەکاندا هەبووە.کەبە(زەم)ی کورد ناویان دێت :(٧) ئیستەخری ئەڵێ زمومی کوردان پێنجن لە فارس

١- زم جیلیوە ناسراوە بە زم الزینجان

٢- زم اللوالجان دەکەوێتە ئەردەشێر خورە

٣- زم الدیوان لەناوچەی شاپوور وەسەرۆکیان ناوی( ئازادکوریشهان) لەکوردان یاقوت حەمەوی بە السوران ناوی دێنیٚ

٤- زم شهریار کەدەناسریٚ بە زم البازنجان سرۆکیان ناوی (شهریار) بووە لەکوردان

٥- زم کاریان (٨)

بەهەمان شێوەش خەڵکی فارس و هەندیٚ لە پاشاکانیان لەناوچە کوردیەکان (چیاکان) دەژیان لەوانە (حلوان) (٩)

وەکۆشکیان لیٚ دروست کردیە لەبەر چەند هۆیەك لەوانە رێگای سەرەکی بازرگانی بووە, وە ئاوو هەوای خۆش بووە خاکەکەشی بە پیت بووە .

نموونەی پاشاکان شاپووری دووەم کەدەسەلآتی بەسەر نەسیبیەن داگرت ١٢ هەزار لەخەڵکی فارس بۆئەو ناوچە کوردی کۆچ پیٚ کرد و گواستەوە کەواتە تێکەڵی لەنێوان کوردوفارس هەبووە, وەساسانیەکانیش لەناو کوردەکانی هەرێمی فارس گەشەیان کردووە و دەرکەوتن (١٠)

**رۆڵی كور لە لایەنی ئیداری**

لەسەردەمی ئەشكانیەكان جۆرێك لە لامەركەزی هەبوو لەحوكم هەرێمەكانیش جۆرێك لەسەربەخۆیی خۆیان هەبوو بەلأم لەسەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی ساسانیدا / ئەردەشێری بابەكان / هەموو هەرێمەكانی خستە ژێر دەسەلآتی راستەوخۆی خۆیی و سیاسەتێكی مەركەزی گرتەبەر لە حكومدا (١١)وەدەوڵەتی مەركەزی وا دەخوازێت كە كێ لەناو بازنەی دەسەلآتدابێت رۆڵی دەبێت لەدەرچوونی بریارەكان , دەسەلآتی ساسانی خۆی لەحەوت بنەماڵەی بەناو بانگ دەبینیەوە كەیەكێك لەو حەوت بنەماڵەیە بەناوی /كارێن/ كوردبوونە كەئیستەخری لەچوارچێوەی / زم /ی كوردی داپناوە (١٢) وەهەروەهاوولآتی كوردان بەدرێژایی مێژوو وە لەسەردەمی ساسانیەكانیش دابەش ببو بۆچەندین هەرێم لەژێر ناوی جیاجیاو بەسنووری ناجێگیر بەهۆی ئەوململانێیە دوورو درێژانەی كەلەنێوان زلهێزەكان (١٣) رووی دەدا لەسەر خاكی كوردستان بەهۆی هەڵكەوتی جوگرافی, وە بەشێوەیەكی گشتی بەشی زۆری وولآتی كوردان لەژێر دەسەلآتی ئیمپراتۆری ساسانی بوو وەكو هەرێمەكانی

١- هەرێمی میدیا كەپێك هاتووە لەشارەكانی

أ-ئەكبەتان(هەمەدان) ب - نەهاوەند ج - قصری شیرین

٢- هەرێمی ئازاربایجان (میدیای ئاترۆ پاتین) شارەكانی

أ-ئەردەبیل ب- گنزك ج - شاپور خواست د - سی سەر

٣- هەرێمی جەزیرە (میزو پۆ تامیا ) شارەكانی

أ- ئامەد ب - رەها ج - دارا د - سبخار

١- هەرێمی حەدیاب شارەكانی

أ - ئەربل

٥ – هەرێمی کوردۆك شارەکانی

أ ئەرزنان

وە لەو هەرێمانەشدا کورد هەبوونە

١- هەرێمی ئەرمینیا

٢- هەرێمی ئەحواز ( خوزستان )

٣- هەرێمی فارس (١٤-١٥)

وە ئەوناوچانەی لەلایان حاکمێك بەرێوەدەبردران و بەسترا بوونەوە بەمەرکەز ئەوەش بۆئاسانی کۆنترۆل

کردنی ئەو ناوچانە وەهەروەها کورد لەناو کۆشك و لەپاشاش نزیك بووە گەلێك کاری گرنگی پێ سپێردراوە وە چەندین ناوی کوردی لە دەرباری کیسرا پرویز بەدەر دەکەوێت وەکو یەزدین کەلەناوچەی ( کەرخ بیت سلوخ ) بووەپایەکی بەرزی لەلای پاشا هەبووە(١٦) وە هەروەها کەسێکی تر بۆ نموونە : جبرائیلی سفاری کە پزیشکی پاشا بووە . لە وەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کورد خاوەنی پێگەیەکی بەرزو دیار بووە لە دەرباری دەسەلاتی ساسانی بەدرێژایی ماوەی حوکمرانی ساسانی یەکان(١٧)

رۆلی کورد لەلایەنی سیاسی لەلایەنی سیاسی کورد رۆلی هەبووە و لەخێزانی دەسەلات و لەناو بازنەی دەسەلات بووە وەکو خەلکانی تر نەبووە(١٨) بەلگەلەسەردەمی پیرۆز دووکەس دەسەلات دار بوون یەکیان( زەرمێهر ) یان ( سۆخرا ) کەبنەمالەی گەورەی کارێن (١٩) بوو کەبەبنەچە شیرازی و حوکمرانی سەکێستان بوو وە خاوەنی نازناوی هەزارەفت بوو ئەوەی تر شاپوور خەلکی رەی بوو بەسوپایەکی قوشەنێکی زۆر و زەوەندەوە لە (ئێبری ) و ئەرمەنستان سەرقالی شەربوون ئەم دووانە کە مەرگی پیرۆزیان پێگەیشت خێرا گەرانەوە ( تیسفون ) هەتا برشت و دەسەلاتی خۆیان لەهەلبژاردنی پادشای نوێ دابخەنە گەر

( وەلاش ) برای پیرۆز هەڵبژێردرا و لەدەورانی حوکمرانێتی ئەم پادشایەدا فەرمانرەوای راستەقینەی ئێران زەر مهێر بوو (٢٠) وەجگەلەوەی لەرووی ناوچە لەیەکتر نزیك بوونە و زۆربەی کوردان ئاینیان زەردەشتی بوو کە ئاینی ساسانیەکان هەر زەردەشتی بوو وە ئاین و دەسەلآت پەیوەندیەکی پتەویان بەیەکەوە هەبووە.

بەلآم ئەم نزیکیە ناوچەکانی کوردستانی لە کوشتن و برین و سوتاندنی زەوی زار و کۆچ پێکردن و چەوسانەوە رزگار نەکردووە بەلگە و نموونەی زۆر هەن کەچۆن سوپای ساسانی کاری کۆچ پێکردن و چەوسانەوەی لەناوچە کوردیەکان بەرامبەر بە کوردەکان ئەنجامداوە (٢١) جا چ لەبەر هۆی ئاینی بێت (٢٢)

یان بۆ زیاتر سەپاندنی مەرکەزیەت بێت. هەروەها یەکێکی تر لەهۆکارەکانی چەوسانەوەی کورد و دابەش بوونی بۆ دوو پارچە دەگەرێتەوە بۆ هۆکاری جوگراف کە کەوتۆتە نێوان دوو زل هێزی گەورە جگە لەوەی ئەودەسەلآتە خۆجێیانەی کە لەو ناوچە دروست دەبوون و وەلائیان و بۆ لایەن و هێزی جیا جیا هەبوو کەهەندێکیان وەلائیان بۆ ساسانی و هەندێکی تریان بۆ بیزەنتیەکان وەلائیان هەبوو .

وەیەکەم رووبەروو بونەوەی ساسانیەکانیش لەگەلّ هەرێمە کوردیەکان لەسەردەمی ئەردەشێری یەکەم بوو کەبەسەرکردایەتی لەشکرێکەوە رووی کردە کوردە میدیەکان لەناوچەی میدیا بۆئەوەی ئەوکەمە ئازادیەی هەیانبوو لێیانی بسەنێ , ئەگەر چی ئەردەشێر لەرو بەروبونەوەی یەکەم, رووبەروی بەرگریەکی توند بۆوە زەرەرو زیانێکی زۆری پێگەیشت بەلآم ئەمە وای لێنەکرد پاشگەز ببێتەوە لەهەولّی فراوانخوازی بۆدەست بەسەر داگرتنی ئەم هەرێمانە بۆیە جارێکی تر هێرشی کردەوە سەر میدیەکان و توانی بەسەریاندا زالّبێت و ژمارەیەکی زۆریان لێ بکوژێ و بگرێ کە لەنێوان دیلەکاند ( کوردان شاە ) بوو کەپادشای میدیەکان

بوو وەمەلیکی پاشای ساسانی هەستا بەکوشتنی زۆربەی خزم و کەس و کاری پاشای میدی و کۆچ پێکردنی ئەوانی تر لە دیلەکان بۆ هەرێمی فارس (٢٣)
وەهەرێمەکانی دەوڵەتی ساسانی مردنی ئەردەشێر و هاتنی شاپوری یەکەمیان بە هەلزانی و بۆئەوەی جارێکی تر سەربەخۆی خۆیان بەدەست بێنەوە بەلآم شاپوری یەکەم هەر لەساڵی یەکەمەوە هێرشی کردە سەر میدیەکان لەناوچەی چیاکان وەبەسەریان زاڵ بوو (٢٤) بەو شێوەیە هەموو وولآتی کوردان کەوتە ژێر دەسەلآتی دەوڵەتی ساسانی. بۆنموونە شارەکانی ( ئەرمەنستان و حەران )

## رۆڵی کورد لە لایەنی سەربازی

هەروەك دەزانین دەوڵەتی ساسانی هەرلەسەرەتایی بونیەوە تانەمانی, لەشەری دوور و درێژی بێپسانەوەدا بوو لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی رۆم و دواتر رۆمی بیزەنتی , وەهەرەوها زۆربەی شۆرشەکان لە کوردستان قەومان (٢٥)
, چونکە سنوری نێوان هەردوو لابوو , وەکورد لەو بەینەدا نەهامەتی زۆری دیتووە لە تالآنی و ماڵ وێرانی وە لەهەمان کاتدا بەژداری لەشەرەکان کردووە لەوانە هۆزەکانی چیانشینی قەفقاز و خواروی دەریایی خەزەر وەك گیل و کاردۆستی و ڤۆرت و ئالبانی و دەیلەمی بوون (٢٦) کەهەندێ جار بەئاشتی و هەندێ جار بەزۆرەملێ راپێچ کراون بۆبونە سەرباز و لاوەکانی لەو شەرانەدا بوونە قوربانی هەروەك و هورموزان لەرووبونەوەی موسڵمانەکاندا هەندێ جار پشتی بەکورد دەبەست (٢٧) وەلەگەڵ ئەوەشداپلەی سەربازی بەرزی هەبووە هەروەکو لە کاتی دەسەلآتی پیروز پاشای ساسانی دوو کەس خاوەن دەسەلآت بوو یەکیان (سۆخرا) یان( زەرمێهر) لە بنەماڵەی گەورەی کارێن (٢٨) کەبنەچە شیرازی وحوکمرانی هەرێمی سەکێستان وخاوەنی نازناوی (هەزارەفت ) بوون , ئەوەی دیکە شاپوور خەڵکی رەی و لە بنەماڵەی ناویە دەوری ( مێهران ) بوو لازارپ دەگێرێتەوە کە ئەم دوو سەرکردەیە بەسوپا و قۆشەنێکی زۆر و زەوەندەوە لە (

ئیبیتری ) و ئەرمەنستان سەرقاڵی شەربوون ۲۹ ئەمە بۆمان دەسەلمێنی کەکورد بەژداری شەری کردوە کەهەندێ جار بەپلەی سەربازی بەرز بەژداری کردیە, وەبەڵگەیەکی تر لەکاتی هاتنی سوپای ئیسلام ئەمەیان بۆ روون دەبێتەوە , هەروەکو خاوەنی کتابی ( الصغیر ) دەڵێ پاش جەنگی قادسیە لەنێوان فارسەکان کەس نەما رووبەرووی عەرەبەکان بێتەوە جگە لەیزد گوردی سێ یەم و یەکێ لەسەرکردەکانی ئویش هورمزی مادی (۳۰) و أبن الأثیر پێ ی وایە کەئەو هورمزانە یەکێکە لەکەسایەتیەکەی ( ۷ ) بنەماڵە خانەدانەکانی سەردەمی ساسانی(۳۱)

بەمەش بۆمان روون دەبێتەوە کە کورد لەرووی سەربازی رۆڵی هەبووە( ۳۲) و بەژداری شەرەکانی کردووەئەمەش لەبەر ئازایی و لێهاتووی .وە پاشاکانی ساسانی چەند ئاگردانێکی گەرۆکیان لەخێوە تێکدا دامەزراند , چونکە فەرمانرەوا یان هەرگیز بەبێ موغان (۳۳)وە بێ بوونی ئاگر , دەستیان بەشەر نەدەکرد (۳٤)

## رۆڵی کورد لەلایەنی ئاینی

ساسان باپیرە گەورەی ئەردەشێر خزمەتی پەرستگای ئاناهید ( ئاناهیتا ) ی دەکرد لە شاری ئیستەخردا (۳۵) وە دوڵەتی ساسانی کەلەساڵی ۲۲٤ ز دامەزرا دینی زەردەشت کردە دینی رەسمی و هەڵسا بەکۆکردنەوەی دەقەکانی ئاوێستا(۳٦) ساسانیەکان هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ رێبەرانی ئاینی زەردەشتی یەکتریان گرت و ئەم پەیوەندیە دۆستانەی نێوان دیف و دەوڵەت تاوەکو کۆتایی چاخی دەسەلاتی ساسانی هەر پتەو مایەوە ( ۳۷ ) چینی رێبەرانی ئاینی بریتی بوون لە دادوەران : زانایانی ئاینی / نزمترین و زۆرترین پلەی ئەم زانایانە لەبەرەی موغان بوو , پاش موغان موبەدان و هیر بەدان و ئاین دارانی تر هاتوون کەهەر کام خاوەنی کار و ئەرکێکی تایبەت بوون یەکێکی تر لە لق و پۆپەکانی چینی رێبەرانی ئاینی ( دەستوران ) و (مامۆستایان ) بوون بەم تاقمەی ئاخریان گوتوە موغان

ئەندەرز بود ( ٣٨ ) وە دەبێت ئەوە بزانین کە لەراستی دا موغان تیرە و توێژێکی نەتەوەی ماد بوون ( ٣٩ ) , کەپلەی رێبەرایەتی ئاینی تایبەت دراوە بەوان , ئەو کاتەی کە ئاینی زەردەشتی باڵی بەسەر ناوچەکانی رۆژ ئاوا و باشوری ئێران واتە ( هەرێمی مادو پارس ) کێشا , موغەکان بوونە پێشەوایانی ئەم دینە , لەکتێبی ئاڤێستادا چینی چینی پیاوانی ئاینی هەر بەو ناوە کۆنەیانەوە دێنە بەرچاو واتە (ئاسرەوان) بەلاّم لەچاخی ئەشکانی و ساسانی دا پتر بەم توێژەیان ووتووە موغان لەم رۆژگارەشدا پیاوانی ئەم تیرە خۆیان بەیەك رەگ و ریشە دەزانی و خەڵکیش بەچاوی چینێکی تایبەت لێی دەروانین و بەتیرەیەکەیان دەناسین کە ئەرکیان پەرستنی خوداکان و بەرێوەبردنی کارو باری ئایینی بووە ( ٤٠ )

وەهۆکاری دەسەلاّتی رێبەرانی ئاینی تەنیا نەدەگەراوە سەرمارەبرین ورۆژی لە دایك بوونی مندالاّن ولەم نەریتانە ,بەڵکو هۆی هەرەگەورەی برست وبرشتیان هەبوونی ئەو ملك وماشە زۆرانە بوو کە کەلەرێنی کەفارەتی دینی وخێزان ودەویەکەوەدەیانخستە سەر یەك ولەم کارەدا تەواو سەربەخۆ بوون ودەکرێ بلێین دەوڵەتێکیان لەناو دەوڵەت پێکیهێنابوو (٤١) ئەم چینە (پیاوانی ئاینی)دەسەلاّتیان زۆر بووە وەزۆرجار بە هۆی فراوانی دەسەلاّتی پیاوانی روحانیەت پاشانەی توانیوە جێگر بۆ خۆی دیاری بکات بۆ نموونەلە نێوان شاپووری یەکەم وشاپووری دووەم (٨) کەس بونەتەشاو ئەو دۆخە حاڵەتی تەقینەوەی لێ پەیدابووکاتێکیش ئازەر نەرسی لە ساڵی ٣١٠ ز ی چووەسەرتەختی پاشایەتی وە لەبەر ئەوەی بایەخی پێویستی بەروحانیەت نەدا ,نەی توانی درێژە بە پاشایەتیخۆی بدات ,برایەکیان کوێر کرد وئەوی تریان خستە بەندیخانە بۆ ئەوەی نیگەرانی نەمێنی ,شاپوری دووەم کەلەزگی دایکی بوو هێشتانەهاتبووە سەردونیا بۆ پاشایەتیان دیاری کردەوە لەم هەموو ماوەیەدا تا شاپوری دووەم گەیشتە تەمەنی (٢٠) ساڵی دەسەلاّت بەدەست موغەکان ودەوڵەمەندەکانی سەربە

ئەوان بوو (٤٢) هەروەها یەزدگردی کوڕی شاپوری سێیەم لە بەرواری ٣٩٩ ز بوو بە پاشا ونیشتە سەر تەختی پاشاییەوە لە چیرۆکە کانی ئێراندا بە ناوی یەزدگردی تاوانبار (گوناهکار ) ناوی ئەبەن ,چونکە دەیویست دەسەلاتی موغەکان وپیاوانی ئاینی کەم بکاتەوە (٤٣) جگە لەمانەش هەلبژاردنی پادشاش لە قۆناغی دوایی دا بۆدەنگی گەورەی مووبەدان دەگەڕاە کەئەرکی پرشانازی تاج لەسەر نانیشی بە ئەستۆوە بوو , خودی ئەم بابەتە بە ڕادی پێویست پلە وپایەی ڕێبەرانی ئاینی زەردەشتی لەو سەردەمەدا روون دەکاتەوە(٤٤) وە دەستێوەرانی کاروباری ناوخۆو بگرە سیاسەتی دەرەوە وکاروباری ئابووری ودادوەری وسەربازی لە سنووری دەسەلاتی ئەوان دابوو لە سەردەمی ساسانیەکاندا (٤٥) ((واتا لە دەست موغان بووە))

## رۆلی پیاوانی ئاینی

١- رۆلیان هەبووە لە ململانێی نێوان ئیمپراتۆریەتی ساسانی و بێزەنتی کەهەمیشە رۆلی هاندان و تیژ کردنەوەی پاشاکانی ساسانیەکانیان بینیوە لەدژی بیزەنتیە نەصرانیەکان(٤٦)

٢ – وەرۆلیان هەبووە لەهاندانی پاشا ساسانیەکان بۆچەوساندنەوە و دەربەدەر کردنی مەسیحیەکانی ژێر دەسەلاتی خۆیان و ئەوانەی لەئەنجامی هێرشەکانیان دەکەوتنە ژێر دەستیان ئەم ناوچانەش ئەوناوچە کوردیانە بوون کەلەسەر ئاینی مەسیحی بوون (٤٧)

٣ – وەرۆلیان هەبووە لەدژایەتی کردنی هەرکەسێك لەبنەمالەی ساسانیەکان نەبوبێ و هەولی دابێت دەسەلات بگرێتە دەست بەناوی ئەوەی پاشایەتی لەلایەن خواوە بۆ بنەمالەی ساسانیەکان دیاری کراوە بۆیە هەرکەسێك دژایەتی یان داوای ئەومافە بکات ئەوا لەدژی خوا وەستا وەنموونەش بەهرامی چوبین

٤ — وە رووبەروو بونەوەی سەر هەڵدانی هەموو جۆرە ئاین و مەزهەبێکی نویٚ بونەوە وەك مانەویەت یان مەزدەکیەت کە چۆن پاشاکانیان لیٚ هانداون تا لەناویان بەرن (٤٨)

(١) بۆنموونە ژن هێنانی ساسان باپیرەی ئەردەشێر لەبنەماڵەی بازرنجان کەحاکمی هەرێمی فارس بوون بروانە
ماستەرنامەی بۆتان تۆفیق , صراع الساسانی البیزنطي ل ٢٣
(٢) چونکە لەرووی ناوچە لەیەك نزیك بوونە ئەگەربێت لەئێستادا کوردی سۆانی و بادینی کەزمانیان یەکە لەرووی لەهجە لەیەك جیان و بۆماوەی ١٠٠ ساڵ پەیوەندیان نەمێنی زمانیان دەبێتە زمانێکی سەربەخۆ وەئێستاش
زمانی فارسی و کوردی لەیەك نزیکن
(٣)بوتان توفیق, الصراع الساساني البیزنطي , ل٤٥
(٤) أبن الأثیر , الکامل فی التاریخ , و زاهیر محمد رشید , چ. ١ . چوارچرا , سلێمانی , ٢٠٠٨ , بەرگی ١ , ل ٤١٦
(٥) قاسم هاشمی نژاد , کارنامەی ئەردەشێری بابەکان ازڤن بهلوی , چاپ و پەخشی سەردەم ( سلیمانی , ٢٠٠٠) ل ٣
(٦) قاسم هاشمی نژاد هـ.س ل ٢٣_٢٤
(٧) لەهەندیٚ کتێبی بە(زم) ناوی هاتووە بروانە کلسومە جمیل , کردستان فی العهد الساسانی , چاپی یەکەم , چاپخانەی وەزارەتی تربیە , أربیل ل ١١٤– ١١٥
(٨) الدینوری : الاخبار الطوال , القاهرة ,١٩٦٠ , ل ١٠١
(٩) ئەگەر ئەردەشێر کوردیش نەبیٚ بەلاٚم لەناو کوردان هەرێمی فارس ژیاوەو گەورە بووە
(١٠)ماستەر نامە , بوتان توفیق ,الصراع الساسانی البیزنطي , ل١٠

(١١) كلثومه جميل , كردستان في عهد الساسانين ,چاپی یەکەم , وزارة تربية , اربيل ,٢٠٠٧ , ل ١١٤–١١٥

(١٢) بەتایبەتی ساسانی و بیزەنتی

(١٣) بوتان توفيق , الصراع الساساني البيزنطي وأثره على بلاد كرد ,٢٠٠٢–٢٠٠٣ ل ٢٩–٤٣

(١٤) هەمان سەرچاوە , ل ٣٠–٣١

(١٥) بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا کورد بێبەش نەبووە لەچەوساندنەوە و دەربەدەر کردن . هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کەبەچاوی کورد و فارس سەیری چینی ژێردەستە نەکراوە بەڵکو بەجیاوازی ئاین و چینایەتی سەیریان کراوە

(١٦) بروانە ماستەرنامەی بوتان توفيق , صراع الساساني البيزنطي , ل ٢٧ , ل ٤٢

(١٧) مەبەست لێی وەکو عەرەب و ئەرمەن دەسەلاّتی کەم نەبووە .

(١٨) بنەماڵەیەکی مادی کورد بوونە

(١٩) ئێرانی سەردەمی ساسانیەکان , چاپخانەی شڤان , سلێمانی , ٢٠٠٦ , ل٣٦٦

(٢٠) قاسم هاشم نژاد : کارنامەی ئەردەشێری بابەکان أزمتن بهلوی ( سلێمانی ,٢٠٠٠) , ل٤٧

(٢١) چونکە هەندێ لەکوردان مەسیحی یان یەهودی بوونە .

(٢٢) قاسم هاشم نژاد, کارنامەی ئەردوشێری بابەکان أزمتن بهلوی , ( سلێمانی , ٢٠٠٠) , ل٤٧

(٢٣) ماستەر نامە , بوتان توفيق , الصراع الساساني البيزنطي , ل١١

(٢٤) قاسم هاشمی نژاد , کارنامەی ئەردەشێری بابەکان , چاپ و پەخشی سەردەم , سلێمانی , ٢٠٠٠,ل ٦٦

(٢٥) ئارتور کرتێنێن , ئێرانی سەردەمی ساسانیەکان , چاپخانەی شڤان , سلێمانی ,٢٠٠٦ , ل٢٧٥

(٢٦) حەسەن مەحمود کەریم , کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا , چاپی چوارەم , کۆمپانیای چاپ و پەخشی نوسەر , ٢٠٠٧,١٢٣

(٢٧) دەوڵەتی ساسانی حەوت بنەماڵەی بەناوبانگی هەبوو کەخاوەن دەسەلآت بوون وە یەکێك لەوانە بنەماڵەی

(کارێن) بوو کەبنەماڵەیەکی کوردی (ماددیە)

(٢٨) ئارتو کرتێنێن , ئێرانی سەردەمی ساسانیەکان , چاپخانەی شڤان , سلێمانی , ٢٠٠٦ , ٣٦٦

(٢٩) ماستەر نامە , بوتان توفیق, الصراع الساسانی البیزنطي , ل٢٣

(٣٠) بەلێکدانەوەی هەردوو بۆ چونەکەی سەرەوە دەکرێ بلێین ئەو هورمزانەی کەخاوەنی کتابی الصغیر بەمادی ناوی دێنێ وأبن الأثیر بەیەکێ لەئەندامانی حەوت بنەماڵەکە ناوی دێنێ دەکرێ بلێین سەربەهۆزی (کارێن) بێت

(٣١) ئەمانە تیرەو توێژێکی ماددی بوونە ( واتە کورد)

(٣٢) ئارتور کریتێنێن , ئێرانی سەردەمی ساسانیەکان , چاپخانەی شڤان , سلێمانی , ٢٠٠٦, ٢٧٧

(٣٣) کلثومە جمیل , کردستان فی العهد الساسانی , الطبعة الأولی , وزارة تربیة , أربیل , ٢٠٠٧ , ٨٣

(٣٤) کلثومە جمیل , (هـ.س) ل ٤٧

(٣٥) ئارتور کریتێین , ئێرانی سەردەمی ساسانیەکان , چاپخانەی شڤان , سلێمانی, ٢٠٠٦

(٣٦) حەبیۆڵڵای تابای , هاونەتەویی قەوحی کوردو ماد, چاپخانەی تیشك, سلێمانی ,٢٠٠٤, ل٢٨٥

(٣٧) هەروەك دەزانین مادەکما ( میدیەکان) کورد بوون

(٣٨) ئارتور کریتێین , ئێران سەردەمي ساسانیەکان , چاپخانەی شڤان , سلێمانی و٢٠٠٦,ل ١٤٣

(٣٩) ئارتور کریتێین , ئێرانی سەردەمی ساسانیەکان , چاپخانەی شڤان , سلێمانی , ٢٠٠٦

(٤٠) ئارتور کریتێین , (هـ.س)

(٤١) شوکر و ڵاڵای بابان , مێژووی کورد و کوردستان , چاپخانەی شڤان , سلێمانی , ٢٠٠٤ , ل٧٣

(٤٢) ئارتور کریتێین , ئێرانی سەردەمی ساسانیەکان , چاپخانەی شڤان , سلێمانی ,٢٠٠٦ , ل٢٣٨

(٤٣) د. ئەردەشێر خودادیان , ئاریەکان و ماددەکان , چاپخانەی بەدرخان , سلێمانی , ٢٠٠٣, ل ١٢٧

(٤٤) چونکە لەروانگەی ئاین سەیری دەوڵەتی بێزەنتیان دەکرد وە کە هەوڵی بڵاو کردنەوەی ئاینی مەسیحی

دەدا لەناو دەوڵەتی ساسانیدا

(٤٥) موغان سەیری نەدەکرد و کە ئەمانە وەکو خۆیان کوردن بەڵکو سەیری ئاینیان دەکرد.

(٤٦) بۆ زیاتر زانیاری بروانە ماستەر نامەی بۆتان تۆفیق , صراع الساساني البيزنطي .

سەرچاوەکان

١–القران الکریم

٢– أبن الأثیر الکامل فی التأریخ , وەرگێرانی / زاهیر محمد رشید , چاپی یەکەم , چاپخانەی چوار چرا , سلێمانی , ٢٠٠٨

٣– قاسم هاشمی نژاد , کارنامەی ئەردەشێری بابەکان , أزمتن بهلوی , وەرگێران و لەسەر نوسینی شاسوار

هەرشەمی , دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ( سلێمانی , ٢٠٠٠)

---

ژێ دەرە نوێ یەکان

١– ئارتور کریستێنسن , ئێرانی سەردەمی ساسانیەکان , وەرگێرانی صەلاحەدین ئاشتی چاپخانەی شڤان ,

(سلێمانی , ٢٠٠٦ )

٢– کلثومە جمیل عبدالواحد, کردستان فی عهد الساسانین , چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە , اربیل , چاپی

یەکەم , ٢٠٠٧

٣– حەبیبوڵڵای تابانی , هاونەتەوەیی قەومی کورد و ماد , و جلیل گادانی , چاپخانەی تیشك , سلێمانی , ٢٠٠٤

٤– شوکروڵڵای بابان , مێژووی کورد و کوردستان , چاپخانەی شڤان , سلێمانی , ٢٠٠٤

٥– د. ئەردەشێر خودادیان , ئاریەکان و माددەکان , چاپخانەی بەدرخان , سلێمانی , ٢٠٠٣ , و عەلاء نوری بابە عەلی

٦– حەسەن مەحمود حەمە کەریم , کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا , چاپی چوارەم , کۆمپانیای

چاپ و پەخشی نوسەر , ٢٠٠٧
٧- ماستەر نامەی بۆتان تۆفیق , الصراع الساسانی البیزنطي و اثرة علی بلاد الكرد خلال الحقبة (٥٩٠_٦٣٠م )
دراسة سیاسیة حضاریة , بأشراف أ.م.د. أحمد میرزا میني

# چاوپێخشاندنێك بە مێژووی ڕێنیسانس

(بەشی یەکەم)

نووسینی: ئامانج نازم بیجان

((گووتەی بەرایی))

ئـــەم لێکۆڵینەوەیە،لەبنەڕەتـــدا بەشـــێکە لـــە تۆژینەوەیـــەك لـــەژێر ناونیشانی((ڕۆڵی دانتی ئەلیجیری لەبزوتنەوەی ڕێنیسانس دا))،کە لەسێ بەشی سەرەکی پێك هاتووە،جا (چاوپێخشاندنێك بەمێژووی ڕێنیسانس)،بەشی یەکەمی ئـــەو لێکۆڵینەوەیەیەشـــیاوی گووتنە،ئـــەم لێکۆڵینەوەیـــە وەکـــو بەشـــێك لەپێداویستییەکانی بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەکالۆریوس،پێشکەش بە بەشی مێـژووی-(مێـژووی گشتی) زانکـۆی سـەلاحەددین-هـەولێر کـراوە،وە لەلایـەن بەڕێز((د.نیشتیمان بەشیرموحەممەد))ەوە سەرپەرەشتی کراوە،وەلە بەرواری (١٢-٥-٢٠٠٧)دا پێشکەش کراوەو،لەلایەن بەڕێزان((د.سروە ئەسعەد سابر)) و((م.کابـــان عەبدولکـــەریم عـــەلی))یـــەوە،تاوتوێ کراوە،دواتـــر بەپلـــەی (نایـاب)هەڵـسەنگێنراوە.وەهـــەروەها لەهـــەمان ســاڵ ولـــە کۆلێـژی ئـاداب ولـەهۆڵی(فـەرهادی)دا،وەك وسیمیناریش پێشکەش کراوە،کە بەسەرپەرەشتی (سەرۆکایەتی بەشی مێژوو) بەڕێوەچووە،ئەم لێکۆڵینەوەیە هەرچەندە جێگەی خۆی لـەلای خـەڵکانێکی زۆر کردبووەووە،وە لـە زۆر شـوێن وجێگـەی تـردا بـەرز نرخێنرابوو،بـــەڵام لەگـــەڵ بـــوونی ئەمـــەش،بۆ خۆمـــان زۆر وکـــەم لێ ی ڕازی نەبووین،چونکی ئەوەی ئاواتمان بۆ دەخواست وئومێدمان بوو بێتە دی،جێ بەجێ

نەکرا !لەبەر ئەوەی هەر لەو دەمەدا لێکۆڵینەوەکە و خاوەنەکەشی کەوتبوونە ژێرفشار وچوارچێوەیەك،کەدەرچوون تێیدا ئاسان نەبوو،ئەمە بەدەر لەوەی کەوا دەرفەتێکی وەهامان نەبوو هەتاوەك ومافی تەواوی خۆی بدەینێ،چونکی زۆر بابەت هەبوو لای خۆمان وەك وتێبینی تۆمارمان دەکرد وتێکەڵی لێکۆڵینەوەکەمان نەدەکرد.کەواتە ئەم لێکۆڵینەوەیە هەمان لێکۆڵینەوەی نێوبراوە،بەلام ئەم جارەیان بەدەستکاری وگۆڕینەوە هاتۆتە بەرهەم و،خۆی لەبەرگێکی نوێ تردا دەبینێتەوە.ئەگەر خودا تەمەن بداتن،تەوەرەکانی تری ڕێنیسانس و،دوو بەشە سەرەکییەکەی تریشی بلاودەکەینەوە.

((دەروازە))

پێش ئەوەی ڕاستەوەخۆ بچینە سەرباسکردن وشیکردنەوەی هۆکار و،دەرئەنجامەکانی سەردەمی ڕێنیسانس،پێویستە ئاوڕێك لە سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست بدەینەوەو،هەوڵبدەین لەودەرگایەوە بڕۆینە ژوورەوە چونکی ماوەی ڕێنیسانس بۆخۆی هەڵقوولاوی ناخی سەردەمی سەدەناوەندییەکانە،ئەمەجیا لەوەی کەوا تەواوی قۆناغەکانی مێژووی مرۆڤایەتی،پێکەوە گرێدراون وپەیوەندییەکی پتەوو توندوتۆڵیشیان پێکەوەهەیە.جا بۆئەوەی لەوماوەیەدا تۆزێك شارەزابین،گرنگە سەرەتا زاراوەی سەدەکانی ناوەڕاست و واتاکەی بناسێنین،پاشان ماوەی تەمەنی بخەینەڕوو،دواتر بپرسین ئاخۆ چ گوزەراوە لەوماوەیەداو،سەرئەنجام چ جۆرە گۆڕانکارییەك هاتۆتە گۆڕێ ؟ زاراوە وچەمکی((سەدەکانی ناوەڕاست))—

((MEDIUMAEVUM))،ئەگەر بەدووی دا بگەڕێین و،بپرسین ئایا کەی ئەم ئیدیۆمە بەکارهاتووە،وەلەلایەن کێ وە بۆ یەکەم جار ووتراوەتەوەو،لەچ ئان وساتێك دابووە؟ بێ گوومان ڕووبەڕووی زیاتر لە بۆچوونێك دەبینەوە.هەندێك وای بۆچـــووە کـــەوا زاراوەی نێوبراوو،بۆیەکـــەمین جارلەلایـــەن ئەدیبـــە مرۆڤدۆســـتەئیتاڵییەکانەوە بەکارهێنراوەو،ئەوماوەیـــەی کـــەوا تێیـــدا بەکارهێنراوە،دەکەوێتەسەدەی (پازدە)و(شازدە)ی زایینیەوە،(١)وەلێ لەهەندێ شوێن وجێگای تردا،واباسکراوە کەوائەم چەمك وزاراوەیە،یەکەمین جار لەلایەن مێژوونووسێکی ئیتاڵییەوە بەنێوی((فلاویۆبۆندۆ))وە بەکارهاتووە،کەلەسەدەی (شازدە)هەم دابووە(٢) لەمیانەی ئەم دووبۆچوونەوە،بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە زاراوەی سەدەکانی ناوەڕاست وبەکارهێنانی زیاتردەگەڕێتەوەبۆ سەدەکانی (پازدە)و(شازدە)ی زایینی،کەئەم بەکارهێنانەش لەلایەن بیرمەندو فەیلەسووف وڕۆشنبیرانی ئیتاڵیاوەبووە،کە لە نێو بەرهەمەکانییان دا بەتەواوی ڕەنگی داوەتەوە،چونکی چ وەك وزاراوە وچ وەك وباس ولێکۆڵینەوە، وەهەروەها لەڕووی کات وماوەشەوە،زیاتر لەپاش ئاوابوونی کلتووروومێژووی سەدەکانی ناوەڕاست،سەدەناوەندییەکان بووتەجێگەی باس ولێکۆڵینەوە،ڕوونتر بڵێین لەسەردەمی ڕێنیسانس دا شیاوی باسە،بپرسین داخۆ ناوی(ناوەڕاست–ناوەند) واتای چ دەگەیەنێ ؟ بەرسڤی ڕاست ودروستی ئەم پرسیارەئەوەیە،بگووترێ سەردەمی ناوەڕاست،ئەو سەردەمەیە کە درێژکەرەوەی نێوان ڕووخانی ئیمپراتۆری ڕۆمانی ڕوژئاوا لەساڵ(٤٧٦)زایینی و،(٣)فەتح کردنی شاری قوستەنتینییەیە لەلایەن عوسمانلییەکانەوەلەساڵی(١٤٥٣)زایینی(٤) لەم باسەوە بۆمان بەدیاردەکەوێت،کەوا ئەوناولێنانە هەر لەخۆوە بۆی دانەتاشراوە، بەڵکو بنەمایەکی مێژوویی ڕاستەقینەیی هەیە،ئەویش ئەوەیە کەوا(سەدەکانی ناوەڕاست)،ڕۆڵی ناوەند دەبینێت لەنێوان "سەردەمی کۆن" و"سەردەمی نوێ"

دا،شایەنی گووتنە،ئەم چەمك وزاراوەیە لەكاتێك دا براوەتە بالآی ولەنووسین وبەرهەمەكاندا بەكارهێنراوە،كەپاش ئەم ماوەیە،سەردەم وچاخێكی تر لەدایك بووە وهاتۆتە بوون،وەك وسەردەمی رێنیسانس وسەردەمانی نویّ گرنكە بگووترێت سەردەمانی ناوەڕاست وەك وماوە ومێژووی خۆی،ئەوماوە دوورو درێژە دەگرێتەوە، كە لە باكووری رۆژئاوای ئەوروپادا،گەیشتۆتە نزیكەی هەزارسالّ،(٥)كەبەڕاستی ماوەیەكی دوورودرێژە ! وەهەروەها بە مەبەستی سەرەتاو دەسپێكی تەمەنی ئەوماوەیە،چەندین ڕاوبۆچوونی جیاجیاهەیە بۆ وێنە هەندێك لەمێژوونووسەكان باس لەوەدەكەن،كەسەدەكانی نێوبراوو،لەوكاتەوەدەست پێدەكات،كەوا ڕۆما وئیمپراتۆری ڕۆمانی بەدەستی بەربەرە جەرمانییەكانەوە لەسالّی(٤٧٦)ی زایینی دا ڕووخا،هەندێكی تریان ووتوویانە لەو دەمەوە سەدەكانی ناوەڕاست دەستپێدەكات، كە قوستەنتینییە دروستكرا لەسالّی(٣٣٠)ی زایینی،وەئەم شارە بووە پایتەختی ئیمپراتۆری ڕۆمانی لەبری ڕۆما،بەلاّم بەلای هەندێكی ترەوە،سالّی(٣٩٥)ی زایینی دەست نیشان كراوە بۆ ئەم مەبەستە،كە تێیدا ئیمپراتۆری ڕۆمانی لەت لەت كرا بۆ دووئیمپراتۆر،یەكەمیان:ڕۆژهەلاّت كەپایتەختەكەی قوستەنتینییەبووە، دووەمیان:ڕۆژئاوا كە پایتەختەكەی ڕۆما بوو (٦) جگە لەم بۆچوونانە،چەندین ڕوانگە وڕای جیاواز لە یەكتر هەیە،كە هەندێكیان لە ڕووی مێژووییەوە،وەهەندێكی تریشیان تەنانەت لەڕووی شوێن وجێگای ڕووداوەكانیشەوە جیاواز وناتەبان لەگەلّ یەكتردا بۆ نموونە بەلای هەندێك نووسەرەوە شەڕی(ادرنە)ی سالّی(٣٧٨)ی زایینی،یاخود ڕووخانی ڕۆما لەسالّی(٤١٠)ی زایینی،بۆ كۆتایی سەردەمی كۆن وسەرەتای سەردەمی ناوەڕاست ئەژمار دەكەن،(٧)كەچی بەلای هەندێك كەسی ترەوە،بلاّوبوونەوەی مەسیحییەت ودانپێنانان بەو ئایینە لەسەدەی (چوار)دا،وەك وئایینێكی فەرمی،سەرەتای سەدەكانی ناوەڕاستە،(٨) وێڕای ئەم بۆچوونانەش،

چەندین مێژوونووسی زانستی وئەکادیمی وشارەزا وپسپۆڕ هەن،کەوا ماوەی سەدەکانی ناوەڕاست،لە نێوان سالآنی(٤٧٦-١٥٠٠)ی زایینیان دەستنیشان کردووە،(٩)پێش هەموو شتێك دەبێت ئەوە ڕوون بکەینەوە،کەوا تەواوی بۆچوونەکان هەروا بەئاسانی نەهاتوونەتە بوون و،بابەتێکی هەڕەمەکی وسانا نی یە،بەلکو مێژوونووسان وپسپۆران پاش خوێندنەوەو شیکردنەوەی ڕووداوەکان،توانیوویانە لە ڕوانگەو ڕێبازی تایبەتی خۆیان بگەن بەڕاستییەك کەبۆخۆیان باوەڕیان پێیەتی بەلآم لەگەلّ بوونی هەموو ئەمانەش،دەبێت بەچاوێکی گومانەوە،بڕوانینە هەموو ڕاو بۆچوونە جیاجیاکان،چونکی جگە لەم دیدو بۆچوونانە،چەندین بۆچوون وڕوانگەی تر هەیە،کەوا لەم گۆڕەپانەدا ئەسپی خۆیان تاوداوە یاخود دەکرێت بلّێین لەکۆی ئەو بۆچوونە جیاجیایانەوە،گومانمان لەلا دروست بوو،وە لە هەندێ جاریش گەیشتن بە هەقیقەت سەرێ هەلّدەدایەوە! گومان لەوەی ئەگەر هات وئێمە یەکێك لەو بۆچوونانەمان وەرگرت،کە ئایا چۆن دەکرێت مێژوونوسێك ڕووداوێك یاخود کودەتا وگۆڕینێکی ڕامیاری وئایینی وکۆمەلآیەتی وڕۆشنبیری،وەربگرێت وبیکات بەسەرەتا یاخود کۆتایی سەردەم وقۆناغێکی مێژوویی؟ بشێ هەر بەتەنها لەیەك شوێن وناوچەدا ڕووبدات! ئاخۆ دەکرێت ودەگونجێت بەکودەتا وگۆڕینی بوارو لایەنێکی ژیانی،ئیدی ڕاستەوخۆ پێ بنێتە قۆناغ وژیان وگوزەرانێکی ترەوە؟ لەهەمان کات دا هەندێك جار ڕاستی ودروستی لەو بۆچوونانە،لەو گۆشەنیگایەوە دەدۆزرێتەوە،کەوا ئەگەر تێبینی بکەین زۆربەی زۆری ڕاوبۆچوون وڕوانگە جیاوازەکان،گوزارشت لە گۆڕین وکودەتا دەکەن،وەهەروەها لەهەندێك کات وشوێن دا بانگەشەی سەردەم وقۆناغێکی تازەو نوێ دەکەن،بەلآم دەبێت ئەم بارودۆخە تازەیە کەوا خۆی لەگۆڕین وتازەگەرییەوە دەبینێتەوە تەواوی شوێن وجێگاکانی کۆمەلگە بگرێتەوە، وە لەهەمان کات دا پێویستی بەماوەو کاتێکی زۆر

هەیە،هەتاوەك وكۆمەڵگە خۆی لەو داب ونەریتەی پێشووی دابماڵێ بەتایبەتی مێژوویەكی وەك ومێژووی سەدەكانی ناوەڕاست كە تەمەنی گەلێك زۆرە،ڕەنگبێت هۆی ئەم تەمەن درێژییەشی بگەڕێتەوە بۆتەمەنی كەنیسە وپیاوەكانی،كەوا چ جۆرە بۆچوون وڕوانگە وڕێبازێكیان لەمێشك وهزری كۆمەڵگادا چەسپاندووە!لەوماوەیەدا كەوا بەتەواوی دەسەڵاتی گرتربووە دەست كەواتە ئاینی مەسیحی لەسەدەكانی ناوەڕاست دا،لە ئەوروپادا گەورەترین وكاریگەرترین ڕۆڵی گێڕاوە،چونكە وەك وكۆڵەكەیەكی سەرەكی وبەرچاو ڕۆڵی هەبووە،لە ئەفراندنی مێژووی نێوبراوودا لەبەر ئەوەی كەنیسەی مەسیحی لەژێر سایەی ئیمپراتۆری ڕۆمانی كۆن دا دەركەوت،وە لەپاش نەمان ولەنێوچوونی دەوڵەتی ڕۆمانی،ئیدی كەنیسەی كاتۆلیكی جێگەی دەگرێتەوە لە ڕۆمادا(١٠) كەواتە لەو دەمەدا كۆمەڵگای ئەوروپی بۆ ماوەی نزیكەی هەزار ساڵ لەژێر سایەو بەزەیی كەنیسە وپیاوانی ژیانی گوزەراندووە،ئەمەیان لەلایەك،لەلایەكی تریشەوە دەرەبەگەكان،(١١)بەوپەڕی توانای خۆیان دەستیان نابوویە بینەقاقای كۆمەڵگەو، بەویستی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ دەكرد شیاوی باسە،پاپا دەسەڵاتی لەسەرووی هەموویانەوە بووە،لەهەمان كات دا كەنیسەش بە پارەو پول و زەوی و زارو موڵك نغرۆ بووبوو چونكەخاوەن زەوی وزارێكی زۆر بووە،یاساو دادگای تایبەتی خۆیشی هەبوو،وە هەروەها ژنهێنان ومیراتیش هەر لەدەستی كەنیسەدا بووە،لەهەمان كاتدا سەرپەرەشتی قوتابخانە و زانكو و نەخۆشخانەكانیشی دەكرد،جگە لەدەسەڵاتی ڕامیاری،باجی دەسەند و دەستی خستبووە نێو كاروبارەكانی دەوڵەتی ئەوروپاش،وەخودی پاشاكانیش دەبوو پاپا تاجی پاشایەتی بنێتە سەریان،بۆ ئەوەی ڕەوایەتی هەبێت(١٢) لەمیانەی ئەم باسەوە،بۆمان ساغ دەبێتەوە،كەوا پاپاو كەنیسەو پیاوەكانی ئاینی مەسیحی،پاش ئەوەی جێگەی خۆیان گرت ودەسەڵاتیان بەدەستهێنا،ئیدی خۆیان خزاندە نێو بوارە جیاجیاكانی

ژیانی کۆمەڵگەوە،وەك وبواری(ڕامیاری-کۆمەلایەتی-ئابووری-ڕۆشنبیری)،وە لەهەمان کات دا خۆیان کردبوو بە بەرپرسی هەمووئەو لایەن وبوارانەی کە باسکران سەیر لەوە دابوو،کەنیسە و پیاوانی بۆخۆیان دەستیان والآ کردبوو،بۆ هەر گفت وکردارێك کە ئارەزویان بکردایە !کەچی بۆ هیچ کەس نەبوو لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکات،واتە کەنیسە ودار و دەستەکەی،جگە لە جڵەوی دەسەلاتی ئایینی،بەڵکو دەستی بەسەر تەواوی بوارو لایەنە دونیاییەکانیشدا گرتبوو بۆنمونە کەنیسەی مەسیحی بۆ ماوەی نزیکەی هەزار ساڵ بزوتنەوەی پێشکەوتنی زانستی وەستاندبوو،کە هەر بۆخۆشی بەرپرسیار بوو لەم دۆخەدا،ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو،کەوا ڕۆشنبیری هەرهەمووی قۆرغ کرابوو لەنێودەستی دا(١٣) هەر فشارو دۆگمایی وچەقبەستوویی کەنیسە و پیاوانی بوو،وایکرد لەسەرەتای سەدەی (سیازدە)هەمەوە دەست بکرێت بە دامەزراندنی دادگایەکی تایبەتی سەربەخۆ،کەبە((دادگاکانی پشکنین))ناسراوە،(١٤) ئەویش بەمەبەستی ڕاوەدوونانی ئەوکەسانە بوو،کە گومانی ئەوەیان لێدەکرا کە دژ بە کەنیسە دەوەستن و،بە نامرۆڤانەترین شێوە کەوتنە وێزەی ئەوکەسانەی کە تاکە ووشەیەکیان دژی کەنیسە بدرکاندایە،جابۆیە لەماوەی نزیکەی دوو سەدەدا،دەیان هەزار کەسیان لەئاگردا سوتاند و بەزیندانی هەمیشەیی سزایاندان و،سزای ماڵیشیان بەسەر هەزاران کەس داسەپاند(١٥) لەمەوە ئەوە دەخوێندرێتەوە کەوا کەنیسەی مەسیحی،ئەگەرچی توانیوویەتی دەست بەسەر بواری ڕۆشنبیری دا بگرێت وکۆنترۆڵی بەش ولقەکانی بکات،لەهەمان کاتدا بەهیچ بۆچوون و ڕوانگە وڕێبازێك قایل نەدەبوو کە لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی دا تەبا نەبێت! دیارە بواری دارایی و ئابووریش،بەهەمان چەشن بێ بەش نەبووە لەو هەڵسوکەوتەی کەنیسە وپیاوەکانی،کە بە هەزار و یەك درۆوە کۆمەڵگەیان لە ڕووی دارای وئابوورییەوە تەکاندبووەوە چونکی پاپاو ئوسقوفەکان هەموو کاتێك ویستیاری پارەو پوول

بوونە،جا پاپاکانیش بۆ بەرهەم هێنان وپارێزگاری لەشکۆ و دەسەڵاتی خۆیان ودەربارەکەیان،نیازیان بەو پارەیە هەبوو،کە لە ئوسقوف وخەڵکیان وەردەگرت (١٦)ڕەنگبێ زۆر دوور نەکەوینەوە لەڕاستی،ئەگەر لەم بارەیەوە(پسوولەی لێبووردن) وەك و زەقترین نموونە بهێنینەوە بۆئەم مەبەستە،کەوا کەنیسە بەوکەسانەی دەفرۆشت کەوا لەسەر بیروباوەڕی ئایینی مەسیحیین،بەناوی خوداوەندیشەوە،لە گوناهەکانی خۆش دەبوو،ئەمە وەك ونەریتێك،کەنیسە لەماوەی دەسەڵاتی ڕەهایی خۆی دا پیادەی دەکردو،بەسەر کۆمەڵگادا سەپێنرابوو (١٧)جا هەر بەهۆی ئەم ڕەفتار و هەڵسوکەوتەی کەنیسە بوو،کە کۆمەڵگا بە تەواوی بەهیلاك چوو بوون،وە بەردەوام چاوەڕوانی چاکسازی وبوژاندنەوە و تازەگەری بوون وەبەهۆی ئەم کلتوور و مێژووەوە بوو،کەوا کەنیسەو پیاوانی ودواتریش سەردەمەکەی،بکەوێتە بەرتیشکی ڕەخنەو توانج لێکرتن ئەوەتا هەر لەسەردەمی ڕێنیسانسەوە ئەوروپاییەکان بەتوندی ڕەخنەیان لەسەدەکانی ناوەڕاستی خۆیان دەگرت،وەبەلای هەندێك لە ڕۆشنبیران ومێژوونوسانیشەوە،بە((چەرخی تاریکی))ناوزەدییان کردووە (١٨)لەم بارەیەشەوە مێژوونووسی بەناوبانگی فەرەنسی ((ژول میشلە))،لەساڵی(١٨٨٥) زایینی دا،بەرگی حەوتەمی پەرتووکەکەی بەزایینی دووبارە(ڕێنیسانس)ناوناوەو، تێیدا باس لەسەدەکانی ناوەڕاستیش دەکات،بەلاّم وەك وسەردەمێك ناوی دەبات،کەوا زانست وسروشتی مرۆڤایەتی تێیدا لەیاد کرابوون،وەهەروەها باس لەوەش دەکات،کەوا مرۆڤ لە ئازادی خۆی بێ بەش کراوە (١٩)لەمەشەوە نابێت بەلامانەوە سەیر بێت،کەوا کەسانێك هەن،لایان وایە مەسیحییەت لە کایەی کولتوورو داب ونەریت وشارستانییەت دا،ڕۆڵێکی کاولکارانەی گێڕاوە (٢٠)لەم باس وخواسەوە،ئەوەی تێدا دەخوێندرێتەوە،کەوا مرۆڤ لەو ئان وساتەدا،هیچ بەهایەکی بۆنەمابوویەوە،جگە لە بەکارهێنانی بۆ بەرژەوەندی کەنیسەو

پیاوەکانی، ئەمە جیا لەوەی،کە کۆمەڵگاش بەشێوەیەکی گشتی،بەدەستی دەسەڵاتی ئایینی وڕامیاریش دەینالآند ونغرۆی ستەم و زوڵمەکانی بوو بەلآم لەگەڵ بوونی هەموو ئەمانەش،وامان لێناکات کەوا سەدەکانی ناوەڕاست بەهەموو تەمەنییەوە، بەچەرخی تاریکی ودواکەوتوویی وەسف بکەین،ئەگەرچی زۆر لە ڕۆشنبیران وبیرمەندان وای بۆدەچن! چونکی لەلایەك دەبێت ئاگاداری ئەوەبین،کە ئەو ماوە دوور ودرێژە هەر هەمووی بەیەك ئاڕاستەو،بەیەك ئاست نەڕۆشتووە،وەلە هەمان کاتدا لەشوێنێکەوە بۆ شوێن وجێگایەکی تر جیاوازی بەدی دەکرێت شایانی باسە نابێت نکۆڵی لەوە بکرێت،کە لە زۆرشوێن وکاتی جیاجیادا،چ لەلایەن دەسەڵاتی ڕامیاری وچ لەلایەنی دەستڕۆیشتوویی ئایینیەوە،کۆمەڵگە دەچەوسێنرایەوە،بەلآم بەشێوەیەك لەشێوەکان،دواجار هەر ئەم ماوەیە وهەر ئەم بارودۆخە،بوو بەسەرچاوە و هۆکاری لەدایك بوونی سەردەم وقۆناغێکی تر وەهەر لەم بارەیەشەوە ((والتەربنیامین)) ووتوویەتی:((هیچ شانازییەکی شارستانی نی یە،ئەگەر لەپشتییەوە بەربەرییەت ودڕەندییەکیش نەبێت))،(٢١)بشێ ڕوویەکی ئەم ووتەیە نزیك بێت لەڕاستی،بەلآم ڕووەکەی تری تاڕادەیەك زێدەڕەوی تێدا بەدی دەکرێت،چونکی مەرج نی یە هەر ژیار وشارستانییەتێك پشت بەگەندەڵی ودڕەندەیی وستەمکاری خۆی ببەستێ و،بیکات بەدەسپێك بۆچاکسازی وگۆڕینی بارودۆخی داهاتووی،بەڵکو دەکرێت ئەم ئەزموون و وانانە:لەشارستانییەتی وکۆمەڵگاکانی ترەوە وەربگیرێن شیاوی باس لێوەکردنە،وێڕای ئەو هەموو زوڵم وستەمەی کە لەمێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا ددکرا،بەرامبەر بەکۆمەڵگەی ئەوروپا:کەچی لەکۆتایی سەدەکانی نێوەڕاوودا،گۆڕانکارییەکی گەورە وخێرا ڕووی لە کۆمەڵگای ئەورووپادا کرد.(٢٢)، وە ئەو گۆڕانکارییانەش کە ڕووی دا و هاتە گۆڕێ،خۆی لەبوارەکانی ((ڕامیاری–فیکری–ئایینی–ئابووری–ڕۆشنبیری–کۆمەلآیەتی))دەبینییەوە، وەگرنگیشە

لـەیادمان نەچـێت،کەوا هـەر ئـەم بـوار و لایەنانـە بـوو کـەوا بـۆ ماوەیـەکی دوور ودرێژ،کـەوتبووە ژێـر زوڵـم وسـتەمی کەنیـسە و دەرەبەگـەکان دا٠جـابۆ ئـەوەی باسـەکەمان ئاراسـتەی ئـەو گۆڕانکارییانــە بکــەین و،پوختەیــەك دەربارەیـان بخەینەڕوو،پێویستە سەدەی((١٢-١٣))ی زایینی وەك ونموونە بهێنینەوە،کەتێیدا ئەوکۆمەڵـــە گۆڕانکارییانـــە وایکرد،کـــە ببێتـــە ڕێخۆشـــکەری ڕێگـــای ڕێنیسانس،گرنگترینیـشیان گەشـەکردنێکی گـەورە و مـەزن بوولـە بازرگـانی،چ نێوخـۆیی وچ نێودەوڵەتی،تەنانــەت بـواری پیـشەسازیش،وەهەروەها پەیـدابوون وگـــەورەبوونی شـــارەکان، وەلـــە هەمووشـــیان گـــرنگتر دەرکـــەوتنی چینی((برجوازی))یاخود چینی ((ناوەنـد))،کـە یەکـەم جـار لـە ئیتاڵیـاوە سـەری هەڵدا،ئەمەجیا لەوەی کەوا دەوڵەتانی ئەوروپا،یاسـای ڕۆمانیـان وەرگرت،لـە بـری یاســای کەنیـــسەیی و دەرەبەگی،وەهـــەروەها نابێـــت باســـی دەرکـــەوتنی زانکۆکانیشمان لەیاد بچێت،کەوا ڕۆڵی باشیان گێـڕاوە لەودەمەدا،وەبڵاوبوونـەوەی ئەدەبی عەلمانی کە بەزمانەکانی خۆماڵی نووسرابوو هاتەگۆڕێ و،یـەکێك بـوو لـەو گۆڕانکارییەگەورانە،چـونکی زمـانی لاتینـی بۆخـۆی تاکـە زمـانی ئـەدەبی بـووە، بەدرێـژایی سـەدەناوەندییەکان،(٢٣)ئەمـە وێـڕای ئـەوەی کـەوا بـەلای هـە نـدێك مێژوونووسەوە،هەڵوەشاندنەوەی دەرەبەگایەتی،لە پێشەکی ئـەو گۆڕانکارییانـەدا دادەنێن،کـــە لـــە ئـــەوروپا و لـــە کۆتـــایی ســـەدەکانی ناوەڕاســـت ڕووی داوە،(٢٤)وەهەروەها دۆزینەوەی چاپخانەی نوێش،لە گـرنگترین دەسـتکەوتەکانی بـــــواری زانـــــستی و ڕۆشـــــنبیری ئـــــەژمار دەکرێ،کـــــە ئـــــەویش لەلایـەن((یوحنـاغوتینبورغ))ە وە،سـاڵی((١٤٤٥))زایینـی یەکـەم ئـامێری چـاپی تەختـەیی دروسـت کرا،کـە بەدەسـت ئیـشی دەکـرد وتێیـدا پیتـە جوڵێنـەرەکان بـەکاردەهات،(٢٥)جگــە لــەو هــەموگۆڕانکاری وتازەگەرییانە،بــەڵکو گــۆڕین وچاککـسازیش لـەبواری ئـایینی دا،لـەو کۆمەڵـە گۆڕانکارییانــەی ســەرەوەدا

بەدەرنەبوو،لەوانەش بزافی((یوحنا ویكلف))ی ئینگلیزی ((١٣٢٠-١٣٨٤))زایینی،وەبزوتنەوەی ((یوحنا هس))ی بوهیمی((١٣٦٩-١٤١٥)) زایینی،ئەمە بێجگە لەوەی كەوا ڕێبازگەلێك هەستان و لەدایك بوون لەنێو ئایینی مەسیحی دا گرنگترینیشیان ڕێبازی ((البروتستانی))یاخود بەرهەڵستكار،لە سەدەی (شازدە)وە لە هەستانەوەی ((مارتن لوتەر))-((١٤٨٣-١٥٤٦))ی زایینی،بڵاوبوویەوە(٢٦) لەبەر ڕۆشنایی ئەم كورتەباسەدا،دەكرێت بڵێین تەواوی ئەوگۆڕانكارییە هەمەچەشنەی كە ڕووی لەكۆمەڵگای ئەورووپی كرد،هەر لەخۆیەوە سەری هەڵنەداوە،بەڵكو هۆكارگەلێكی لەپشتەوە بووە،ڕەنگبێ گەورەترین وكاریگەرترین هۆكار،پیربوون ولاوازبوونی دەسەڵات وهێز و بازووی كەنیسە بووبێت،هاوكات تەقینەوەی ئەوبوركانەش بوو،كەوا بۆماوەی هەزارساڵ كۆمەڵگەیان لەژێرفشار وگوشاردا كۆت و پێوەندكردبوو،جائەم بوركانەش بۆیە دەقییەوە و بەدیاركەوت،چونكەچیتر حەوسەڵەی نەما و،نەیدەتوانی ئارام بگرێت هەروەها ئەوگۆڕانە هەمەچەشنەش كەهاتە گۆڕێ،كۆمەڵگا بەجارێ نەیتوانی تەباو گونجاو بێت لەگەڵیدا،چونكی بابەتگەلێك بوون،مۆركی تازەگەرییان پێوەدیاربوو،هەر لەبەرئەمەش بوو،كە كۆمەڵگا هێدی هێدی و لەسەرەخۆ هەوڵی دەدا بەو گۆڕانكاری وچاكسازی وتازەگەرییانەدا ئاشنا بێت شایانی باسە،ئەم دۆزە تازەیە جگە لەوەی كۆمەڵگای لەستەم و زوڵم و زۆرداری ڕزگاركرد،بەڵكو لەهەمان كاتدا،دانانی گەرای ڕێنیسانس وسەردەمی نوێشی تێدا دانرا،وە دەرگای واڵا كرد بۆ ئەوەی مرۆڤ بیر لە توانا وگەورەیی و داهێنانەكانی خۆی بكاتەوە،كەوا كەنیسەی مەسیحی بۆماوەی دە سەدە لێ ی قەدەغە كردبوو هەر بەم بارودۆخەیەوە،كۆمەڵگەی ئەورووپی بەرگێكی نوێ تری لەبەركردو،بەڕوحێكی پاك وبێگەردەوە،پڕ بەدەنگی خۆی گووتاری جۆش وخرۆشی بۆخزمەتی مرۆڤایەتی وئازادییەكانی دەووتەوە! لێرەش دا دیسان مێژوونووسان وبیرمەندان

ونووسەران،کۆك نین لەبارەی ئەوەی کەوا چ ساڵێك دەست نیشان بکەن بۆ کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست وسەرەتای سەردەمی ڕێنیسانس وسەردەمانی نوێ بەلای هەندێك نووسەرەوە،ساڵی((٥٠٠))ی زایینی سەرەتای سەدە ناوەندییەکانەو،ساڵی((١٣٠٠)) ی زایینیش سەرەتای سەردەمی ڕێنیسانسەو،سەرەتای سەردەمانی نوێش((١٥٠٠))ی زایینییە،(٢٧)وەبە لای هەندێکی تریشەوە بەم شێوەیە پۆلێنکراوە،پێش ساڵی((٤٧٦))ی زایینی سەردەمی کۆنەو،((٤٧٦-١٥٠٠))ی زایینی سەردەمی ناوەڕاستەو،ساڵانی((١٥٠٠-١٩١٨))یش سەردەمی نوێ یە،وەهەروەها لەساڵی(١٩١٨)بەدواوە دەست نیشان کراوە بۆماوەی هاوچەرخ(٢٨) بەلام (سیدنی دارك)لە کتێبەکەی دا،باسی لەوەکردووە کەواساڵی(١٤٥٣)ی زایینی،سەرەتای سەردەمی ڕێنیسانسەو بەمردنی شاژنی بەناو بانگ(ئیلیزابێس)یش کۆتایی پێدێت(٢٩)،جگە لەم بۆچوونانەش ،دوو بۆچوونی ترهەیە،کە زۆربەی زۆری مێژوونووسان بەلایانەوە پەسەندە، یەکەم:ساڵی(١٤٥٣)ی زایینیە،کەوا((موحەممەد))ی سەرداری عوسمانلییەکان،ئەتوانێت((کوستەنتینیا))بە هۆی ناکۆکی و شەڕی بەردەوامی نێو شاومیرە ئەوروپاییەکانەوە(فەتح)بکات(٣٠)، دووەم:ساڵی(١٤٩٢)ی زایینییە،ئەوە بووکەوا کیشوەری ئەمریکای تێدا دۆزرایەوە و،سەرەتایەکیش بووبۆ قۆناغی مێژووی نوێ،(٣١)هاوکات لەهەمان ساڵیش دابوو،کەلە سەردەمی کۆتا سەرکردەی غەرناتە((موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی سەعد ئەبو عەبدوڵلا))و،پاش یەکبوونی(فردیناندی پێنجەم)ی پاشای قشتالە و(ئیزابیلای) شاژنی ئەراغۆن،لەسەر دەستی ئەودا غەرناتە کۆتا قەڵاو پێگەی ئیسلامی لە ئەندەلووس ڕووخاو،بە ڕووخانیشی دەوڵەتی موسڵمانان لە ئەندەلووس کۆتایی هات(٣٢) جا لەم دوو ڕووداوەی سەرەوەدا،مێژوونووسان وای بۆچوونە،کەوا ئیدی جیهان بەگشتی قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست بەجێ دەهێڵێت و،ڕوو لە مێژووی نوێ

دەکـەن ڕەنگبـێ مێژوونووسـان و بیرمەنـدان و نووسـەران،لەم بۆچـوونەیاندا تارادەیـەك ڕاسـتییان پێکابێت،چونکی زێدەڕۆیی ناکەین،ئەگـەر بڵـێین بـەم دوو ڕووداوەی سەرەوەدا،نەك کاریگەری وگۆڕانی تەنها بەسـەر ئـەوروپادا هێنا،بـەڵکو دەرئـەنجام و دەرهاوێـشتە و ڕەهەندەکانی،هـەمووجیهانی تەنییەوە،هـەر لەبـەر ئەمەش بوو،کەوا لەپاش ئەم دوو ڕووداوەدا،ئیدی جیهان بەرەوئاراستە وئاقـارێکی ترهەنگاووی دەنا

تەوەرەی یەکەم:زاراوە و چەمکی ڕێنیسانس:-

لـەم تـەوەرەی لێکۆڵینەوەکـەمان دا،تێیـدا هـەوڵ دەدەیـن ڕێنیـسانس بناسێنین،لە ڕووی چەمك وزاراوە وپێناسـەو،دیاریکردن وهەوڵدان بـۆ دۆزینـەوەی ماوەومەودای تەمەنی زاراوەی وچەمکی(ڕێنیـسانس)،یەکێکـە لـەو زاراوانـەی کـەوا زیاتر لە بەرهەم ونووسین ولێکۆڵینـەوە ئەدەبییـەکان دا بەرچـاودەکەوێت،ڕەنگبێ ئەمـەش بگەڕێتـەوە بۆئەوەی،کـەوا پەیوەنـدی زیـاتری بـەبواری ئـەدەب وهونەرەوەهـەبێت، واتـا زاراوەکـە هێنـدە لەبەرهەمـە وێژەییەکانـدا دەبینرێت،ئەوەنـدە لـەبوارەکانی تـردا بەرچەسـتەنابێت بـەڵام جگـە لەمـەش لەچـەندین بەرهـەمی فەیلەسـووفان وبیرمەنـدان ومێژوونووسـانیش دەبینرێـت وبەکارهاتووە،هەرچۆنێك بێت ئێمە مەبەستمانە لەڕووی مێژووییەوە تیشك بخەینە سـەری و،بـەپوختی لێکۆڵینـەوە ولێکدانـەوە وشـیکردنەوەی بۆبکەین،کەئەمـەش گوزارشت لـەوە دەکات باس وخواسـەکان لەڕوانگـەی مێـژووەوە دەبێـت جابۆیـە گرنگە بـزانین ئایـە ئـەم زاراوەیـە لـە بنەڕەتـدا سـەر بـە چ زمانێکەو،لەفەرهـەنگ وکلتووروومێـژووی مرۆڤایـەتی دا چـۆن باسـی لێوەکراوە؟ئـەبێ واتاومانـای چ

ببەخشێت؟

((RENAISSANCE ))،ووشـەیەکی فەڕەنـسی یەو،لـە زمـانی عـەرەبی دا چـەندین ووشـەی جیاجیـای بۆدانراوە،کـە گوایـە ئـەم ووشـانە،واتای ڕێنیـسانس دەگەیەنێت،لەوانــەش (البحــث)،(الاحیــاء)،(المیلادالجدیــد)،(٣٣)(النهــضة)، (الانبعاپ)،(٣٤)بەهەمان شێوەش لەزمانی شـیرینی کـوردیش دا،ووشـەگەلێکی بـۆ داتاشراوە،کەبشیَ هەندیك لەو ووشانەش بەتەواوی گوزارشت لەواتـەی ڕێنیـسانس نەکـەن!بـۆ نموونــە لــە هەنــدێك شــوێن دا ووشــەی(بێداکردنــەوە)،(هەڵــسان)، (هاتنــەدەرەوە)،(زیندووکردنــەوە)،(بوژاندنــەوە)ی بۆدانراوە،جگــە لەمانــەش لەهەندیَ جێگای تردا،ووشـەی (ڕاپـەڕین)،(لـە دایـك بوونـەوەی نـویَ)،دانـراوە کـە واتـای ڕێنیـسانس دەگەیـەنێت بـەزمانی کـوردی،(٣٥) ئەگـەر سـەرەنج بـدەین چ لەزمانی کوردی وچ لە زمانی عەرەبی دا،جگە لـەم ووشانە،چـەندین ووشـەو واتـای جیاجیـا دەبیـنین لـەنێو فەرهەنگەکاندا،کـە هــەر هــەمووی بـۆ واتـا ومەبەسـتی ڕێنیسانس دانراوە،بەڵام ئەگەر بەووردی تێبینی بکەین لەسەرچـاوە عەرەبییـەکان ولەنووسینی بیرمەند ونووسەرانی عەرەبیشدا،زیاتر ووشەی(النهضة) بـەکاردەهێنن بۆڕێنیــسانس،وەهەروەها لــە زوبــانی کــوردی خۆشمــان بەشـێوەیەکی گــشتی وبـەربلاَوو زۆرجـاران ووشـەی (ڕاپـەڕین) یـاخود (بوژانـەوە)بـەکار هـاتووە بۆئـەم مەبەستە ئێمە وای بەباش دەزانین کـەوا بەرامبـەر بـە ووشـەی ڕێنیساس،ووشەی (بوژانەوە) یاخود هەر (ڕێنیساس) دابنرێت،بەتایبەتی لەم سـەردەمەدا کە ئەگـەر ئاوڕێك لە زمان وفەرهەنگی ئێستای زمانی کوردی،بدەینـەوە ئـەوە بۆمـان بـەدیار دەکەوێت کەوا ووشەگەلێکی بیانی تێکـەڵ بەفەرهـەنگ وزوبـانی کـوردی بـووە،وە ئەگەر تەماشـای پـەرتووکەکـەی بـەڕێز(پ.د.کـەمال مەزهـەر ئەحمـەد)یـش بکـەین بەعەرەبییەکـەی(النهـضة) یە،وەلەلایـەن ڕێـزدار(فوئـاد مەجیـد میـسری)بیـەوە، وەرگێـڕدراوە وبـووە بـە(ڕێنیـسانس)، دواجـار هــەر خـودی ووشـەی ڕێنیـسانس

قەشەنگ وپڕبەپێستی سەردەمەکەیە،وەهەر بۆخۆشی بەباشی دەتوانێ گوزارشت لەو ماوەیە دا بکات هەندێك لە مێژوونووسان باسیان لەوەکردووە،کەوا ئەم زاراوەیە بۆ یەکەم جار لەلایەن پیاوانی ڕێنیسانسەوە بەکار هاتووە،(٣٦)وەهەروەها زۆرێك لەنووسەرانی فەڕەنسا،ئەم زاراوەیەیان لە نێو بەرهەمەکانی خۆیان دابەکارهێناوە،بۆنموونە((میشیلیە-MICHEIET))،یەکێك لەبەرهەمەکانی بەنێوی(فەڕەنسا لە سەدەی شازدەوە بۆسەردەمی ڕێنیسانس-١٨٥٥))ی زایینی بووە،کەتێیدا وێنەیەکی پوختی ئەم دەمەی پێشکەش کردووە، (٣٧)وەهەروەها (ول دیورانت)یش لەپەرتووکە مێژوویەکەی خۆی دا،کەدەیەوێت زاراوەی ڕێنیسانس وبەکارهێنانی ڕوون بکاتەوە،لەپەراوێزدا ئاماژەی بەئینسکلوپیدیایەکی فەڕەنسی دەکات،کەوا لەنێوان سالآنی(١٧٥١-١٧٧٢)ی زایینی دەرچووە،کەبۆ یەکەمین جار بەشێوەیەکی براوەو ڕوون زاراوەی((RENAISSANCE))ی بەکارهێناوە (٣٨) وەلێ لەهەندێك بەرهەم ولێکۆڵینەوەی ئەدەبی دا،بەکارهێنانی ئەم ئیدۆمە،دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی کە،کە گوایە بۆ یەکەم جار لەلایەن ڕەخنەگرێکی هونەری بەنێوی(جورج فاساری) بەکارهێنراوە،ئەویش لە بەرهەمێکی دا بەناوی(سیر مشاهیر المهندسین والرسامین والنقاشین الایگالیین منڒ سیمابو الی یومنا هڒا)،ئەم بەرهەمەش چاپی یەکەمی سالّی(١٥٥٠)ی زایینی بووە(٣٩) لە کۆی ئەم هەموو باس وخواسانەوە،بۆمان بەدیار دەکەوێت،کەوا زاراوەی ڕێنیسانس هەر لەسەردەمی ڕێنیسانس ودواتر بەکار هاتووە،بەلآم ناتوانین بلّێین بەلگەیەکمان بەدەستەوەیە لەم بارەیەوە،کەبریتی بێت لەبەرهەمی نووسەرێك یاخود هونەرمەندێك یان ئەدیبێك ومێژوونووسێك هەبێت و،زاراوەی نێوبراووی تێدا بەکار هێنرابێت،جابۆیە دەبێت بگووترێت کۆنترین بەرهەم وتۆمارێك هەبێت و،تێیدا زاراوەی ڕێنیسانسی بەکارهاتبێت،بەپێ ی ئەوسەرچاوانە،سەدەی شازدەیە وەلێ سەیر لەوەدایە کەوا

چەندین نووسەر و بیرمەند وئەدیب وفەیلەسووف ومێژوونووسی سەردەمی ڕێنیسانسمان هەیە،کەوا پێش ئەم ماوەیەش کەوتن و،نووسین وبەرهەمیشیان بلاٌبۆتەوە،لەوانەش ڕابەرانی سەردەمی ڕێنیسانس،وەك و(دانتی–بترارك–بۆکاشیۆ)،لەهەمان کاتیش دەبێت باس ولێکۆلینەوەکانیان لەم بارەیەوە بووبێت! ! !بەلاٌم دیارە زاراوەی نێوبراویان بەکار نەهێناوە،هەتاوەك وسەدەی شازدە،نەکەوتۆتە نێوفەرهەنگ وکلتووری کۆمەڵگاوە پاش تێپەڕبوونی ئەم ماوەیە،ئیدی زاراوەی ڕێنیسانس کەوتە نێو بەرهەم ونووسینەجیاجیاکان، وەلەهەمان کاتدا هەوڵ درا پێناسەوشیکردنەوە ولێکدانەوەی جیاجیا بۆزاراوەی نێوبراووبکرێت بۆنموونە بەلای هەندێك نووسەرەوە،ڕێنیسانس بەواتا بەرتەسکەکەی،مانای ووشەی بزوتنەوەی هەڵسان وگەڕانی کلتووری کۆن، یاخود زیندووکردنەوەی ئەوکلتوورە دەگەیەنێت،واتە لەدایك بوونەوەی نوێ وتازە دێت(٤٠)،یاخود واتای جارێکی تر دۆزینەوە وپەردە لەسەر لادانی وون بوون و،لە بیر چووەوەی کولتووری ئەنتیك دەگەیەنێت،کە لەسەدەی (چواردە)هەم لە باشووری ئیتاڵیاو پاشان لەسەرانسەری ئەورووپا سەری هەڵداوە (٤١)ئەگەر ئاوڕێك لە مێژووی ئەدەبیاتی ئەورووپا بدەینەوە،بۆمان بەدیار دەکەوێت کەوا ڕێنیسانس بووە بەجێگەی بایەخ و ئەندێشەی زۆر لە بەرهەمە ئەدەبییەکانیش،بۆنموونە لە((جیهانی سۆفیا)) دا،کە زۆر بەباشی ودروستی باس لەوسەردەمە کراوە،ئەگەرچی بەشێوەی ئەدەبیش نووسراوە(٤٢) وێڕای ئەمانەش،زاراوەی نێوبراوو،بەتێپەڕبوونی کات،ئەوەندە گەشەی کرد وبووە جێگەی بایەخ، تا ئەو ڕادەیەی هەنگاووی بەرەو پێشەوەناو،هەروەها کەوتە نێو فەرهەنگەوە ئەوەتا لە ((فەرهەنگی کۆلینز))–(١٩٧٩)–((COLLINSENGLISHPICTIONARY))،باسی لێوەکراوە وپێناسەیەکی ساناشی بۆ داڕێژراوە،کە ووتوویەتی بریتی یە لە

ژیاندنەوە((REVIVAL))یاخود زیندووبوونەوە((REBIRTH))(٤٣)،یان بەلای هەندێك کەسەوە،وا خراوەتە ڕوو، کەوا هەمیشەو بەردەوام بۆ وەسف کردنی بزوتنەوەی ڕۆشنبیری بەکاردێت،(٤٤) لەمەوە ئەوە دەخوێندرێتەوە،کەوا ووشە وزاراوە وچەمکی ڕێنیسانس،پێش سەردەمی(ڕێنیسانس)بوونی نەبووە وبەکار نەهاتووە،بەلاّم لەگەڵ هاتنی سەردەمەکە ودەرکەوتنی لەمێژووی ئەورووپادا،ئیدی بەرەبەرە کەوتە سەر زاران ولەنێو بەرهەمی ڕۆشنبیران وبیرمەندان وئەدیبان وفەیلەسووفان بەکاردەهێنرا،ئەم زاراوەیەش ڕاستە لەبنەڕەت دا فەڕەنسی یە،بەلاّم زیاتر مۆرکی ئیتالّی وەرگرتووە،چونکی سەردەم وچاخی ڕێنیسانس بۆ یەکەم جار لە ئیتالّیاوە سەری وەدەرناو،لە زۆرشوێن وجێگاش کەباس لەسەردەمی نێوبراوو دەکرێت،زاراوەی (ڕێنیسانسی ئیتالّی)بەکار دەهێنرێت،ئەمەش وامان بۆ دەردەخات کەوا ئیتالّیا لانکەی ئەوسەردەمەیە وەهەرخودی زاراوەکەش مانای(زیندووکردنەوە)،(لەدایك بوونەوەی نوێ)،(بوژاندنەوە)یاخود هەر زاراوەیەکی تر دێ،کە هەرهەموویان گوزارشت لە تازەگەری وگۆڕانخوازی دەکەن،ئەویش بەدوو هەوڵ وکۆشش وکارو کردار ئەنجام درا،یەکەمیان:گەڕانەوەو زیندوکردنەوەی کلتوورو مێژووی ڕابردووی خۆیان بوو،بەلاّم نەك وەك وخۆی،بەلّکو بەشێوەیەك بەکاریان هێنا،کە لەگەڵ ڕۆحی سەردەم وکۆمەلّگادا بگونجێت و،لەهەمان کات دا وەك وئامرازێکی فریادڕەس،پەنایان بۆ برد بۆ ڕزگاربوونیان،لەو دۆخەی کەتێیدابوون دووەم:هەر خودی ئەو ووشە و واتایەش،ماناو واتای کاڵ بوونەوەو ئاوابوونی سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست دەگەیەنێت،چونکی کەنیسەو پیاوەکانی لەوماوە دوورو درێژەدا،مرۆڤیان لەکاری ژێری وهزری خستبوو،جابۆیە هەموئەم واتاو شیکردنەوانە،دەرگایان بۆ زەمەن ودونیایەکی تازەتر والآ دەکرد،وەلەهەمان کات دا زەمینەیەکی لەباریش بوو،نەك بەتەنها بۆئەورووپا،بەلّکو کاریگەری بەسەرجیهانیش دا،دواتر بەدیار دەکەوێت.

تەوەرەی دووەم:ناساندنی سەردەمی ڕێنیسانسی ئەورووپی:-

لەدەروازەی باسەکەماندا،چاوێکی زۆرخێرامان بەسەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا گێڕا،گرنگی ئەم باسەش لەوەدایە کەوا سەردەمی ڕێنیسانس لە هەناوو مندالّدانی ئەو ماوەیەوە لەدایك بووەو هاتۆتە دەرێ،وەهەر لەو دۆز و بارودۆخەدا سەری وەدەرناوە کەواتە بێ گەڕانەوە بۆ سەردەمی سەدەکانی نێوبراوو،تێگەیشتن وناساندنی ڕێنیسانس ئالّۆزە،لێرەدا پێویست وگرنگە بزانین ئاخۆ لە پاش ئەو سەردەمە دووور ودرێژەدا چ سەردەم وقۆناغێك هاتەکایەوە،وەئەو ئامرازانە چ بوون کەوا توانی کۆمەلّگا قووتار بکات؟ ئەبێ مێژوونووسان وڕۆشنبیران بەگشتی چۆن چۆنی تەماشای سەردەمی ڕێنیسانسیان کردبێت وچلۆن پێناسەیان کردبێت.

هەندێك مێژوونووس،لای وایە سەردەمی ڕێنیسانس بەواتا گشتگیرییەکەی،مانای ڕزگارکردنی ئەقلّی مرۆڤایەتی دەگەیەنێت لە کۆت وپێوەندەکانی سەدە ناوەندییەکان و،هەست کردنی تاکە بە ئازادی لەو گوزارشتانەی کەهەستی پێدەکات لە هەلّچوون وهەستەکانی دا،(٤٥)وەهەروەها نوێبوونەوەو بوژاندنەوەی تەواوی بوارە مرۆییەکانی وەك و(ئەدەب-فەلسەفە-ئایین-بیناسازی-وێنەکێشان-هەلّکۆلّین-زانست-ڕامیاری-یاسا)دەگرێتەوە،(٤٦)یاخود بە سەردەمی پێشکەوتنی کۆمەلاّیەتی وهزری و ئەدەبی باسی لێوەکراوە لە ئەورووپای سەدەکانی(١٥-١٦)زایینییەوە،(٤٧)وەلە هەندێك جێگەی تردا وا باسی لێوەکراوە،کە فەلسەفەی ڕێنیسانس،مرۆڤی بە کائین و بوونەوەرێکی سەربەخۆی هزرمەند(عەقلاّنی)پێناسە دەکات،کە دەتوانێ وا لەمرۆڤ بکاتن،کەتوانای ئەوەی هەبێت جیهان بگۆڕێت وکاربکاتە سەر دەورو بەریشی(٤٨)،بەلاّم مێژوونووسێکی وەك و(بورکهارد)-(BURKHARDT)ی سویسری،بەشێوەیەکی تربەاس

وپێناسەی سەردەمی نێوبراوومان بۆ دەكات،بورکهارد دەڵێت:"ئەو ماوەیەیە كەوا مرۆڤ خودی خۆی تێدا دۆزییەوە،وەتێڕوانینی نویێ ی بۆ ژیان و،كەونی تێدا ناسی،لە پاڵ گەڕانی بۆ جیهانی كۆندا،بۆ ئەو شارستانییەت وئەدەب وهونەرانەی كەتێیدایە"(٤٩)،ئەگەر سەرەنج بدەین لەم باسانەوە بۆمان بەدیار دەكەوێت،كەوا پێش سەردەمی ڕێنیسانس،مرۆڤ بەشێوەیەكی گشتی وەك و بوونەوەرێكی سەر ئەم زەوییە،لە تەواوی بوارەكانی ژیانی دا فریودرابوو چونكی گرنگترین هۆكارو ئەندامی لاشەیان لەكارخستبوو،كە ئەویش ئەقڵ وهزرو بیركردنەوەی بوو! بەڕاستی پیاوانی كەنیسەی مەسیحی لە سەدەكانی ناوەڕاستی ئەورووپادا،لە هەموو ئان وساتێك دا بانگەشەی هەژارییان بۆ مرۆڤی ئەو سەردەمە دەكرد لەم ژیانەیاندا،وە هەمیشە و بەردەوام بانگی ملكەچی وبچووكی وزەلیلییان دەخوێندە گوێیان،كە دەبێ ئەمان خۆیان بەگچكە بزانن ومەزنی وگەورەیش بلكێنن بە بالآی پیاوانی ئایینییەوە ئەمە جیا لەوەی كەوا هەموو كات ولە زۆربەی شوێن وجێگاكاندا،مرۆڤە ئاساییەكانیان تۆقاند بوو،بە وەی كەوا خوداوەند لە ڕۆژی دوایی دا سزایان دەدات،ئەمەشیان بەدوو قازانج دەشكایەوە بۆ كەنیسە،لە لایەك مرۆڤەكان دەترسان وهیچ توانای بیردنەوەیان نەدەما،لە لایەكی تریشەوە كەنیسە و پیاوەكانی خۆیان بە ناوەندێك دەزانی،كە گوایە دەتوانن مرۆڤ لەگەڵ خوداوەندا ئاشت بكەنەوەو، لە تەواوی گوناهەكانیان خۆش بێت،كە ئەویش بە پارەوپوول و دیاری ئەنجام دەدرا ! ئەمە لە كاتێك دا بوو كە خۆیان سەرپشك بوون لە هەموو گووتارو كردارێك كە ئارەزوویان كردبایە هەر لەبەر ئەمەش دوور ناكەوینەوە لەڕاستی ئەگەر بڵێین مرۆڤ لەو چەرخەدا لەكار خرابوو،یاخود بەواتایەكی تر،مرۆڤی سەدەكانی ناوەڕاست تەواو جیاوازە لەگەڵ مرۆڤی سەردەمی ڕێنیسانس وسەردەمانی نوێ بەتایبەتی لە ئەورووپادا، هۆكارەكەشی خۆڕسك نەبووە،بەڵكو دەسەڵاتە زۆردار و ستەمكارەكەی كەنیسە وایلێكردووە

هەر لەبەر ئەم بارودۆخە ناهەموارەش دا،هەندێك نووسەر لایان وایە،ئەوروپا لەو ماوەیەدا،سەر لەنوێ لەدایك بوویەوە،بەلآم ئەم لەدایك بوونە،منداڵێکی بچووك نەبوو،بەڵکو عیملاقێی مەزن بوو،بۆ ئەوەش راپەڕی هەتاوەك و رەشەبای شۆڕش وگۆڕان لەهەموو لایەك دا هەڵبکات (٥٠)شیاوی باسە،نووسەران ومێژوونووسان وبیرمەندان،پێناسە و باسەکانیان لەمەڕ ڕێنیسانس داجیاوازە بۆ نموونە ئەگەر تەماشای پەرتووکەکەی (د.محمدمحمدصالح)بکەین وبەووردی بڕوانینە ماوەی ڕێنیسانس،بەڕاستی تووشی بۆچوونێکی ترمان دەکات نێوبراوو کاتێك لەبارەی زاراوەی نێوبراوەوە قسان دەکات وئەدوێ،وا باسی دەکات کەوا (ڕاپەڕین-بوژاندنەوەی ئەوروپی)،ئەو گۆڕانکارییە رامیاری و ئابووری و کۆمەلآیەتی وهزرییانەیە،کەوا لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست دا بەسەر ئەوروپادا هاتووە،ماوەکەشی لە سەدەی یازدەوە بۆ سەدەی شازدە دەست نیشان کردووە.پاشان کە دێتە سەر باسکردنی بزوتنەوەی دەپەڕین وهاتنەدەرەوە و بیدارکردنەوە یاخود زیندووکردنەوەی شارستانییەتی کلاسیکی یۆنانی و ڕۆمانی کۆن کە بەڕێنیسانس ناودەبرێت،دەڵێت بێگومان لە ئیتاڵیاوە دەستپێکردووە،وە لەسەر وێژەو هونەرو تێڕوانین بۆ مرۆڤ بووە،وەئەو گۆڕانکارییانەی کەوا لەم بوارانەدا ڕوویان داوە،ماوەکەشی سەدەی چواردەو پازدەو شازدەی زایینی بووە،وە لەهەمان کاتدا باسی لەوەش کردووە کەوا ئەم سەدانە،سەدەکانی گواستنەوەیە،لە سەدە ناوەندییەکانەوە بۆسەردەمانی نوێ(٥١) بەڕاستی ئەم بۆچوونەی نێووبراوو لەگەڵ بۆچوونەکانی تر،جیاوازییەکی تێدابەدی دەکرێت،چونکی زۆربەی زۆری مێژوونووسان ونووسەران وبیرمەندان،لایان وایە لەکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپا و بەتایبەتی لەئیتاڵیاوە،کۆمەڵێك گۆڕانکاری هاتۆتەئاراوە،کە ئەویش زیاتر لە سەدەی(١٥-١٦)ی زایینی بووە،وەهەروەها گەڕانەوەش بووە بۆ کلتووری کۆن،بە مەبەستی

ڕزگاربوون لەسەدە ناوەندییەکان،وەئەم بزوتنەوەیەش بە ڕێنیسانس دەناسرێت.
لەکاتێك دا باس لەسەردەمی ڕێنیسانس دەکرێت وبەبزوتنەوەی ژیاندنەوە وسەرلەنوێ زیندووبوونەوە دەناسرێت(٥٢)،پێویستە پەلکێش بکرێین بۆ ئەو پرسیارەی،کە داخۆ زیندووکردنەوە و ژیاندنەوەی چی دەگەیەنێت؟ لەم سەردەمەدا مرۆڤ بە مەبەستی سەر لەنوێ لە دایکبوونەوە، دەگەڕێتەوە بۆسەرچاوەکانی سەردەمی کۆن،(٥٣)چونکی بزوتنەوەی نێوبراوو،لەسەر بنچینەی گەڕانەوە بۆ ڕیشە شارستانییەکانی ئەوروپای کۆن دامەزراوە،بەلاّم بەشێوەیەکی تازەو داهێنەرانەبوو،(٥٤)گەڕانەوەش بۆ کولتووری پێش بلاّوبوونەوەی ئایینی مەسیحی وڕاپەڕین بووە،وەهەروەها دژی ئەو سەرخانەی کۆمەڵی مەسیحییەت(ئەدەب—فەلسەفە—لاهووت—هونەر—زانست—هزری کۆمەلاّیەتی—ئابووری—ڕامیاری)دایهێناوە (٥٥) هەندێك لە مێژونووسان،ماوەی دەرکەوتنی بزافی زیندووکردنەوەی زانستەکان،لە کۆتایی سالاّنی(١٣٠٠—١٥٠٠)دەست نیشان کردووە،وەباسیان لەوەش کردووە کەوا ڕۆشنبیران لە شارەکاندا،گرنگییان بەپشکنین وگەڕان داوە،لەبارەی شوێنەوار وپاشماوەی ئەدەبییە یۆنانی و ڕۆمانییە کۆنەکانەوە(٥٦)،وەلەهەمان کات داپشتیان لە ڕۆشنبیرەکانی سەدەکانی ناوەڕاست وپێشوویشی کردو،ڕوویان کردە فەلسەفە و ئەدەبی یۆنان و ڕۆشنبیر و یاسای ڕۆمانەوە.(٥٧)شیاوی گووتنە،دەرکەوتووترین بەلّکو لەیەکەمین دیاردەکانی سەردەمی بێدارکردنەوە و ڕاپەڕین وهەلّسانەوە،کرداری گەڕانەوە بووە بۆ کلتووری کۆن . ئەویش بۆ لێکۆلّینەوە و ناساندنی ئەو کەنز و زانست ومەعریفانەی کەتێیدایە(٥٨) لەمەوە ئەوە دەخوێندرێتەوە،کەوا لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست وسەرەتاکانی سەردەمی ڕێنیسانس،مرۆڤەکان چیتر نەیانتوانی بەرگەی ئەو هەموو دواکەوتوویییە بگرن،جابۆیە ڕۆشنبیران لەهەولّ وتەقەلاّی فاکتەرێك بوون بۆ خۆدەربازکردن لەم

دۆخە نائارام وپشێوییە،کە هیچ بەهایەکی مرۆیی تێدا بەدی نەدەکرا!بۆ ئەوەی کۆمەڵگا ئازاد بکەن لە دەسەڵات وهەژموونی کەنیسەو پیاوەکانی هەر بۆ ئەم مەبەستەش،پەنایان بردە بەرکلتوور و مێژووی پڕ لەشانازی وسەروەری یۆنان و ڕۆمانی کۆن،بۆ ئەوەی زیندوویبکەنەوەو،دووبارە ژیان بکەن بەبەری،یاخود جارێکی ترئەو کلتوورە لەدایك بێتەوە،بەڵام لەشوێن وجێگایەکی ترو لە دۆزو کاتێکی جیاوازتر! ئەگەرچی ئەم کردارە لاسیکردنەوەیە،وە لەهەمان کاتدا شانازییە بەپێشینان وباوباپیرانەوە،کە لەلایەکی تریشەوە ئەوەی لیدەکەوێتەوە کەوا مرۆڤ هێندە پشت ومتمانەی بەخۆی نەبێت،وەچاوەڕوانی شتی ئامادەکراو بکات بۆ ڕزگاربوونی لەتەنگانە و ناخۆشی ونەهامەتییەکانی ژیان بەڵام نابێت لەیادمان بچێت،لەگەڵ بوونی هەموو ئەمانەش،ڕۆشنبیران وبیرمەندان ونووسەران وهونەرمەندان،توانییان داهێنان وتازەگەری وچاکسازی ودۆزینەوەی نوێ بهێننەوەکایەوە،ئەمەش وایکرد مۆرکێکی نوێتر وجیاوازتر وەرگرێ ئەگەر چاوێك بەسەردەمانی کۆن وپێش سەردەمی ڕێنیسانس بگێڕین،نموونەی لەم جۆرەمان دەستگیر دەبێت بۆ نموونە ئەو کاتەی کە(پیرێکلیسە)بچکۆلە لەگەڵ(زینۆفۆن)دەکەوێتە گفتوگۆ،دەربارەی بارودۆخی ئەوسای خۆیان،ئەپرسێ:"ئەی چار چییە و پێویستە چی بکەین،بۆ ئەوەی باشتربین وپالەوانێتی پێشوومان دەست بکەوێتەوە"؟ (زینۆفۆن) زیرەکانە لەزمانی سوقراتەوە بەدڵسۆزییەکی داپۆشراوەوە وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: "ئەگەر یاساو هەڵسوکەوتی باپیران وپێشینانیان بیربکەوێتەوەو پەیڕەوی بکەن،وەك وئەوانیان لێ دێتەوەو بەرەوچاکی ئەڕۆن"(٥٩) ڕەنگبێت لەهەندێك جاردا،مەبەست لەو باس وبیرکردنەوەیە،ئەوە بووبێت کەوا باوباپیرانییان ڕێگایەکیان گرتۆتەبەر،کەوا ئەو ڕێگاوڕێبازە،بەرەو ئاراستەیەکی باشترو دروستری بردوون،هەر بۆیە زۆرجاران بیریان لەپێشینان کردۆتەوەو،لەهەندێ شوێن وکاتی جیاجیادا وەك و فریادڕەسێك

تەماشایان کردووە،بەڵام هەرچۆنێك لێکبدرێتەوە،ناتوانین خۆمان لەئاست ئەوەدا بێدەنگ بکەین،کەوا ئەگەر مرۆڤ هەمیشە وابیربکاتەوە،ئەوە خۆی لەیاد دەچێت وهەمیشە پەنا بۆکەسانی تردەبات وەهەر لەو پرسیارو وەڵامەش دا،دەتوانین بڵێین تارادەیەك زێدەرۆی پێوەدیارە،چونکە هەرکات وشوێن وجێگایەك،خاوەن سیفەت وسروشتی تایبەتی خۆیەتی،وەمەرج نی یە هەموو کات ئەو ڕووداوانە لەهەمان شوێندا دووبارە بێتەوە!هەرچۆنێك بێت هەموو ئەمانە لە نرخ وبەهای سەردەمی ڕێنیسانس کەم ناکاتەوە چونکی هەندێك لە فەیلەسووف ومێژوونووس وایدەبینن،کەوا مرۆڤایەتی پێشتر،ڕووداوێکی وەها گرنگ وبەنرخی بەخۆیەوە نەناسیوە(٦٠) ڕەنگبێ ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ کارکردن وئاراستەی ئیشکردنی ڕێنیسانس،کەوا بەدوو ئاراستەدا دەجولاَ:ئاراستەیەکیان بەرەو ڕابردوو دەگەڕایەوەو تێیدا هەوڵدانێکی بێوێنە هەبوو بۆ ژیاندنەوەی کولتووری یۆنانی وهزری مرۆڤدۆستی ناو ئەوکولتوورە،لەهەمان کاتیش دا ئەم گەڕانەوەیە بۆ هزری لاهووتی سەدەکانی ناوەڕاست بوو،بە مەبەستی ڕەخنەگرتن و ڕەتکردنەوەی دوایین پاشماوەکانی کاریگەری کەنیسە لەسەر هزری فەلسەفی...، ئاراستەی دووەمیان بزاوتی ڕێنیسانس ئاراستەیەکی ئایندەخوازانە بوو،کە تێیدا وێنەی دونیایەکی نوێ دەکرا؛کە مرۆڤ تیایدا بالاَ دەست بێ(٦١).

## تەوەرەی سێهەم:ڕێنیسانس لەنێوان سەردەمانی کۆن ونوێ ی ئەورووپادا

بۆئەوەی بزانین ڕێنیسانس شوێن وپێگەی دەکەوێتە کوێ وە لەمێژووی ئەورووپا،پێویستە چاوێکی زۆر خێرا بە قۆناغەکانی مێژووی ئەورووپادا بخشێنین و،بزانین قۆناغەکانی چۆن چۆنی دابەش کراوە هەندێك لە مێژوونووسان،وای بۆدەچن،کەوا لە سەردەمی ڕێنیسانس دا،بۆ یەکەمین جار،مێژوویان بەپێ ی قۆناغ دابەش کردووە،(٦٢) وە ئەم دابەشکارییە،لە مێژوونووسێکەوە بۆ مێژوونووسێکی تر دەگۆڕێت چونکی هەندێکان دابەشیان کردووەتە سەر،سێ قۆناغی مێژوویی،ئەویش مێژووی(کۆن–ناوەڕاست–نوێ)یە،کەوا دوابەدوای مێژووی هاوچەرخ دێت(٦٣)،بەلأم بەلای هەندێکی ترەوە،ئەو دابەشکردنەی کە بۆمێژووی ئەورووپا دەکرێت وزۆر بەربلأوە لەئێستاماندا،ئەوەیە کەوا دابەشبکرێت بۆ چوار قۆناغی مێژوویی،ئەویش(مێژووی کۆن)،(مێژووی ناوەڕاست)،(مێژووی نوێ)،دواتریش (مێژوو یاخود سەردەمی هاوچەرخ) ە (٦٤)،لەمەوە مێژووی هاوچەرخ خۆی بە تەنها دەبێت بەچاخ وسەردەمێکی تری مێژوو وەباس لەوەش کراوە،کە ئەم دابشکردنە لە سەدەی هەژدەوە،بە تەواوەتی جێگەی خۆی گرتۆتەوە(٦٥) لەمەشەوە بۆمان بە دیاردەکەوێت کەوا مێژووی ئەورووپاش وەك وتەواوی کۆمەلگا مرۆییەکانی تری ڕووی زەوی،مێژووەکەی لە سێ یان چوار قۆناغی سەرەکی پێك دێت،کە هەر قۆناغێك لەو قۆناغانەدا،خاوەن سیماو سیفەتی تایبەتی خۆیەتی وەلە دیاریکردن ودەستنیشان کردنی ماوەی هەریەك لەو قۆناغە مێژووییانەدا،مێژوونووسان ونووسەران وڕۆشنبیران،بۆچوون ودیدی جیاوازیان هەیە لەم بارەیەوە،بەلأم سەرەڕای ئەمانەش زۆربەیان یاخود هەر هەموویان لەبۆچوونێك یان لەدوو بۆچوون کۆکن بۆ نموونە سەردەمانی کۆن لە

مێـژووی ئەوروپادا،هـەر لـە بەرەبـەیانی دەرکـەوتنی یەکـەمین مرۆڤـەوە دەسـت پێـدەکات،(٦٦)هـەتاوەك وسـاڵی(٤٧٦)ی زایینی،واتـە ڕووخـانی ئیمپراتۆرییـەتی ڕۆمـانی لـەڕۆژئاوادا(٦٧)،لەمەشـەوە ئیـدی ڕۆژئـاوا بـەبێ ئیمپراتـۆر دەمێنێتـەوە بەدرێـژایی مـاوەی نێـوان سـاڵانی(٤٧٦–٨٠٠)ی زایینـی،(٦٨)ئـەم ڕووداوە بـەلای هەموومێژوونووسانەوە،باشـترو گونجـاوترە بـۆ سـەرەتای مێـژووی سـەدەکانی ناوەڕاسـت،(٦٩)واتـە مێـژووی سـەدەکانی ناوەڕاسـت بـەلای زۆربـەی زۆری مێژوونووسـانەوە،لەکۆنەوە درێـژە دەکێـشێت هـەتاوەك و سـاڵی(٤٧٦)ی زایینی.کەواتـە لـەم سـاڵە بـەدواوە ئیـدی مێـژووی سـەدەکانی ناوەڕاست دەست پێدەکات،بەڵام بۆ کۆتایی سەدەکانی نێوبراوو وسەرەتاکانی سەردەمانی نوێ دوو بۆچوون هەیە یەکەمیان سـاڵی(١٤٥٣)زایینیە،کـەوا (موحەممـەد)ی فاتح،سـوڵتانی حەوتـەمی عوسمانلییـەکان تـوانی قوسـتەنتینیە فـەتح بکـات(٧٠)، دووەمیـان دۆزینـەوەی کیـشوەری ئەمریکایـە لەسـاڵی(١٤٩٢)ی زایینی،کـە هەنـدێك لەمێژوونووسـان وایـدەبینن کـە نیـشانەیەکی ڕوونـە بـۆ کۆتـایی مێـژووی ناوەڕاست(٧١) هەرچی مێژووی نوێشە،لەم ساڵانەوە دەست پێدەکات،هـەتاوەك وساڵی(١٩١٨) چونکی لەمەشیان دا مێژوونووسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە کۆتایی جـەنگی یەکـەمی جیهـانی(١٩١٨)ی زایینـی بەسـنووڕێکی جیاکـەرەوەی دادەنێن لەنێوان مێژووی نوێ وهاوچەرخ دا وەبە شێوەیەکی گشتی وبەربڵاو،لەلای زۆربـەی زۆری مێژوونووسان ولەزۆر سەرچاوە دا،مێژووی ئەوروپا بەم شێوە دابـەش کـراوە (مێـژووی کـۆن)،هەرلـە کۆنـەوە دەسـت پێـدەکات هـەتاوەك و سـاڵی(٤٧٦)ی زایینـی،(مێـژووی ناوەڕاسـت)،(٤٧٦–١٥٠٠) دەخایەنێت،وەسـاڵانی(١٥٠٠–١٩١٨) ش بـــۆ مێـــژووی نـــوێ دیاریکراوە،هەرچـــی مـــاوەو ســـەردەمی هاوچەرخیشە،ساڵی(١٩١٨)ی زایینـی دەگرێتـەوە هـەتاوەك وئێـستا.(٧٢)کەواتـە مێژووی ئەوروپا،خۆی لە چەند قۆناغێکی مێژوویی دا دەبینێتەوە،کەهەر یەکـەیان

خـــاوەن ســـیماو تایبەتمەنـــدی خۆیەتی،بـــەڵام لەگـــەڵ ئەمـــەش دا،ســـەردەم وماوەیەکمان بەدی نەکرد بەنێوی قۆناغ و سـەردەمی ڕێنیـسانس!جـا بـۆ ئـەوەی شوێن وجێگەی ڕێنیسانس بزانین وئاگـاداری بـین پێگـەی لـە کـوێ یە،پێویـستە بگەڕێینـەوە بـۆ سـەرەتاکانی،کە لـە چ سـاڵ وکاتێـك دا سـەردەمەکەی دەسـتی پێکردووە شیاوی وەبیرهێنانەوەیە،پوختەی بیری ڕێنیسانس،ئەوە بوو کەوا مـرۆڤ بتوانێت لێکدانەوەو ڕامانەکانی خۆی بە بەڵگەوە بسەلمێنێ،بەبێ ئـەوەی پـەنا بـۆ دۆگماکانی ئایینی مەسیحی وجیهانبینی ئەو ئایینـە ببـات(٧٣)،ڕاسـتی ودروسـتی وایـە،بڵێین پیـاوانی کەنیـسەو هـەڵگرانی ئـەو پەیمانـە نـەك خـودی ئـاینی مەسیحی،چـونکە ئەگـەر بـەراوردیان بکـەین،بێ گوومـان جـۆرە دووفاقییـەك تێـدا دەبینرێـــت.جـــا ئـــەو بزوتنـــەوە فراوانـــەی ئـــەدەب وهونـــەرو زانـــست وشارستانییەتە،لەســـــەدەی(١٥-١٦)زایینـــــی لـــــەئیتاڵیاوە ســـــەری هەڵداوە(٧٤)،وەهەروەها لەسەرەتای سـەدەی(١٥)ی زایینـی دا،پەیوەنـدی نێـوان شارسـتانی ئـەوروپای مەسـیحی وجیهـانی ئیغریقـی ڕۆمـانی دەگەڕێتەوە،کـە بـە درێـژایی سـەدەکانی ناوەڕاسـت پـچڕابوو (٧٥)کـەبێ گوومـان ئـەم گەڕانەوەیـەش سەردەمی ڕێنیسانسی لێ بەرهەم هات هەروەك وباسمان لێـوەکرد،ڕاو بۆچـوونێکی فـرە هەیـە لـەبارەی سـەرەتای سـەرهەڵدانی مێـژووی ڕێنیسانـسەوە لـە مێـژووی ئەوروپادا هەندێك لەمێژوونووسان وادادەنێن کەوا ژیانی شـاعیری ئیتـاڵی(دانتـی)-(١٢٦٥-١٣٢١)ی زایینی،وەبـەکارهێنانی زمـانی ئیتـاڵی لـەبری زمـانی لاتینی،بـۆ یەکەم جار تـۆوی هـزری نـوێ ی چـاندوە لەسـەدەی(١٤)ی زایینـی دا(٧٦)،بـەڵام بـەلای هەنـدێکی ترەوە،تـۆوی ڕێنیـسانس لـە سـەدەی (١٢-١٣)ی زایینـی دەرکەوتووە،وە لەسەدەی (١٤-١٥)ی زایینـی گەیـشتۆتە ئەوپـەڕی هێـزو توانـای خۆی(٧٧).ئەمە جیا لەوەی کەوا لای هەنـدێك نووسـەر،ماوەی نێـوبراوو لەسـاڵانی نزیکەی(١٣٠٠)وە درێژ دەبێتەوە،هەتاوەك وساڵی(١٦٠٠)ی زایینی(٧٨)،یاخودهـەر

لەنیوەی دووەمی سەدەی چواردەوە دەستی پێکردووەو بەردەوام بووە،هەتاوەك و سەرەتای سەدەی حەڤدە.(٧٩)یاخود هەندێکیان دەڵێن کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی لەنێوان سەدەکانی(١٤-١٥)کۆمەڵێ گۆڕانکاری قوڵ وفرەی بەخۆیەوە دیووە،(٨٠)یان دەڵێن لەو ماوەیەدا ڕێنیسانس بەدیار کەوتووە(٨١)،لای هەندێك لەمێژوونووسانی تر ڕێنیسانسی سەدەی(١٥)لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا،لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگەی ئەورووپی دەگرێتەوە،وەك ولایەنی(ڕامیاری-ئابووری-کۆمەلآیەتی). (٨٢)ئەگەر سەرەنج بدەین،سەدەی(١٥-١٦)لە مێژووی کولتووری ئەورووپی دا،پڕن لە ڕووداوی ئەوتۆ کە پاشتر گۆڕانی گەورەیان لێ بەرهەم دێت،(٨٣)ئەم گۆڕانەش بواری فەلسەفەو ئەدەب وهونەرو سیاسەت و زانستی گرتۆتەوە،وە جگە لەوەی کەوا پەنجەی خستۆتە سەر لایەنی نالەباری ئایینی،لەهەمان کاتیش دا بێ دەنگ نەبووە لە دەسەلآتی کەنیسەی مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاست(٨٤)،وە هەروەها یەکێکی تر لەو گۆڕانانە ئەوە بوو،کە بەسەر دید و بۆچوونی مرۆڤ هات لەبارەی دونیای فیزیکی ومیتافیزیکییەوە،کە هەر لەو ماوەیەدا دروستبوو(٨٥) هەروەك ولەمەوپێش باسمان کرد،ڕەخنەگران ڕاوبۆچوونی جیاجیایان هەیە لە بارەی،دیاریکردنی مێژوویی ووردیی سەردەمی ڕێنیسانس،بەلآم هەر هەموویان کۆکن لەسەر ئەو ماوەیەی کە دەکەوێتەنێوان نیوەی سەدەی پازدەوکۆتایی سەدەی شازدە،وەبەشێوەیەکی تایبەتی لەسەدەی(١٤)لە ئیتاڵیاوە دەستی پێکردووە(٨٦).کە ئەمەشیان ڕاوبۆچوون وباسێکی تری نووسەرانە.وێڕای ئەمانەش مێژوونووس(پ.د.کەمال مەزهەر ئەحمەد)،سەدەی (١٥-١٦)ی دەست نیشان کردووە بۆ سەردەمی ڕێنیسانس،(٨٧)لەکۆی هەموو ئەو باس وڕاو بۆچوونانەوە دەگەینە ئەوەی،کەوا سەدەی پازدەو شازدەی زۆربەی زۆری مێژوونووسان ونووسەران لەسەری کۆکن بۆ ئەوەی ڕێنیسانس تێیدا لەدایك بوو بێت بەلآم دەبێت لەیادمان نەچێت

ڕێنیسانس بۆ یەکەمین جار لە ئیتاڵیاوە سەری وەدەرنا وەك وشوێنی جوگرافی،بەڵام وەك وماوە لەڕاستی دا ئەستەمە بتوانرێت بەساڵێکی کورت ئەو ماوەیە دەست نیشان بکرێت،بەڵام تێبینی دەکرێت لەماوەی سەدەکانی(١٥-١٦)لە سەرانسەی ئەوروپا کۆمەڵێك گۆڕانکاری ڕووی لەو کیشوەرە کردووە هەر لەم ماوەیەدا ئیدی وەك وخۆر لەهەموو ئەورووپادا دەدرەوشایەوە،بەڵام ئەگەر بمانەوێت ووردتر و قووڵتر بڕوانینە ئەم ماوەیە،پێویستە بیلکێنین بەکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستەوە،چونکی وەك وباسمان کرد لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست دا کۆمەڵێك گۆڕانکاری ڕووی لەئەورووپا کرد،بەڵام هێشتا سەرەتا بوو،وە جوگرافیایەکەی وەك وسەدەی(١٥-١٦)فراوان بوویەوە شایەنی باسلێوەکردنە،ڕێنیسانسی ئەورووپی کە لەدوا ساتەکانی تەمەنی سەدەکانی ناوەڕاست بەدیارکەوت،لانکە و لەدایك بوونی ئیتاڵیایە،ئەویش بەیارمەتی وهەوڵ وتەقەلای کەسانی وەك و(دانتی-بترارك-بۆکاشیۆ)ئەمانە و چەندین کەس بوونە مایەی ئەوەی کەوا مێژووی ئیتاڵیا بەرە و ئاقارێکی ترببەن،هەرچەندە بۆخۆشی جیاوازبووە،لەگەڵ شوێن وجێگاکانی تر هەر بۆیە هەندێك لەنووسەرانیش لایان وایە،لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا،کە سەرەتای کاروانی ڕێنیسانس سەرەتاتکەی دەرکەوتنی کردووە(٨٨) جا بیریارانی سەردەمی نێوبراوو،بەهۆی پەیوەندیکرنییان بە کلتووری یۆنانی وڕۆمانی،توانییان لەسایەیدا فەلسەفەی عەقلانی وئەدەب وهونەر گەشەپێبدەن،وە لەهەمان کات دا هەستیان بەئازادی وئارامییەکی زۆرکرد(٨٩) وەتەواوی ئەم بوارانە تازەگەری وگۆڕانخوازی پێوە دیاربوو لەکاتێك دا کە بۆمان ساغ بوویەوە کەوا سەردەمی ڕێنیسانس سەرەتا ودەسپێکی لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەستی پێکردووە،کە زیاتر لە ئیتاڵیاوە گیرساوەتەوە،پاشان بۆ شوێن وجێگاکانی تری ئەورووپا پەرەی سەندووە.وەبەپێ ی ماوەی تەمەن وکاتی ئەم ماوەیە بێت،کۆتایی سەردەمی

ڕێنیسانس یاخود سەرەتای سەردەمی نوێ لە ئەوروپا تەمەنی ڕێنیسانسە باشە بۆچی لەو پۆلێنکردنە یاخود لەدابشکردنی مێژووی ئەوروپادا جگە لەو قۆناغە سەرەکییانە،نێوی قۆناغ یاخودسەردەمی ڕێنیسانس نابینین؟ لەڕاستی دا هەروەك وزۆرینەی مێژوونووسان،لایان وایە جگە لەوسێ چوار قۆناغە مێژووییە کە قۆناغی سەرەکیین،هیچ قۆناغێکی تریان دەست نیشان نەکردووە!جابۆیە سەردەمی ڕێنیسانس دەکەوێتە نێوان ئەو قۆناغانەوە ئەوەتا هەندێك نووسەر،وایدەبینن کەوا سەردەمی ڕێنیسانس ڕۆڵی ماوەی گواستنەوە دەبینێت،لەنێوان سەدەکانی ناوەڕاست بۆسەردەمانی نوێ(٩٠) بەلام دەبێت لەیادیشمان نەچێت،گواستنەوە لەو دوو قۆناغەدا،لەپڕێکا یاخود ڕوون و یان دیاری نەکرابوو بەچەند ساڵێك،بەڵکو بەشێوەیەکی پلەبەپلە بووە،وردە وردە ئەم کردارە ڕووی داوە(٩١) هەر بۆ ئەم ماوەیە واتە گواستنەوەی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆ سەردەمانی نوێ،مێژوونووسان زاراوەی سەردەمی بوژانەوە(ڕێنیسانس)یان بۆ داناوە،(٩٢)جا ئەم ماوەیە گۆڕانی لەگەڵ خۆی داهێنا،ئەو گۆڕانکارییەش ئەو هێزە شاراوانەی دەرخست کە لە ئەقڵی مرۆڤ دابوون(٩٣) ئەگەر دووبارە ئاوڕێك لە فەرهەنگی (کۆلینز)یش بدەینەوە،زۆر بەجوانی و دروستی مەبەستەکەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لەبارەیەوە دەڵێت:"قۆناغێکی مێژوویی ئەوروپایە،چاخی ناوەڕاستی ئاوابوو،لەجیهانی مۆدێرنی هەلاتوو جیا دەکاتەوە،بەگشتیش ئیتالیا خاڵی دەسپێکی ئەو چاخەیە کە لەسەدەی چواردەهەم بەدواوەبوو" (٩٤)لەبەر ڕۆشنایی باسەکەمانەوە،بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا سەردەمی ڕێنیسانس لەمێژووی ئەوروپادا،ڕۆڵی نێوەند یاخود وەك وپردێك دەبینرێت،چونکی سەرەتای دەرکەوتنی لکاوە بەکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستەوە،وەکۆتاییەکەشی پەیوەستە بە قۆناغی نوێ وە،ئەمەش خودی "سەدەکانی ناوەڕاست"مان بیردەخاتەوە،کەوا چۆن ڕۆڵی ناوەندی دەگێڕا لەنێوان دوو قۆناغی سەرەکی مێژووی ئەوروپا هەروەك

وبۆمان بەدیارکەوت،مێژوونووسان ڕاوبۆچوونی جیاوازیان هەبوو لەبارەی سەرەتا وکۆتای قۆناغی کۆن یاخود ناوەڕاست یاخود نوێ کە تاڕادەیەك جیاوازی بەدی دەکرێ،کە هێشتا هەیانە تەواوجیاوازە لەگەڵ ئەوانی دی!نەخوازەلا بتوانین بەووردی وبەڕەهایی سەرەتاو کۆتایی سەردەمی رێنیسانس دەست نیشان بکەین!!!جگە لەوەی کە بڵێین ئەوماوەیەیە کەدەکەوێتە نێوان کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست وسەرەتای سەردەمانی نوێ،وەبۆیەکەم جاریش لەئیتاڵیاوە سەری وەدەرناوەو،پاشان گەشەی کردووە بۆشوێن وجێگاکانی ترەوە کەواتە ئەگەر بمانەوێت بگەڕێینەوە بۆسەرەتاو دەسپێکی مێژووی سەرهەڵدان وهۆکارەکانی سەردەمی ڕێنیسانس،دەبێت ئاورێك لەمێژووی ئیتاڵیا بدرێتەوە لەو ماوەیەدا.

((پەراوێز و ژێدەرەکان))

(١)—فرح،نعيم:تاريخ اوربا السياسي في العصورالوسطى،دمشق،٢٠٠١—٢٠٠٢،ص١٤

(٢)—سیوەیلی،رێبوار:(ترسان لەفەلسەفە)،دهۆك،،٢٠٠٨،ص٢١٥

(٣)—اسبر،علي محمد:فلسفة العالم الدنيوي،"النهج"(المجلة)،العدد(٦٩)،شتاء (٢٠٠٣)،دمشق،ص٦٨ نووسەر لێرەدا کەوتۆتە هەڵەیەکی مێژووییەوە،چونکی سەیرە!!!دەست بەسەراگرتنی تورکەکان بەسەر قوستەنتینییەوە،ساڵی(١٤٥٨)ی زایینی تۆمار کردووە.

(٤)—عەزیز،حەمید:تایبەتمەندیی هێزی کۆمەڵایەتی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، "ڕامان"(گۆڤار)،هەولێر،ژمارە(١١٣)،تشرینی یەکەم،٢٠٠٦،ص١٢٩

(٥)—العريني،السيدالباز:الحضارة والنظم الاوربية في العصورالوسطى،القسم الاول،بيروت،١٩٦٣،ص١

(٦)—فرح،نعيم:المصدرالسابق،ص٩

(٧)—مراد وآخرون،خليل علي:دراسات في التاريخ الاوربي الحديث والمعاصر،جامعةالموصل،١٩٨٨،ص٧

(٨)—فرح،نعيم:المصدرالسابق،ص٩

(٩)—العريني،السيدالباز:المصدرالسابق،ص١***اليوسف،عبدالقادرأحمد: العصورالوسطى الاوربية(٤٧٦—١٥٠٠)،صيدا—بيروت،١٩٦٧

(١٠)—صالح،محمدمحمد:تاريخ اوربا من عصرالنهضة وحتى الثورةالفرنسية (١٥٠٠—١٧٨٩)،بغداد،١٩٨٢،ص١٧٠

(١١)—بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی دەرەبەگایەتییەوە،دەڕوانرێتە،اليوسف، عبدالقادرأحمد:المصدرالسابق،ص ص١١٧—١٣٨

(١٢)—عەبدول،مەریوان:چاکسازیی ئاینیی لەئەورووپا،"هەنار"(گۆڤار)، سلێمانی،ژمارە (١٧)،یۆنیۆی(٢٠٠٧)،ص٢٥

(١٣)— صالح ,هاشم: مدخل الى التنوير الاوروبى,بيروت ,٢٠٠٥,ص٢٤

(١٤)—مەزهەر،کەمال:"ڕێنیسانس" لەگەڵ باسێکی تر بەناونیشانی ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ،و:فوئاد مەجید میسری،سلێمانی،٢٠٠٤،ص١٣٤

(١٥)—ئەحمەد،سامان حوسێن:ڕەهەندەکانی ڕیفۆرمی ئایینی لەئەوروپا(ئابووری—کۆمەڵایەتی—سیاسی)،دهۆك،٢٠٠٧،ص٥٥

(١٦)—فلاوێرز،سارا:(چاکسازی)،و:چنورفەتحی،سلێمانی،٢٠٠٧،ص٢٤—٢٥

(١٧)—مەزهەر،کەمال:"ڕێنیسانس" لەگەڵ باسێکی تر بە ناونیشانی ئەدیب وئەرکەکانی قۆناغ،و:فوئادمەجیدمیسری،سلێمانی،٢٠٠٦،ص١٠

(١٨)—بیجان،ئامانج نازم:چەند لاپەڕەك لە مێژووی ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست،"مێژوو"(گۆڤار)،هەولێر،ژمارە(١١)،هاوینی(٢٠٠٩)،ص٧٣·خوێنەری بەڕێز،لیرەدا ناوی (شەماڵ ئەحمەد) زیادکراوە وهەڵەی چاپە

(١٩)—پوڵادی،کەمال:مێژووی هزری سیاسی لە ڕۆژئاوا(لەماکیاڤیلی تامارکس)، و:ئازاد وەڵەدبەگی—سیروان جەبار زەندی،بەرگی دووەم،هەولێر،٢٠٠٥،ص١١

(٢٠)—عەزیز،حەمید:قۆناغەکانی فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئورووپا،"ڕامان"(گۆڤار)،دهۆك—هەولێر،ژمارە(١٤١)،شوباتی(٢٠٠٩)،ص١٠٢

(٢١)—سیوەیلی،ڕێبوار،سەرچاوەی پێشوو،ل٢١٦

(٢٢)—حوسێن،هیمداد:ڕێبازە ئەدەبییەکان،هەولێر،٢٠٠٧،ص٣

(٢٣)—أمين،عبدالامیرمحمد:حسین،محمدتوفیق:تاریخ أوربافی العصورالوسگی، الکتاب الاول،جامعه بغداد،(بدون سنه الگبع)،ص٣٩١

(٢٤)—مراد وئخرون،خليل علی:المصدرالسابق،ص٣٢

(٢٥)—مراد وآخرون،خليل علي:المصدرنفسة،ص٣٨

(٢٦)—عمران،محمودسعيد:تاريخ اوروبافي العصورالوسطی، بيروت،٢٠٠٦،ص٢٣

(٢٧)—سليمان،علي حيدر:تاريخ الحضارةالاوربيةالحديثة،بغداد،١٩٩٠،ص٢٨

(٢٨)—مراد وآخرون،خليل علي:المصدرنفسة،ص٩

(٢٩)—دارك،سیدنی:مێژووی ڕێنیسانس،و:ئەبوبەکرخۆشناو،سلێمانی،٢٠٠٢،ص٣

(٣٠)—سادق،فوئادی تاهیر:هۆشیاریی مێژوویی،سلێمانی،٢٠٠١،ل٨٣

(٣١)—نعنعی،عبدالمجيد:أوروبافی بعج الازمنه الحديبه والمعاصره ،بيروت،١٩٨٣،ص١١

(٣٢)—گۆش،موحەممەدسوهیل:پوختەی مێژووی ئیسلامی،و:نهاد جلال حبیب الله،ناوەندی

ڕۆشنبیر،(٢٠٠٩)،ل٣٠٧

(٣٣)–احمد،كمال مظهر:النهضة،عراق،١٩٧٩،ص١٦

(٣٤)–لیژنەی ئەدەب لەكۆڕی زانیاری كوردستان،زاراوەی ئەدەبی،هەولێر،(٢٠٠٦)،ل ٨٦،لای چەپەوە.

(٣٥)–لەم بارەیەوە،سوود لە هەردوو فەرهەنگی*نقام الدین،فاچل:(فەرهەنگی شیرین)،سلێمانی،٢٠٠٧**كەریم،ڕزگار:(فەرهەنگی شایان)،چاپەمەنی وئۆفسێتی(پەیڤ)،٢٠٠٧،بینراوە

(٣٦)–احمد،كمال مظهر:المصدرالسابق،ص١٦

(٣٧)–صبحي،احمدمحمود:جعفر،صفاءعبدالسلام:في فلسفةالحضارة(الیونانیة–الاسلامیة–الغربیة)،بیروت،١٩٩٩،ص١٠١–١٠٢

(٣٨)–دیورانت،ول:قصةالحضارة(عصرالایمان–عصرالنهضة)، ت:محمدبدران،ج(١٧–١٨)،من المجلد(٩)،الجزءالثاني،مصر،٢٠٠١،هامش –ص١١٩

(٣٩)–حاتم،عماد:مدخل الى تاریخ الاداب الاوربیة،لیبیا،١٩٧٩،ص١٣١

(٤٠)–المقرحي،میلاد.أ.:موجزتاریخ أوروباالحدیث والمعاصر،بنغازي ،١٩٩٨،ص٢٢

(٤١)–عەزیز،حەمید:بنەما فەلسەفەییەكانی هزری كۆمەڵایەتی لەسەردەمی ڕێنیسانس–دا،"ڕامان"(گۆڤار)،ژمارە(١١٨)،ئاداری(٢٠٠٧)،ل١٢٧

(٤٢)–گاردەر،یۆستاین:(جیهانی سۆفیا)ڕۆمانێك سەبارەت بەمێژووی فەلسەفە،و:بەهرۆزحەسەن،سلێمانی،ئۆفسێتی دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم،٢٠٠٢،نووسەرباسێكی تەواوی بۆئەم ماوەیە تەرخان كردووە،بڕوانە لاپەڕەكانی(ل ل٢٠١–٢٣٠)

(٤٣)–پارفیت،جۆرج:ئەدەب و ڕەخنەی خۆرئاوایی لەچاخی ڕێنیسانسدا،و:شاهۆسەعید،"سەردەم"(گۆڤار)،ژمارە(٥٦)،سلێمانی،پایزی(٢٠٠٨)،ل١١٣

(٤٤)–صبحي،احمدمحمود:جعفر،صفاءعبدالسلام:المصدرالسابق،ص١٠١

(٤٥)–المقرحي،میلاد.أ.:المصدرالسابق،ص٢٢

(٤٦)–رمضان،عبدالعظیم:تاریخ اوربا والعالم الحدیث(من ظهورالبرجوازیةالاوروبیةالى الحرب الباردة)،الجزء الاول،الهیئةالمصریة العامة للكتاب،١٩٧٧،ص٤٩

(٤٧)–مجموعةمن المؤلفین:(المنجد)في اللغةالعربیة المعاصرة،بیروت،٢٠٠٦، ص٩٨٣

(٤٨)–سـیوەیلی،ڕێبوار:پێشزەمینەکانی سەرهەڵدانی بزافی فەلسەفەی ڕۆشنگەری لەئەوروپا،"سەنتەری برایەتی"(گۆڤار)،ژمارە(٢٥)،پاییزی(٢٠٠٢)،ل٨٩

(٤٩)–نعنعی،عبدالمجید:المصدرالسابق،ل٢٧

(٥٠)–ئیمام،ئیمام عەبدولفەتاح:جۆن لۆك وئافرەت،و:ئەژی عەبدولخالق،هەولێر،(٢٠٠٢)،ل١٧

(٥١)–صالح،محمدمحمد،المصدرالسابق،ل٧١

(٥٢)–ئیبراهیم،موسا:فیکری سیاسی خۆرئاوا لە مەکیاڤیلیەوە تامارکس،و:شوان ئەحمەد،سلێمانی،٢٠٠٥،ل٩

(٥٣)–ستیگن،ئانفین:فەلسەفە لە مێژوودا(پوختەیەك)،و:فەرۆخ نیعمەتپوور، سلێمانی،٢٠٠٩،ل٥٧

(٥٤)–پیربال،فەرهاد:(وەرگێران وتوژینەوە)،ڕێبازە ئەدەبییەکان،هەولێر،٢٠٠٦، ل٢٣

(٥٥)– عەزیز،حەمید:بنەما فەلسەفەییەکانی هزری کۆمەڵایەتی لەسەردەمی ڕێنیسانس–دا،ل١٢٧

(٥٦)–شاکر،محمود:موسوعەالحچارات وتاریخ الامم القدیمەوالحدیپە،داراسامە للنشر والتوزیع،الجزوالپانی،ص٤٩٩

(٥٧) – نەریمان : کلاسی نەك کلاسیکی،"(گۆڤار)،ژمارە(٢٨)،ئابی(١٩٧٥)،ل١

(٥٨)– نعنعی،عبدالمجید:المصدرالسابق،ل٢٩

(٥٩)–تەقی،جەلال:(وەرگێران)،"چواربلیمەت"(زینۆفۆن–ژان دارك–گۆگۆڵ–دەستەیێفسکی)،سلێمانی،٢٠٠٣،ل٣٢

(٦٠)–احمد،کمال مظهر:النهضة،ص١٦

(٦١)–سیوەیلی،ڕێبوار:پێشزەمینەکانی سەرهەڵدانی بزافی فەلسەفەی ڕۆشنگەری لەئەوروپا،ل٨٨

(٦٢)–ئەحمەد،کەمال مەزهەر:(مێژوو)کورتە باسێکی زانستی مێژوووکورد ومێژوو،(مگابع دارافاق عربیە)،بەغداد،١٩٨٣،ل٥٤

(٦٣)–الادهمي،محمدمظفر:تاریخ اوربا الحدیث(عصرالنهضة–الثورةالفرنسیة)القرون"١٦–١٨" میلادیة،بغداد،١٩٨٩،ص٥

(٦٤)–مراد وآخرون،خلیل علي:المصدرنفسة،ص٧

(٦٥)–ئەحمەد،کەمال مەزهەر:(مێژوو)کورتەباسێکی زانستی مێژوووکوردومێژوو،پەراوێزی–

ل٥٤

(٦٦)–ئەنوەر،کـــەیوان ئـــازاد:رێبـــازی لێکۆڵینـــەوە و رێبـــازی لێکۆڵینـــەوەی مێژوویی،سلێمانی،٢٠٠٨،ل٢١

(٦٧)–مراد وئخرون،خليل على:المصدرنفسه،ص٨

(٦٨)–عمران،محمودسعيد:المصدرالسابق،ص٢٠

(٦٩)–عمران،محمودسعيد:المصدرنفسه،ص١٩

(٧٠)–زياده،خالد:اكتشاف التقدم الاروبى(دراسه فى المؤيرات الاروبيه على العيمانيين فى القرن اليامن عشر)،بيروت،١٩٨١،ص١٤

(٧١)–عمران،محمودسعيد:المصدرالسابق،ص٢٧

(٧٢)–مراد وآخرون،خليل على:المصدرالسابق،ص٩

(٧٣)–ســـیوەیلی،رێبوار:پێـــشزەمینەکانی ســـەرهەڵدانی بزافـــی فەلـــسەفەی رۆشـــنگەری لەئەوروپا،ل٨٩

(٧٤)–پیربال،فەرهاد:(وەرگێران وتۆژینەوە)،رێبازەئەدەبییەکان،ل٢٢–٢٣

(٧٥)–الـشامي،فاطمة قـدورة:(علـم التـاريخ)تطورمنـاهج الفكروكتابـةالبحث العلمـي مـن اقـدم العصورالى القرن العشرين،بيروت،٢٠٠١ص٧٤

(٧٦)–عمران،محمودسعيد:المصدرالسابق،ص٢٦

(٧٧)–عاشور،ســـعيدعبدالفتاح:اوربـــا العـــصورالوسطى(الـــنظم والحـــضارة)، مكتبةالانجلوالمصرية،القاهرة،جامعةالقاهرة،الجزء الثاني،ص٤٧١

(٧٨)–احمد،قيس هادي:نظريةالعلم عندفرانسيس بيكن،بغداد،١٩٨٦،ص١٥

(٧٩)–صالح ,هاشم:المصدرالسابق،ص٦٨

(٨٠)–ساڵح،غانم محەمەد:بیری سیاسی کۆن وناوەڕاست،و:سەلام کەریم عەلی، ،سەیدسادق، ٢٠٠٥ل\٢٧٥

(٨١)–باقر،طـــة:حميد،عبـــدالعزيز:طـــرق البعـــث العلمـــي في التـــاريخ والاثار،جامعـــة الموصل،١٩٨٠،ص٤٢

(٨٢)–شكري،محمدفؤاد:أنيس،محمد:أوروبـا في العـصورالحديثة(مـن النهـضةالايطاليةحتى الثـورة الفرنسية)،الجزء الاول،مكتبةالانجلوالمصرية، الطبعةالثاني،١٩٦١ص١٦–١٧

(٨٣)–ســـیوەیلی،رێبوار:پێـــشزەمینەکانی ســـەرهەڵدانی بزافـــی فەلـــسەفەی رۆشـــنگەری

لەئەوروپا،ل۸۸.

(۸٤)–عەزیز،حەمید:بنەمافەلسەفەییەکانی هزری کۆمەلآیەتی لەسەردەمی ڕێنیسانس–دا،ل۱۲۷

(۸٥)–سیوەیلی،ڕێبوار:پێشزەمینەکانی سەرهەڵدانی بزافی فەلسەفەی ڕۆشنگەری لەئەوروپا،ل۸۸

(۸٦)–حاتم،عماد:المصدرالسابق،ص۱۳۱

(۸۷)–ئەحمەد،کەمال مەزهەر:(مێژوو)،ل٥۲

(۸۸)–عەزیز،حەمید:بنەمافەلسەفەییەکانی هزری کۆمەلآیەتی لەسەردەمی ڕێنیسانس–دا،ل۱۲۷

(۸۹)–شوانی،فاتیح عەبدوللا:ڕێنیسانس...خاڵی وەرچەرخان لەمێژووی هزری مرۆڤایەتیدا،(ڕێنیسانس)"گۆڤار"،ژمارە(۸–۹)،بەهاروهاوینی(۲۰۰٦)،ل٥۰

(۹۰)–الخطیب،محمد:حضارةاوروبافي العصورالوسطی،دمشق،۲۰۰۹،ص۲۱۳

(۹۱)–الادهمی،محمدمظفر،المصدرالسابق،ص۱۱

(۹۲)–شاکر،محمود:المصدرالسابق،ص٤۹۷

(۹۳)–حەننا،جۆرج:چیرۆکی ئادەمیزاد،و:ڕەوف زوهدی،سلێمانی،۲۰۰۷،ل۱۷۲

(۹٤)–پارفیت،جۆرج:سەرچاوەی پێشوو، ل۱۱۳

# ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا
# لە سەردەمی سەرۆکایەتی ( ولیام مەکێنلی )دا
# ( ١٨٩٧-١٩٠١ )

دلشاد مەحموود عەبدولڕەحمان
مامۆستای یاریدەدەر ـ کۆلێژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر

## پێشدەست:

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم گەشەسەندنێکی گەورەو کاریگەری لەبواری ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و سیاسییەکانی بەخۆوە بینی، کە دەرهاویشتەکانیان ریشەییانە کاریان کردە سەر ئاراستە سیاسییەکان‌و پەیوەندییە دیپلۆماسییەکان، هەموو ئەو پەرەسەندنانەی لەسەردەمی سەرۆکایەتی ویلیام مەکێنلی هاتنە ئارا ئەمەریکای وەك زلهێزێکی تازەپێگەیشتوو بە ولاتانی جیهان ناساند، بۆ لاکردنەوە لەنهێنی دەرکەوتنی ولاتە یەکگرتوەکان لەسەر گۆڕەپانی هەرێمی‌و نێو دەولەتی‌و ئاشناکردنی خوێنەران بە سەردەمێکی پڕبایەخی مێژووی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بەپێویست زانرا لێکۆلینەوەیەك ئەنجام بدرێت‌و تاووتوێی هۆکارو ئاکامەکانی نەخشی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە رەوتی پەرەسەندنی مێژووییانەدا بکرێت.

دەروازە: "زەمینەیەکی مێژوویی"

جەنگی سیڤیل (ئەهلی) لە ئەمەریکا (١٨٦١–١٨٦٥)، شۆڕشی لە کایەکانی کۆمەڵایەتیو ئابووریی ئەمەریکی بەرپاکرد[١]، ئەو ململانێییەی لەنێوان باکوورو باشوور هاتە کایە، بواری بۆ چالاکبوونی پیشەسازی خستەگەڕو پەلەی لە بەکارخستنی سەرچاوە سروشتییەکانو گەشەپێدانی پیشەسازی بە شێوەیەکی بەربڵاو کرد. ئەوەش بە نۆرەی خۆی رۆڵی لە بەرفراوانکردنی بازرگانی دەرەکی هەبوو. زۆربوونی چالاکییە ئابوورییەکان، دروستکردنی هێڵی ئاسنینو تۆڕەکانی گەیاندنی بە شێوەیەکی بەرچاو لێکەوتەوە[٢].

هەر لەو ماوەیەدا، واتە دوای برانەوەی جەنگی سیڤیل چەندین داهێنانکاری لە بوارە جۆربەجۆرەکانی ژیاندا هاتنە ئارا، ئەو مۆرکە نوێیەی کۆمەڵگەی ئەمەریکی زۆر لایەنی گرتەوە ( گەشەکردن لە رووپێو، لە ژمارە لە سەروەتو سامان، لە نفووزو دەسەلات، لە ئاڵۆزییەکانی کۆمەڵگا، لە پێگەیشتنی ئابووریو...هتد)[٣].

دۆزینەوە زۆرەکان لە کایەکانی خاوی ئاسنو مسو نەوت بوونە مایەی سەرهەڵدانی دەیان پیشەسازی گەورەو گەشەکردنی پرۆژە بازرگانیو پیشەسازییە بچووکەکان[٤]، یەکێتیو سەندیکا پیشە گەرەکانو بازرگانەکان بوونە ئامێرێکی کارا بۆ ئابووریی نوێی نەتەوەیی، یەکێتییە قۆرغکارییەکانو کۆمپانیاکانیش،(ئەوانەی خاوەنداریێتی پشکی کۆمپانیاکانی دیکە دەکەن بۆ ئەوەی دەستیان بەسەردا بگرن)، شێوەو تایبەتمەندیی جیاکەرەوەی رێکخراوەیی ئەو ئابوورییە بوو[٥].

لەماوەی چل ساڵان (١٨٦٠–١٩٠٠)، رێژەی دانیشتوان لە (٣١) ملیۆنەوە گەیشتە (٧٦) ملیۆن کەس، لەنێو ئەو رێژەیەدا (١٥) ملیۆن کۆچکردوو هەبوو، کە

لە ناوچەکانی باشوورو رۆژهەلاتی ئەورووپاوە هاتبوون، بەوەش چەند قات قەبارەی شارە گەورەکان، وەك: (نیۆیورك‌و شیکاگۆو دیترۆیت‌و کیلڤلاندو...هتد) زیادیان کرد، لە ئاکامی ئەو وەچەرخانە گەورانەدا، کۆماریەتی کشتوکالّیی (ئەبراهام لینکۆلن‌و رۆبەرت لی) بووە ئیمپراتۆریەتی شارنشینی پیشەسازیی (ویلیام مەکێنلی‌و تیۆدۆر رۆزڤێلت)[٦].

تەوەری یەکەم:

"سەرۆکایەتی مەکێنلی‌و رەوشی ئابووری‌و کۆمەلایەتی لە ئەمەریکا"

– بایۆگرافیای ولیام مەکێنلی:

ولیام مەکێنلی جۆنیور لە دایکبووی نیلّسە لە ویلایەتی ئۆهایۆ (١٨٤٣/١٢/٢٩)[٧]، منالّی حەوتەمی (ولیام‌و نانسی ئالیسۆن)ە، بنەچەو رەچەلّەکی خانەوادەکەی تێکەلاوییەکی سەیرە لە رەگەزی سکۆچی – ئێرلەندی‌و ئینگلیزی[٨]، لە تەمەنی نۆ سالاندا گوازراوەتەوە بۆ پۆلّەند لەنێو ویلایەتی خۆی‌و لەئاکادیمیای پۆلّەند دەخوێنێت، پاش تەواوکردنی ئەکادیمیا پەیوەندی بە کۆلێژی (ماونت یونیەن)ەوە کردو دواتریش چۆتە کۆلێژی ئۆلّیگێنی لە سالّی (١٨٦٠)دا[٩].

مەکێنلی لە سەرەتای دەستپێکی جەنگی سیڤیل لە سوپای یەکێتی خۆی ناونووس دەکات، بە پلەی کاپتن لە ریزی تیپی (٢٣)ی خۆبەخشانی پیادەرەوی ئۆهایۆ خزمەت دەکات. ئەو تیپە ناردرایە بەرەکانی جەنگی ڤێرجینیا[١٠]، لەبەر رۆلّ‌و کارەکانی لە بواری خزمەتی سەربازی لە (ئەیلولی ١٨٦٥) بۆ پلەی (مەیجەر) بەرزکراوە[١١].

پاش کۆتایی هاتنی جەنگ، گەڕایەوە ویلایەتی خۆی‌و دەستی بەخوێندن کرد لە بواری یاسادا، پەیوەندی بە قوتابخانەی یاسای ئەلبانی لە نیویۆرک کردو بەسەرکەوتوویی لەو قوتابخانەیە دەرچوو، دواتر هەڵسا بە کردنەوەی نوسینگەیەکی پارێزەری لە (کانتۆن) لە ئۆهایۆ (١٨٦٩-١٨٧١)[١٢]، لە تەمەنی (٢٨) ساڵیدا، ژیانی هاوسەرایەتی لەگەڵ (ئیدا ساکسۆن) پێکەوەنا، بەرهەمی ئەو ژیانە نوێیە بریتیبوو لە خستنەوەی دوو کچ[١٣].

لە ماوەی نێوانی ساڵانی (١٨٧٧-١٨٩١) لە خولەکانی کۆنگرێسی (٤٤، ٤٦، ٤٧، ٤٨، ٤٩، ٥١) وەك نوێنەری ویلایەتی ئۆهایۆ لە خانەی نوێنەرایەتی ولاتە یەکگرتووەکان هەڵبژێردرا[١٤]، لە ساڵانی (١٨٩١-١٨٩٢) بووە حاکمی ئۆهایۆ[١٥]، لە هەڵبژاردنەکان بۆ پۆستی سەرۆکایەتی ولاتە یەکگرتووەکان بە هەوڵو کۆششی لێبڕاوانەی گەورە بازرگانی ئەمەریکی مارکۆس حنا(١٨٣٥-١٩٠٤)، مەکینلی توانی زامنی کاندیدی کۆمارییەکان بۆ خۆی بەدەستخات‌و بەسەر رکابەرەکەی (ولیام چێنینگز برایان) لە ساڵی (١٨٩٦) سەرکەوێت[١٦]. بەو ئاکامەش بووە (٢٥)هەمین سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکان.

مەکینلی بۆ جاری دووەم توانی لە ساڵی (١٩٠٠)دا خولی دووەمی سەرۆکایەتی وەربگرێتەوە، بەلام بەتێپەڕینی تەنها چەند مانگێك لە (١٩٠١/٩/٦) لە کاتی کردنەوەی پێشانگای (پان ئەمەریکان) لە (بۆفالۆ) لە نیویۆرك، لەلایەن کۆچکردوویەکی پۆلۆنی بەنێوی (لیۆن فرانس جۆلگۆج) تەقەی لێکرا، پاش هەفتەیەك بە هۆی سەختی برینەکەیەوە گیانی لەدەستدا[١٧].

- ڕەوشی ئابووریی ئەمەریکا لە سەردەمی (مەکینلی)دا:

بەر لە وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی ولاتە یەکگرتووەکان لە لایەن مەکینلییەوە، بە تایبەت لە سەردەمی گروڤەر کلیڤلاند(١٨٩٢-١٨٩٦)، ئابووریی

ئەمەریکا دووچاری قەیران ببوو. زۆرێك لە كۆمپانیاكان ئیفلاسبوونی خۆیان راگەیاندبوو. هەندێك بەنك داخران و زۆربەی كارگەكانیش لەكار كەوتن. باری بازرگانی كەوتە كزی. نرخی بەرهەمهاتووە كشتوكاڵییەكان دابەزی و ولات پەشێوی و ئاژاوەو خۆپیشاندانی بەخۆوە گرت[18]. لەگەڵ دەستبەركاربوونی مەكێنلی لە ساڵی (١٨٩٧)دا ئەو قەیرانە ئابوورییە وەك خۆی مابۆوە، سەرۆكی پێشتر بۆی چارەسەر نەكرابوو.

مەكێنلی بە پاڵپشتیكردنی سەرمایەدارە گەورەكان، كەوتە كۆشش بۆ دۆزینەوەی رێگە چارەی رزگاركردنی ولات لەو قەیرانە، چونكە مەكێنلی لایەنگری سەرسەختی سەرمایەداری بوو. لە ساڵانی (١٨٧٧-١٨٩١)دا، لەبەر ئەوەی پاڵپشتی و جەختی لە روانگەو سیاسەتی (پێناسی بەرز) دەكردەوە، ناوبانگییەكی زۆری پەیداكردبوو. ئەو بۆچوونە لە بەرزنرخاندنی پیشەسازییە ناوخۆییەكان لە لایەك و لە لایەكی دیكەش لە چوارچێوەی بەرزكردنەوەی رێژەی باجە گومرگییەكان لەسەر هاوردەكانی ئەمەریكی دەخولایەوە[19].

بۆچوونێكی دیكەی ئابووری مەكێنلی ئەوە بوو كە دەستبگیرێت بە زێر لە بری زیو وەك دراوی ولات. واتە لە بری لێدانی دراوی زیو بۆ چارەكردنی قەیرانی ئابووری، زێڕ لێبدرێت. بەرهەڵستی لە هەموو ئەو بۆچوونانەش كرد كە داوایان دەكرد پارەی زیو لێبدرێت بۆ ئەوەی بەسەر قەیرانی ئابووریدا زاڵبن[20].

پاش ماوەیەكی كەم لە سەرۆكایەتیكردنی مەكێنلی، قەیرانی ئابووری وردە وردە بەرەو نەمان چوو، هەر لەو سەردەمەشدا بوو قانوونی عەییاری زێڕ ( Gold standard) لەساڵی (١٩٠٠)دا دەرچوو[21].

لە وردبوونەوەیەكی سەرپێی روون دەبێتەوە كە مەكێنلی ئەو رێوشوێن و یاساو رێسایانەی چەند ساڵ لەوەوبەر دەركرابوون بە مەبەستی رێگری لەبەردەم

کۆمپانیای قۆرخکارییەکانو سنووردارکردنو لە قەبارەدانی تەماعکارییەکانیان، بە توندی پەیڕەو نەدەکرد. بۆیە ڕۆڵی کۆمپانیاو ترستەکان ڕۆژ دوای ڕۆژ لەزێدەبووندا بوون[٢٢]. لەبەرامبەردا، تێکڕای ناوەندی ناردەنی ولاتە یەکگرتووەکان لە سەردەمی مەکێنلی هەڵکشانی بەرچاوی بەخۆوە بینی کە ئاماژەیە بۆ بەهێزبوونی ئابووریی ئەمەریکا. بەگوزارشتێکی دیکە، تێکڕای ناوەندی ناردەنی بەرهەمێهنراوە ئەمەریکییەکان، لە نێوان سالآنی (١٨٨٧-١٨٩٧)دا گەیشتە تەنها (٦٣) ملیۆن دۆلار، کەچی تێکڕای ناوەندی ناردەنی بەرهەمێهنراوەکانی ئەمەریکا بە تەنها لە ساڵی (١٨٩٨)دا، گەیشتە سەرووی (٢٩٠) ملیۆن دۆلارو لە ساڵی(١٨٩٩)ش لە سەرووی(٣٣٩) ملیۆن دۆلارو ساڵی (١٩٠٠) نزیکەی (٤٣٤) ملیۆن دۆلارو لە ساڵی (١٩٠١)دا گەیشتە (٤١٢) ملیۆن دۆلار[٢٣].

ئەڵبەت بەڵگەو هۆکاری زیادبوونی ڕێژەی ناردەنی بۆ بارودۆخی سیاسی دەگەڕایەوە، کە لە ئەنجامی ئەو کشانە هەرێمیو نێودەوڵەتیانەی ئەمەریکا لە نێوان سالآنی (١٨٩٨-١٩٠١)دا بەخۆیەوە گرت، داکەوتبوو. ئەو کشانو دەستێوەردانە هەرێمیانەش هۆکارێکی بریتیبوو لەپەیداکردنو پاوانکردنی بازارو نشینگەی نوێ لەپێناو ساغکردنەوەی کالآ بازرگانییە ئەمەریکییەکان[٢٤].

- ڕەوشی کۆمەڵایەتیی ئەمەریکا لە سەردەمی (مەکێنلی)دا:

کۆمەڵگەی ئەمەریکی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، بە تایبەت لە سەردەمی سەرۆکایەتیکردنی (مەکێنلی)دا بە بارودۆخێکی جیاکەرەوەو لە هەندێك لایەنو کاتیشدا، بە نالەباری وەسف دەکرێت. چونکە وەك لە باسی پێشوودا ئاماژەی پێکرا، قەیرانی ئابووری بۆ گۆڕانکاری خێرای پیشەسازی دەگەڕایەوە.

لەو قەیرانەدا زیاتر یەك لەسەر شەشی هێزی کاری وڵات لەسەر کارەکانیان دەرکران. کرێی رۆژانەی کرێکاران دابەزی. بێکارەکان بەبێ بژێوی‌و نەوایەك لەشارەکاندا پەرتەوازە بوون[٢٥]. بێ هۆ نەبوو لە کۆتاییەکانی ئەو سەدەیە بە هەزاران خۆپیشاندان‌و مانگرتن هاتنە ئارا[٢٦]، کە لە مێژووی خەباتی کرێکاری بە ئاژاوەی گەورە (Great Riots) ناسراوە[٢٧]، جووتیارەکانیش لە بارودۆخێکی زۆر دژواردا دەژیان[٢٨].

سەرهەڵدانی گرفتە کۆمەڵایەتییەکان ئەگەری شۆڕش‌و ڕاپەڕینێکی گەورەی ناوخۆی هێنایە کایەوە، لە بەرامبەر ئەم گیروگرفتانەشدا، تەنها دوو ڕێگە چارە هەبوو: یان ئەوەتا دەوڵەت بە هاوکاری لەگەڵ سەرمایەدارەکان هەوڵی دووبارە دابەشکردنەوەی سەروەت‌و سامان بدەن، بە شێوەیەکی دادپەروەرانەو دەلاقەکانی جیاوازیی چینایەتی بچووك بکەنەوەو گرنگی بە یەکسانی داهاتی ئابووری بدەن بۆ بنەبڕکردنی گرفتەکان، یان ئەوەتا بازاڕی نوێ بدۆزنەوەو لەو ڕێگەیەوە چارەسەری گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی ناوخۆ بکەن[٢٩].

دەبێت ئەوەش لەبەر چاو بگیرێت کە حکومەتی ئەمەریکی بۆ ماوەی نەوەیەك بە دەستی کۆمارییەکانەوە بوو. ئەوانەی زیاتر لاگیریان لە فەلسەفەی **"ئازادی کار"** دەکرد، کە لەو سەردەمەدا باو بوو. بۆیە گرنگییەکی پێویستیان بە زۆربەی داواکارییە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان نەدەدا، چەمکی **"هونەری حوکمڕانی"** لە لای ئەوانە بریتیبوو لە خزمەتکردنی کۆمپانیاکان[٣٠]. سەرباری ئەوەش، پرۆسەی کۆچی ئەوروپییەکان بۆ ئەمەریکا بەردەوام بوو، ئەو پرۆسەیە کاریگەری نێگتیفی لەسەر باری کۆمەڵایەتی‌و گوزەرانی کۆمەڵگەی ئەمەریکی دەنواند. لە دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ڕێژەیەکی زۆری (ئوستراڵی، هەنگاری، رووسی، پۆڵەندی، ئیتاڵی‌و بەڵکانی) ڕوویان کردە ئەمەریکا. لە ساڵی (١٩٠٠)دا ژمارەی دانیشتوانی رەگەز ئیتاڵی لە شاری نیویۆرك لە ژمارەی دانیشتوانی خودی

ناپۆلی تێپەڕی کرد[٣١]. ئیدی لە ئەنجامی زۆربوونی دەستی کار، خاوەن پرۆژەو سەرمایەدارەکان بەنرخێکی کەم کاریان بەو کرێکارانە دەکرد(٦-١٢) سەنت بۆ هەر کاتژمێرێك. ئەمەش هەمان ئەو نرخە بوو کە کاتی خۆی قولیەکانیان پێ دەکرِیو دەژیاند!! هەروەها لەبەر نالەباری بارودۆخی ئەو کۆچکردووانە، ژمارەیەکی زۆری منداڵی تەمەن (١٠) دە ساڵان لە بواری پیشەسازی کاریان دەکرد، لەو سەردەمەدا ژمارەیان خۆیدا لە (٢) ملیۆن منداڵ[٣٢].

لە سەرنج لێگرتنێکی ورددا، دەردەکەوێت داهاتنی ساڵی (١٩٠٠) دەروازەیەکی بەخێر لە کۆمەڵگەی ئەمریکی کراوەتەوە، چونکە لەو ساڵەدا بوو کرێکاران زۆربەی هەرە زۆری مافە سەرەکییەکانی خۆیان بەدەستهێناو هەر لەو ساڵەشدا بوو هەستی راگرتنی شەپۆڵی کۆچکردن، لەئەوروپاوە بەرەو ئەمەریکا، لە نێو کۆمەڵگەو دەسەڵاتدا دروست بوو[٣٣].

تەوەری دووەم:

سیاسەتی دەرەکیی ئەمەریکا لە سەردەمی مەکێنلی

- کۆڵەگەکانی سیاسەتی دەرەکیی ئەمەریکی:

سیاسەتی دەرەکی ئەمەریکا هەر لەسەرەتای دروستبوونی ولاتە یەکگرتووەکانەوە تاوەکو کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، واتە سەردەمی سەرۆکایەتی مەکێنلی، لەسەر سێ هێڵی سەرەکیو کۆڵەگە بەند بووە:

**یەکەمیان:** دوورەپەرێزی سەبارەت بە کێشە سیاسییەکانی ئەوروپا.

**دووەمیان:** بنەمای مۆنرۆ.

**سێیەمیان:** فراوانخوازی سنووری هەرێمایەتی.

سەبارەت بە سیاسەتی دوورەپەرێزی لە کێشە سیاسییەکانی ئەورووپا ئەوا بۆ سەردەمی جۆرج واشنتۆن(١٧٨٩-١٧٩٧) دەگەڕایەوە، کاتێك لە ساڵی (١٧٩٦)دا ئامۆژگاری سیاسەتمەدارانی وڵاتەکەی کرد لەخۆ دوورگرتن لە کاروبارەکانی کیشوەری ئەورووپی‌و کێشە زۆرەکانی[٢٤]. ئەوەی یارمەتیدەری گەورەی سەرکەوتنی ئەو ئاراستە سیاسییەش بوو، باری بەهێزی ستراتیژیەتی ئەمەریکا بوو، کە بە هۆی شوێن‌و هەڵکەوتە جوگرافییەکەیەوە داکەوتبوو.

بنەمای مۆنرۆ، کە لە لایەن جیمس مۆنرۆ (١٨١٧-١٨٢٥) سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی(١٨٢٣)دا، لە میانەی نامەی ساڵانەی بۆ کۆنگرێس هاتە کایە، بریتیبوو لە جەختکردنەوە لەسەر رەتکردنەوەی ئیستیعماری ئەورووپی لە بنیاتنانی نیشینگەو ناوچەی نوێی دەسەڵات لە نیوە گۆی رۆژئاوای زەوی‌و دەستێوەرنەدان لە کاروباری وڵاتانی جیهانی نوێ، لە بارێکدا هەڕەشە لەسەر سەربەخۆبوونیان دروست بکات[٢٥]. ئەو بنەمایە بووە هێڵێکی سەرەکی لە سیاسەتی دەرەکیی ئەمەریکا بە درێژایی ساڵانی سەدەی نۆزدەهەم.

هەرچی سیاسەتی فراوانخوازی سنووری هەرێمایەتی بوو، لە سەدەی نۆزدەهەم زیاتر دەرکەوت. ئەو ئاراستە سیاسییە لە سەدەی نۆزدەهەم، بە تایبەت لە کۆتاییەکانی ئەو سەدەیە، پەرەسەندنی زۆری بەخۆوە گرت. حکومەتی ئەمەریکی ساڵ دوای ساڵ توانی رووبەرێکی بەرفراوانی زەوی لە ناوچەی هەرێمییەکان بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، وەك: (لویزیانا، فلۆریدا، ئالاسکا، کالیفۆرنیا، تکساس)و زۆر ناوچەی دیکەی لە فەرەنساو ئیسپانیاو رووسیا، بە کڕینەوە بێ یا بە حکومی واقیع بێ یا هەر بیانوویەکی دیکە، لەژێر دەستیان دەرهێناو باڵی بەسەردا کێشا[٢٦].

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، رۆحیەتی سەرەرۆیی‌و فراوانخوازی وڵاتە

یەكگرتووەكان پێگەیشتو لەو سۆنگەیەشدا رووبەرووی وجودی ئیستیعماری ئەورووپی بۆوەو كەوتە ململانێو پێكدادان لەگەڵ ئیسپانیا، بە تایبەت لە ناوچەكانی ئەمەریكای لاتینی، دوورگەكانی زەریای ئەتڵەسیو دەریای كاریبی[٣٧].
ئیدی لەو مێژووە بەدواوە سیاسەتی ئەمەریكا لە بواری دەرەكیدا گۆڕانی گەورەی بەسەردا هات[٣٨]. ئەو جەنگەی لە ساڵی (١٨٩٨)، لە نێوان ئیسپانیاو ئەمەریكا هەڵگیرسا، مێژووی سەرهەڵدانی ولاتە یەكگرتووەكان وەك هێزێكی جیهانی گەورە روون دەكاتەوە؛ كاتێك توانی لە ماوەیەكی كەمدا بەسەر ئیسپانیای خاوەن مێژوویەكی دێرینو پڕ لە سەروەریدا سەركەوێت[٣٩].

– جەنگی ئیسپانی – ئەمەریكی (١٨٩٨):

ئیستیعماری ئیسپانی ماوەیەكی دوورودرێژ بوو ناوچەگەلێكی زۆری كیشوەری ئەمەریكاو رۆژهەلاتی دووری لەژێر دەستدا بوو، (كوباو فلیپین) لەو ناوچانە بوون. سواوی سیستەمی حوكمو پێگەیشتنی رۆحیەتی سەربەخۆیی لەنێو دانیشتوانی ئەو دوو ولاتە ببوونە هۆی بەرپابوونی شۆڕشو راپەڕین دژ بە دەسەلاتی ئیستیعماری ئیسپانی[٤٠]. (كوبا) لە ساڵی (١٨٩٥)دا شۆڕشێكی گەورە دژ بەدەسەلاتدارانی ئیسپانی، بە رابەرایەتی"جۆزیە مارتی" لێ پەیدابوو. بە هەمان شێوە لە (فلیپین) بە رابەرایەتی (ئاگۆینالدۆ) شۆڕش بەرپاكرابوو[٤١].
پەرەسەندنی ئەو رووداوانەو زۆر هۆكاری دیكە، دواتر بوونە هۆی ئەوەی جەنگی ئیسپانی ئەمەریكی لێبكەوێتەوە.

لە گرنگترین ئەو هۆكارانەی پاڵی بە ولاتە یەكگرتووەكانەوە نا بكەوێتە جەنگ دژ بە ئیسپانیا، ئەمانە بوون:

**یەكەم:** نەبڕانەوەی جەنگو ئاژاوەكان لە كوبا كە نزیكەی (٩٥) كیلۆمەتر لە

سنووری ئەمەریکاوە دوور بوو، بە تایبەت جەنگەکانی دە ساڵە (١٨٦٧-١٨٧٨)و جەنگی (١٨٩٥-١٨٩٨). واتە بەردەوامبوونی ناسەقامگیری سیاسیو بەرقەرار نەبوونی ئاسایش لە نزیك سنوورەکانی ئەمەریکا(٤٢).

**دووەم**: کاریگەری نامەی باڵیۆزی ئیسپانیا "دی لۆمە" لە واشنتۆن، کە مەکینلی بەسیاسەتمەدارێکی بێ نرخو لاواز وەسف کردبوو. ئەو نامەیە بە رێکەوت کەوتە دەستی یەکێك لە رۆژنامەکانی نیویۆرکو گێژاوێکی زۆری دروستکرد(٤٣).

**سێیەم**: رۆڵی رۆژنامەو چاپکراوەکان لە وروژاندنی رای گشتی ئەمەریکیو هاندانی حکومەت بۆ بەرپاکردنی جەنگ دژ بە ئیسپانیا، بە تایبەت لەلایەن قەیسەری رۆژنامەنووسان جۆزیف پۆلیتزێرو ولیام واندۆن هیرست(٤٤).

**چوارەم**: بڵاوبوونەوەی کتێبێکی بەناوبانگی(ئەلفرید تایەر ماهان) دەربارەی کاریگەری دەسەڵاتی دەریایی لە مێژوودا، ئەو کتێبە بوونی هێزێکی دەریای ئامادەباشی زۆر بە پێویست نرخاندو دەسەڵاتی ئابووریو سیاسیی ئایندەی هەر وڵاتێکی لەبوونی هێزی دەریایی کۆکردەوەو پەرەگرتنی بازاڕە ئابوورییەکانی دەرەوەشی هەر بۆ ئەو مەرجە گەڕاندەوە(٤٥).

**پێنجەم**: هاوسۆزیی ئەمەریکی بۆ ئێشو ئازارەکانی دانیشتوانی کوبا(٤٦).

**شەشەم**: ئارەزووی هەندێك لە ئەمەریکییەکان بۆ بەگەڕخستنی سەرمایەکانیان لە کوبا، کە ئەو وڵاتە بە پیشەسازی قامیشی شەکر بەناوبانگە(٤٧).

**حەوتەم**: هەڵکەوتەی ستراتیژیی کوبا، کە دەسەڵاتی بەسەر دەروازەی دەریای کاریبیدا دەشکێتەوە(٤٨).

**هەشتەم**: ئارەزووی ئەمەریکییەکان لە وەچەرخانی ئایینزای کوبا لەکاسۆلیکەوە بۆ پرۆتستانتیو هێنانە کایەی نەتەوەیەکی پرۆتستانتی لە کوباو

فلیپین‌و ناوچەی دی[٤٩].

دوێیەم: تەقینەوەی کەشتییەکی ئەمەریکی بەنێوی "مەین"، کە (٢٦٠) دەریاوانی تێدا بوو لە بەندەری (هاڤانا)و تۆمەتبارکردنی ئیسپانیا بەو رووداوە[٥٠].

مەکینلی لە (١٢ی نیسانی ١٨٩٨)دا، لەژێر فشاری وتارەکانی سیناتۆرەکانی لایەنگری شەڕو رای گشتی، جەنگی دژ بە ئیسپانیا راگەیاند. ئەو جەنگە هەر لە سەرەتاوە ناهاوسەنگی هێزەکانی تێدا دەرکەوت. بۆیە خێراو بە ماوەیەکی کورت کۆتایی هات[٥١]. بەرەکانی جەنگ بریتیبوون لە دوو بەرەی سەرەکی (کوباو فلیپین). کەشتیگەلی ئەمەریکی لە کوبا توانی سەرکەوتنی گەورە لە (سانتیاگۆ) بەدەست بهێنێت‌و کوبا بخاتە ژێر دەستەوە. هەرچی بەرەی فلیپین بوو رووبەڕووبوونەوەی سەرەکی لە (مانێلا) بوو، هێزە دەریاییەکانی ئەمەریکی بە ماوەیەکی کەم توانیان گەلەکەشتی ئیسپانیا تێك بشکێنن‌و ئەو ولاتە داگیر بکەن[٥٢].

جەنگی ئیسپانی– ئەمەریکی سەد رۆژی خایاند. بە "پەیماننامەی پاریس" لە (١٠ی کانوونی یەکەمی ١٨٩٨) کۆتایی پێهات[٥٣]. لەو ئاکامەدا ناوچەکانی (کوبا، فلیپین، پورتۆریکۆ، دوورگەکانی گووام‌و وەیك لە زەریای هێمن) بوونە ناوچەی دەسەلاتی ولاتە یەکگرتوەکان[٥٤].

– سیاسەت بەرامبەر بە رۆژهەلاتی دوور:

پەیوەندییەکانی ولاتە یەکگرتووەکان بە رۆژهەلاتی دوور بۆ سەردەمێکی زووتر دەگەڕایەوە، کە لە رێگەی بازرگانی هاتبووە ئارا. یەکەم پەیوەندی فەرمی لە نێوانیان سالی (١٨٤٤) هاتە کایە، کاتێك پەیماننامەی "وانغیا"یان مۆرکرد لە سەرەنجامی جەنگی (ئەفیون)ی بە ناوبانگ لە نێوان بریتانیاو چین(١٨٣٩–

١٨٤٢)[٥٥]. حکومەتی ئەمەریکی لە پەیوەندییە دیپلۆماسییەکانی هەمیشە جەختی لەسەر یەکسانبوون، لە مافو جیاووکە بازرگانییەکان دەکردەوە، کە دەبەخشرایە ولاتان.

لەم بارەوە یەکەم هێماو ئاماژە دوای جەنگی ئیسپانی-ئەمەریکی، سەرهەڵدانی ئاراستەیەکی نوێی دیپلۆماسی بوو لە کاروباری جیهانیدا، ئەویش راگەیاندنی سیاسەتی (دەروازەی والا) بوو (Open Door)[٥٦] لە لایەن دەسەلاتدارە ئەمەریکییەکانەوە.

لە تشرینی دووەمی (١٨٩٩)دا "جۆن های" وەزیری هەندەرانی ئەمەریکا یادداشتێکی ئاراستەی ولاتانی تایبەتمەندیدار کرد تاوەکو هەموو ولاتێك لە مافو جیاووکەکانی ولاتی (چین) یەکسان بێت بەبێ پاوانکاریو جیاخوازی[٥٧]. واتە بەو مانایەی لە دەرفەتی بازرگانیو پێناسی گومرگیو رەسمی بەندەرەکانو نرخی بەکارهێنانی هێڵی ئاسنین، یەکسانیو دادپەروەری هەبێت لە هەموو ئەو ناوچانەی (فەرەنسا، بریتانیا، ئەڵمانیا، ئیتالیا، ژاپۆنو رووسیا) سەرپەرشتی دەکەن[٥٨].

لە راستیدا، ئەو سیاسەتە دوو بنەماو پێکهاتەی لەخۆ دەگرت:

**یەکەم:** پاراستنی سەربەخۆیی (چین) بەرامبەر بەدەست درێژییە هەرێمییەکان.

**دووەم:** یەکسانی لە هەڵسوکەوتو مامەڵە لە بەرامبەر ولاتە بیانییەکانو مافەکانیان لە (چین)[٥٩]. چونکە (چین) ببوە ئامانجێکی گەورەی هەوڵە فراوانخوازییە هەرێمییەکانی هەریەك لە ژاپۆنو رووسیا[٦٠].

ولاتە یەکگرتووەکان لەمیانەی ئەو سیاسەتەوە ویستی بەشێوەیەکی تەدریجی بە رووی جیهانی دەرەوەدا بکرێتەوەو دەست لە کاروباری ولاتانی

رۆژهەڵاتی دوور وەربدات[٦١]. ئەوەی ئەو مەرامو سیاسەتەی رژدتر دەکرد وجودی وڵاتە یەککگرتووەکان بوو لە فلیپینو دوورگەکانی گووامو وەیك لە زەریای هێمن، کە وەك بنکەیەکی دەریایی بەکاری دەهێنان.

دەبێت ئەوەش بوترێت، پاڵنەری سەرەکیو جەختی بەردەوامو توندی ئەمەریکا لە پیادەکردنو گرتنەبەری سیاسەتی (دەروازەی واڵا)، بریتیبوو لە کۆششی لێبڕاوانە بۆ بەدەستهێنانی بازاڕی نوێ لەپێناو ساغکردنەوەی بەرهەمە پیشەسازییەکانی[٦٢].

چینییەکان لەساڵی (١٩٠٠)دا، دژ بە نفووزو دەسەڵاتی ئیمپریالیستانەی وڵاتانی بیانی راپەڕین[٦٣]. (جۆن های) هەر زوو بۆ وڵاتانی روونکردەوە کە بەرەنگاری هەر جووڵانەوەیەك دەکات دەست درێژی بکاتە سەر مافە هەرێمییەکانی (چین) یان ببێتە مایەی هەڕەشە لەسەر لایەنی کارگێڕیو سیاسیی بنەمای (دەروازەی واڵا). پاش دامرکاندنەوەی شۆڕشی چینی، (جۆن های) زۆر زرنگانە کەوتە جێبەجێکردنی بەرنامەی ئەمەریکیو پارێزگاری لە (چین)[٦٤]. لە مانگی تشرینی یەکەمی (١٩٠٠)دا، هەر یەك لە وڵاتانی بریتانیاو ئەڵمانیا جەختیان لەسەر سیاسەتی (دەروازەی واڵا) کردەوەو دواتریش وڵاتانی دیکە هەمان هەنگاویان هەڵنا[٦٥].

ئەنجامەکان

لێکۆڵینەوەکە، پاش لەبەریەکنانی سەرچاوەکان و شەنوکەوکردنی زانیارییە مێژووییە جنگکەوتووەکان، گەیشتە چەند ئەنجامگیرییەك، کە لە خوارەوەدا پوختەکەی خراوەتە روو:

*ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سەردەمی سەرۆکایەتی (ولیام مەکێنلی)دا، لە ئەنجامی ئەو بۆچوونە ئابووریو هەلۆێستانەی مەکێنلیو کۆمارییەکان نواندیان، هەر لە چەسپاندنی سەنگی (زێڕ) بۆ دراوی ولاتو لایەنگیری لە سیستەمی سەرمایەداریو جەختکردنەوە لەسەر سیاسەتی (پێناسی بەرز)و دەرکردنی قانوونی (عەیاری زێڕ)، پەرەسەندنێکی گەورەی ئابووری بەخۆوە بینی.

*پەرەسەندنی لایەنی کۆمەلایەتیو کەمبوونەوەی بێکاری لە ئەنجامی نەمانی قەیرانی ئابووریی ساڵی(١٨٩٣)و راگرتنی کۆچی ئەورووپیو بەدەستخستنی مافە سەرەکییەکان لەلایەن کرێکارانەوە.

*پەرەسەندنی فراوانخوازییە هەرێمیو نێودەولتییەکانی ئەمەریکا لە ئاکامی گەشەکردنێکی کەم هاوتەی ئابووریی ئەمەریکاو پێویستی لەرادەبەردەر بۆ دۆزینەوەی بازاڕی نوێی ئابووری بە مەبەستی ساغکردنەوەی بەرهەمە پیشەسازییەکان.

*هەلپەی حکومەتو کۆمەلگەی ئەمەریکی بۆ بەرپاکردنی جەنگ دژ بە ئیسپانیا لەپای فراوانخوازی ئیستیعماریو سوودی ئابووری لە رووی وەبەرهێنانی سەرمایەی ئەمەریکی لە کوبادا، کە ئەو ولاتە بە پیشەسازی قامیشی شەکر بەناوبانگ بوو.

*پیادەکردنی سیاسەتی (دەروازەی والا) تەنیا بۆ دەستێوەردان لە کاروباری ولاتانی رۆژهەلات دوور نەبوو، بەلکو کۆششی لێبڕاوانەیان بۆ پەیداکردنی بازاڕی نوێی ئابووری بوو لەو ناوچانەدا.

پەراوێزەکان:

١- دەربارە بڕوانە: جیمس م. ماكفيرسون، ابراهام لنكولن و الثورة الاميريكية الثانية، ترجمة فايزة حكيم و أحمد منيب، ط١، القاهرة، ٢٠٠١.

٢- آلان نيفينز و هنري ستيل كوماضر، موجز تاريخ الولايات المتحدة ، الجزء الثاني، ترجمة: محمد بدرالدين خليل، دار المعارف مصر، ١٩٧٦، صص٢٢٢-٢٢٣.

٣- مكتب الولايات المتحدة للاستعلامات، موجز التاريخ الامريكي، القاهرة، دون سنة الطبع، صص١٢٠-١٣٢.

٤- ستيفن فنسنت بنيه، امريكا، ترجمة: عبدالعزيز عبدالمجيد، مكتب الولايات المتحدة للاستعلامات، القاهرة، ١٩٤٥، صص١٣٣-١٤٦.

٥- كارلهاينتس دشنر، المولوخ: إله الشر (تاريخ الولايات المتحدة)، ترجمة: محمد جديد، ط٢، دار قدمس للنشر و التوزيع، دمشق، ٢٠٠٤، ص٢٢٧.

٦- آلان نيفينز و هنري ستيل كوماضر، م.س، ج٢، صص٢٢٢-٢٢٣.

٧- www.en.wikipedea.org

٨- www.infoplease.com, www.spanamwar.com

٩- www.en.wikipedea.org

١٠- لە دیارترین بەشدارییەکانی جەنگی(ئەنتیتام)ە کە لە ساڵی (١٨٦٢)دا ڕوویدا. بڕوانە:

-Johon Whiteclay Chambers II and other editors, American military history. oxford university press, New York, ١٩٩٩, P.٤٢٤.

١١-www.infoplease.com

١٢-www.projects.vassar.edu

١٣-www.infoplease.com

١٤-www.en.wikipedea.org, www.projects.vassar.edu

١٥-www.Whitehouse.gov

١٦- آلان بالمر، موسوعة التاريخ الحديث (١٧٨٩-١٩٤٥)، الجزء الثاني، ترجمة: سوسن فيصل السامر و يوسف محمدأمين، دار المأمون للترجمة والنشر، بغداد، ١٩٩٢، ص٧٣.

١٧- www.trutv.com

١٨- اسماعيل أحمد ياغي، معالم التاريخ الامريكي الحديث (نشأة الولايات المتحدة الامريكية)، ط١، مكتبة العبيكان، الرياض، ٢٠٠١، ص٢٢٩.

١٩- آلان بالمر، م.س، ج٢، ص٧٣.

٢٠- www.independent.co.uk

٢١-www.spanamwar.com

٢٢-www.independent.co.uk

٢٣- www.mckinleydeath.com

٢٤- بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە تەوەری دووەم لەم لێكۆڵینەوەیە، جەنگی ئیسپانیا- ئەمەریكا (١٨٩٨).

٢٥- فریشتە نورانی، مێژووی گۆڕانكاریی كۆمەڵایەتیو سیاسی ئەمەریكا، (و: هەورامان فەریق كریم)، چ١، دەزگای تویژینەوەو بڵاوكردنەوەی موكریانی، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٧٩.

٢٦- بڕوانە: كلود جوليان، الحلم والتاريخ أو مئتا عام من تاريخ امريكا، ترجمة: نخلة كلاوس، مطبعة وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٧٨، ص١٥٤، كارلتون هيز، التاريخ الاوروبي الحديث (١٧٨٩-١٩١٤)، ترجمة: د. فاضل حسين، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٨٧، ص٢٣٦.

٢٧- كلود جوليان، م.ن، ص١٤٧.

٢٨- For more details, see: John and Gwenneth stokes, Europe and the Modern World (١٨٧٠-١٩٨٣), second edition, Longman Group Limited, Great Britain, ١٩٨٤, P.٦٧-٦٨.

٢٩- فریشتە نورانی، س.ث، ل١٧٩-١٨٠.

٣٠- آلان نيڤينز و هنري ستيل كوماضر، م.س، ج٢، ص٣٢٥.

٣١-John and Gwenneth stokes, Ibid., P. ٦٧.

٣٢- بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: يواخيم فرناو، رحمتك يا الله (صفحات مجهولة في تاريخ امريكا)، تعريب: ميشيل كيلو، الحوار الثقافي، لبنان، ٢٠٠٣، ص ٢٤٧-٢٥٢.

٣٣- كارلتون هيز، م.س، ص٢٣٧.

٣٤- See: John Rhodehamel, George Washington (writings), First

Printing, the Library of America, New York, ١٩٩٧, P. ٩٢٩-٩٨٥.

٣٥- بڕوانە: آلان نيڤينز وهنري ستيل كوماضر، م.س، ج١، صص١٤٩-١٥٠.

٣٦- كارلتون هيز، م.س، صص٢٢٢-٢٢٥-٢٢٧، د.عبدالمجيد نعنعي، تاريخ الولايات المتحدة الامريكية، دار النهظة العربية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٣، ص١٤٨.

٣٧- د. حسين شريف، السياسة الخارجية الامريكية ( اتجاهاتها و تطبيقهاتها وتحدياتها)، الجزء الثاني، مطابع الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٤، ص٣١.

٣٨- جابرييل إيه. ألموند و جي. بنجهام باويل الابن، السياسات المقارنة في وقتنا الحاضر، ترجمة: هاشم عبدالله، الاهلية للنشر والتوزيع، ط١، عمان، ١٩٩٨، ص٩٥٢.

٣٩- دوغلاس ك. ستيظنسون، الحياة و المؤسسات الامريكية، ترجمة: أمل سعيد، ط١، الاهلية للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠١، صص١٨١-١٨٢.

٤٠- كارلتون هيز ، م.س، ص٢٤٦.

٤١- د.عبدالمجيد نعنعي، م.س، صص١٥١-١٥٢.

٤٢-Oscar Handlin, The History of the United States, vol: ٢, Harvard University Press, P. ٢٥٥-٢٥٧.

٤٣- فريشتە نورائی، س.ث، ل١٧٦.

٤٤- کارلهاینتس دشنر، م.س، ص٢٣٦، www.en.wikipedea.org

٤٥- فريشتە نورائی، س.ث، ل١٧٦.

٤٦- www.ushistory.org

٤٧- د. جلال يحيى، معالم التاريخ الحديث، منشأة المعارف، الاسكندرية، ١٩٧٦، ص٤٣٢.

٤٨- R.R. Palmer and Others, A History of the Modern World, Ninth edition, McCraw Hill press, New York, ٢٠٠٢, P.٦٢٥.

٤٩-www.historicaltextarchive.com

٥٠- آلان بالمر، م.س، ج٢، ص٢٢٨.

٥١- هێزە دەریاییەکانی ولاتە یەکگرتووەکان لەو سەردەمەدا، لە دوای بریتانیاو ئەڵمانیا، بە سێیەم گەورەترین هێزی جیهان دەژمێردرا. بڕوانە: کالهاینتس دشنر، م.س، ص٢٣٨.

٥٢- د. أحمد خليل محمودي، معالم التاريخ الاميركي الحديث والمعاصر، ط١، دار المواسم للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت، ٢٠٠٥، صص٦٨-٦٩.

٥٣- www.Whitehouse.org, www.Ushistory.org

٥٤- علي حيدر سليمان، تاريخ الحضارة اوروبية الحديث، دون مكان و سنة الطبع، صص٤٩١-٤٩٢.

٥٥-www.lotsofessays.com

٥٦- كارلتون هيز، م.س، ص٢٤٧.

٥٧- An Outline of American History, Distributed by the United State Information Service, ١٩٥٣. P.١١٤.

٥٨- www.en.wikipedea.org

٥٩- www.answers.com, www.lotsofessays.com

٦٠- بڕوانە: د.صباح محمود محمد، الشؤون الصينية، الجزء الأول، الجامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٤، ص٤٢.

٦١- د. اسماعيل أحمد ياغي، م.س، ص١٨٢.

٦٢- فريشتە نورائی، س.ث، ل١٧٨.

٦٣- دەربارەی بڕوانە: صباح محمود محمد، م.س، صص٤٣-٤٤، د. جلال يحيى، م.س، صص٤٣٢-٤٣٣.

٦٤- مكتب الولايات المتحدة للاستعلامات، م.س، ص١٣٤.

٦٥- An Outline of American History, Ibid. P.١١٤.

ژێدەرو سەرچاوەکان:

یەکەم/ سەرچاوە کوردییەکان:

● فریشتة نورائي، مێژووی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیو سیاسی ئەمەریکا، (و: هەورامان فەریق کریم)، چ١، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٧.

دووەم سەرچاوە عەرەبییەکان

● د. أحمد خليل محمودي، معالم التاريخ الاميركي الحديث والمعاصر، ط١، دار المواسم للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت، ٢٠٠٥.

● د. اسماعيل أحمد ياغي، معالم التاريخ الامريكي الحديث (نشأة الولايات المتحدة الامريكية)، ط١، مكتبة العبيكان، الرياض، ٢٠٠١.

● آلان بالمر، موسوعة التاريخ الحديث (١٧٨٩-١٩٤٥)، الجزء الثاني، ترجمة: سوسن فيصل السامر و يوسف محمدأمين، دار المأمون للترجمة والنشر، بغداد، ١٩٩٢.

● آلان نيظينز و هنري ستيل كوماضر، موجز تاريخ الولايات المتحدة ، ترجمة: محمد بدرالدين خليل، دار المعارف مصر، ١٩٧٦. الجزئين الاول والثاني.

● جابرييل إيه. ألموند و جي. بنجهام باويل الابن، السياسات المقارنة في وقتنا الحاضر، ترجمة: هاشم عبدالله، الاهلية للنشر والتوزيع، ط١، عمان، ١٩٩٨.

● د. جلال يحيى، معالم التاريخ الحديث، منشأة المعارف، الاسكندرية، ١٩٧٦.

● جيمس م. ماكفيرسون، ابراهام لنكولن و الثورة الاميريكية الثانية، ترجمة فايزة حكيم و أحمد منيب، ط١، القاهرة، ٢٠٠١.

● د. حسين شريف، السياسة الخارجية الامريكية ( اتجاهاتها و تطبيقهاتها وتحدياتها)، الجزء الثاني، مطابع الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٤.

● دوغلاس ك. ستيظنسون، الحياة و المؤسسات الامريكية، ترجمة: أمل سعيد، ط١، الاهلية

للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠١.

- ستيفن فنسنت بنيه، امريكا، ترجمة: عبدالعزيز عبدالمجيد، مكتب الولايات المتحدة للاستعلامات، القاهرة، ١٩٤٥.
- د.صباح محمود محمد، الشؤون الصينية، الجزء الأول، الجامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٤.
- د.عبدالمجيد نعنعي، تاريخ الولايات المتحدة الامريكية، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٣.
- علي حيدر سليمان، تاريخ الحضارة اوروبية الحديث، دون مكان و سنة الطبع.
- كارلتون هيز، التاريخ الاوروبي الحديث (١٧٨٩-١٩١٤)، ترجمة: د. فاضل حسين، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٨٧.
- كارلهاينتس دشنر، المولوخ: إله الشر (تاريخ الولايات المتحدة)، ترجمة: محمد جديد، ط٢، دار قدمس للنشر و التوزيع، دمشق، ٢٠٠٤.
- كلود جوليان، الحلم والتاريخ أو مئتا عام من تاريخ امريكا، ترجمة: نخلة كلاوس، مطبعة وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٧٨.
- مكتب الولايات المتحدة للاستعلامات، موجز التاريخ الامريكي، القاهرة، دون سنة الطبع.
- يواخيم فرناو، رحمتك يا الله (صفحات مجهولة في تاريخ امريكا)، تعريب: ميشيل كيلو، الحوار الثقافي، لبنان، ٢٠٠٣.

سێیەم/ سەرچاوە ئینگلیزییەکان:

- An Outline of American History, Distributed by the United State Information Service, ١٩٥٣.
- John and Gwenneth stokes, Europe and the Modern World (١٨٧٠-١٩٨٣), second edition, Longman Group Limited, Great

Britain, ١٩٨٤.

• John Rhodehamel, George Washington (writings), First Printing, the Library of America, New York, ١٩٩٧.

• Johon Whiteclay Chambers II and other editors, American military history, oxford university press, New York, ١٩٩٩.

• Oscar Handlin, The History of the United States, vol: ٢, Harvard University Press.

• R.R. Palmer and Others, A History of the Modern World, Ninth edition, McCraw Hill press, New York, ٢٠٠٢.

چوارەم/ زانیاریی تۆڕی ئینتەرنێت:


- www.answers.com
- www.en.wikipedea.org
- www.historicaltextarchive.com
- www.independent.co.uk
- www.infoplease.com
- www.lotsofessays.com
- www.mckinleydeath.com
- www.projects.vassar.edu
- www.spanamwar.com
- www.trutv.com
- www.ushistory.org
- www.Whitehouse.gov

# دەوڵەتی سەفەوی لە سەردەمی شا تەهماسبی یەکەم دا

## ( ١٥٢٤ ـ ١٥٧٦ )

بورهان حاتەم گۆمەتاڵی

پێشەکی:

دەوڵـەتی سـەفەوی یەکێکـە لـە دەوڵەتـە مەزنـەکان لـە مێـژووی ئێرانـداو توانیویەتی بۆ ماوەی نزیکەی دوو سەدەو چارەگێک فـەرمانڕەوایی ئێـران بکـات. تەهماسب یەکێکە لەو شایانەی سەفەوی درێـژترین مـاوەی جڵـەوی حـوکمی ئـەو دەوڵەتەی گرتۆتـە دەسـت کـە توانیویـەتی ٥٣ سـاڵ فـەرمانڕەوایی سـەفەویەکان بکات. بۆیە توێژینەوە لەبارەی بارودۆخی سەردەمی ئـەو بایـەخی تایبـەتی خـۆی هەیە، بەتایبەتی کە لەو سەردەمەدا دەوڵەتی سەفەوی چەندین گۆڕانکاری لەسـەر ئاستی ناوخۆو دەرەوەدا بەخۆوە بینی. بـۆ نوسـینی ئـەم توێژینەوەیـە پـشت بـە چەند سەرچاوەیەکی جیا جیا بەستراوە، بەڵام بەتایبەتی سوودێکی زۆر لە بـەرگی سێیەمی کتێبـە پـڕ بایەخەکـەی د. حەسـەن جـاف (الـوجیز فـی تـاریخ ایـران) وەرگـیراوە، کـە مێژوونووسـی نـاوبراو بـە شـێوەیەکی ئەکادیمیانـە ووردەکـاری ڕووداوەکانی ماوەی دەوڵەتی سەفەوی خـستۆتە ڕوو. جگـە لەمـە زانیـاری زۆر لـە کتێبی (تاریخ الشعوب الاسلامیة فی العصر الحدیث) ی د. عبدالعزیز سلیمان نـوار وەرگیراوە.

ئەم توێژینەوەیە لـە چوار تـەوەرەی سـەرەکی پێـك هـاتووە، لـە تـەوەرەی یەکەمدا ژیاننامـەو هاتنـە سـەر دەسـەڵاتی وململانێـی و ڕۆڵـی هـۆزە قزڵباشـەکان لەسەرەتای فـەرمانڕەوایی ئـەودا خراوەتـە ڕوو، لـە تـەوەرەی دووەمیـشدا تیـشك

خراوەتە سەر شەڕو ململانێکانی شا تەهماسب لەگەڵ هەریەك لە ئۆزبەگەکان لە ڕۆژهەڵات و عوسمانیەکان لە ڕۆژئاوا، هەرچی تەوەرەی سێیەمە ئەوە بە کورتی باس لە پەیوەندیە دەرەکیەکانی تەهماسب لەگەڵ هەریەك لە وولاتانی پورتوگال و روسیاو بەریتانیا کراوە، لە دوا تەوەرەشدا کە تەوەرەی چوارەمە ڕۆڵی شا تەهماسب لە بەهێزکردنی دامەزراوەی دینی ڕوون کراوەتەوەو دواتریش باس لە کۆتاییەکانی حوکمی ناوبراو کراوە. دیارە هیچ کارێکی مرۆڤ بێ کەم و کوڕی تەواو نابێت و لەم سۆنگەیەوە ئەم کارەش لە هەڵەو کەم و کوڕی بەدەر نیە.

## تەوەرەی یەکەم

## ژیاننامەو دەسەلآت گرتنە دەستی شا تەهماسب :

١- ژیاننامەو کەسایەتی شا تەهماسب

تەهماسبی یەکەم (ابو الفتح) کوڕە گەورەی شا ئیسماعیلی سەفەوی (١٥٠١-١٥٢٤ز) ، لە ڕۆژی چوارشەممە ٢٦ی ذولحیجەی ٩١٩ك / ٢٢ی شوباتی ١٥١٤ز لە شاهئابادی ناوچەی ئەسفەهان لەدایك بووە[١] . لەبەر ئەوەی لە تەمەنێکی زۆر بچوکەوە جڵەوی دەسەلآتی وەرگرتووەو ژیانی لە نێو حەرەمسەراکاندا بردۆتە سەر، بۆیە زانیاری وورد لەبارەی ژیانی تایبەتی ئەو بەرچاو ناکەوێت، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەچەندین خەسڵەت و تایبەتمەندی ئەو دەکەن .

یەکێك لەو خەسڵەتانەی شا تەهماسب کە باسی لێوەکراوە ئازایەتیە، هەرچەندە هەندێك لە سەرچاوە ئەوروپیەکان بە پێچەوانەوە باسیان لەم لایەنەی کردووەو بە کەسێکی ترسنۆك وەسفیان کردووە، بەلآم لە ڕێگەی ڕووداوە مێژووییەکانەوە ڕاستی ئەم مەسەلەیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە . یەکێك لەو ڕووداوانەش خۆڕاگری شا تەهماسبە لە شەری (جام)[٢] کە ئەو کات تەمەنی ١٤

ساڵان بووە، هەرچەندە لەو شەڕەدا زۆربەی هێزەکانی سەفەوی بە هێزەکانی قزڵباشیشەوە مەیدانی شەڕیان چۆڵکرد، بەڵام تەهماسب بە تەنیا خۆی ڕاگرت و شەڕی کرد[٣] .

سەرچاوەیەکی مێژوویی ئاماژە بەوە دەکات کە شا تەهماسب لە تەمەنی ١٩ ساڵیەوە وازی لە خۆشیەکانی ژیان هێناوەو لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا وازی لە مەی خواردنەوە هێناوەو تەنانەت مەیخانەو شوێنی قومارو خراپەکاری لە وولاتی ئێران داخستووە[٤]. لە هەمان کاتدا کەسێکی بەرچاوتەنگ بووەو زۆر ئارەزووی لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان بووە تەنانەت وەکو چەرچیەك زێڕو جەوهەراتی کڕیوەو فرۆشتووە، سەرچاوەیەك لەبارەی چاوچنۆکی شاوە دەڵێت : ((لەوەتەی ئیسلام سەری هەڵداوە، هیچ پاشایەك لە هیچ دەورو ڕۆژگارێکدا ئەوەندەی شا تەهماسب هەوڵی نەداوە بۆ لەسەر یەك هەڵدانەوەی پارەو کاڵاو قوماش و کەل و پەل و قاپ و قاچاغی زێڕو هەورو هاڵی زیو[٥])) . شا تەهماسب ئارەزووی لە کاروباری هونەری بووەو ، لە تافی لاوێتیدا خۆی بە فێربوونی هونەری نیگارکێشیەوە خەریك دەکرد، وە هاوکارو پشتیوانێکی چاکی هونەرمەندان بوو، هەر بەو هۆیەشەوە هونەر بەشێوەیەکی گشتی لەسەردەمی ئەودا بەرەو پێشڤەچوونێکی باشی بەخۆیەوە بینی[٦].

## ٢-دەسەڵات گرتنە دەستی شا تەهماسب و ململانێی هۆزە قزڵباشەکان

دوا بەدوای مردنی شا ئیسماعیلی سەفەوی لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا، کە بە دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوی دادەنرێت لە ساڵی ١٥٢٤ز کە بیست و چوار ساڵ حوکمڕانی ئێرانی کرد، لەدوای خۆی چوار کوڕی بە جێهێشت کە ئەوانیش (سام میرزاو بەهرام میرزاو قاس میرزاو تەهماسب میرزا) بوون کە ئەوەی کۆتاییان کوڕە گەورەی بوو[٧]، بۆیە وەکو نەریتێکی ڕژێمی پاشایەتی کە دەبێ کوڕی گەورە

جێگای باوکی لە پاشایەتیدا بگرێتەوە، ئەوەبوو کە تەهماسب لە تەمەنێکی بچووکدا کە ئەو کات تەمەنی تەنیا دە ساڵان دەبوو جڵەوی پاشایەتی ئێرانی لە ساڵی ١٥٢٤زدا وەرگرت[٨].

بەهۆی تەمەن بچووکی شاوە نەیدەتوانی کاروباری دەوڵەت بەڕێوەبەرێت، بۆیە پێویستی بە یەکێك هەبوو کە چاودێری بکات و هاوکاری بێت بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکان کە ئەو کەسەش پێی دەگوترێ بریکار یا چاودێریکەری شا [٩]. زۆربەی هۆزەکانی ئەوکاتی ئێران هەوڵیان دەدا کە ئەو پلەیە بەدەست بهێنن، دیارە ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەرکەسێك ئەگەر ئەو پلەیەی وەرگرتایە دەسەڵاتی ڕاستەقینەی وولاتی ئێرانی دەکەوتە دەستیەوە[١٠]، هۆزە تورکە قزڵباشەکان[١١] کەوتنە ململانێیەکی سەخت بۆ وەرگرتنی پلەی بریکاری پاشا ئەمەش کاتێ هەستیان کرد کە دەسەڵاتی ئێرانیەکان لەسەر حسێبی ئەوان بەهێز دەبێ و جڵەوی دەسەڵاتی ئێران دەکەوێتە دەستیانەوە[١٢] ، بۆیە لە سەرەتادا شا تەهماسب دەسەڵاتی ڕاستەقینەی لەژێر دەستدا نەبوو، بەڵکو بۆ ماوەی دە ساڵی ڕەبەق (١٥٢٤-١٥٣٤ز) هۆزەکانی قزڵباش بچووکی و لاوازی شایان قۆزتەوەو حوکمڕانی وولاتی ئێرانیان گرتە دەست[١٣] .

بەڵام بۆ وەرگرتنی پایەی لەلە (وکیل)ی پاشا قزڵباشەکان چەندین شەڕی خوێناویان لەنێودا قەوما، سەرەتاش (دێو سوڵتان) ی سەرکردەی هۆزی ڕۆملوی قزڵباش لەلەی شا تەهماسبی وەرگرت، ئەمەش بە پێی وەسیەتنامەی شا ئیسماعیل بوو کە بەو پێیە کرابووە سەرکردەی هێزە چەکدارەکان و پلەی لەلەی شا تەهماسبیشی پێدرابوو[١٤]. هەرچەندە سەرەتا تا ڕادەیەك هۆزە قزڵباشەکانی تری نێو ئێران وەکو ئوستاجلۆو تەکەلوەکان بە لەلەی دێو سوڵتان ڕازی بوون، چونکە دێو سوڵتان لەگەڵ سەرکردەی هەردوو هۆزەکەی تر (کۆپەك سوڵتان) ی ئوستاجلۆو (چووها سوڵتان) ی تەکەلو لەسەر ئەوە ڕێك کەوتبوون کە بەیەکەوە

زاڵبوونی خۆیان بەسەر دەسەڵاتی شادا بسەپێنن و حوکمی ئێران بگرنە دەست و نەهێڵن فارسەکان دەسەڵاتیان بکەوێتە دەست، بەڵام دیارە دواتر دێو سوڵتان ئەوانی تری بەلاناوەو بە تەنیا خۆی جڵەوی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست کە ئەمەش بۆتە مایەی شەڕو ئاژاوە لە نێوان هۆزەکاندا[١٥] .

ئەوەبوو سەرەتاش شەڕی نێوان ئۆستاجلۆو ڕۆملوەکان لە ١٥٢٦–١٥٢٧ز دەستی پێکردو لەچەند شەڕێکدا ئوستاجلوەکان تێکشکان و سەرکردەکەیان کۆپەك سوڵتانیش کوژرا، بەڵام لە ساڵی ١٥٢٧ز دەسەڵاتی ڕۆملوەکان بە کوژرانی دێو سوڵتانی سەرکردەکەیانەوە لەلایەن شا تەهماسب کۆتایی پێهات کە ئەمەش بە فیتی تەکەلوەکان بوو، بۆیە لەم ساڵە بەدواوە چووها سوڵتانی تەکەلو بووە لەلەی پاشاو دەسەڵاتی ڕاستەقینەی ئێرانی گرتە دەست[١٦]، بەڵام دەسەڵاتی تەکەلوەکان بەسەر تەختی سەفەوی ماوەیەکی درێژی نەخایاندو لە سێ ساڵی تێپەڕ نەکرد (١٥٢٧–١٥٣٠ز)[١٧]، لە ئەنجامی سەربزێویەکانی چووها سوڵتان وياخی بوونی تەکەلوەکان بە تایبەتی دوای هەوڵدانیان بۆ ڕفاندنی پاشاو دەست گرتنیان بەسەر تەورێزی پایتەختدا ، شا تەهماسب لە ساڵی ١٥٣٠ز بڕیاری قڕکردنی تەکەلوەکانیداو لە چەندین شەڕدا ژمارەیەکی زۆری لێکوشتن کە سەرچاوە مێژوویيەکان بەم ماوەیە دەڵێن: (افت تکلويان) بە واتای کارەساتی تەکەلوەکان[١٨] .

سەرباری ئەمەش تەکەلوەکان ڕووبەڕووی شەڕی هۆزی شاملوەکان بوونەوەو حوسێن خانی سەرکردەی شاملوەکان کە خزمی شا بوو ئەو کات حوکمی شاری هیراتی[١٩] دەکردو، لە چەند ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەربازیدا توانی هێزەکانی تەکەلو تێکبشکێنێت و چووهە سوڵتانی سەرخێڵیان بکوژێت[٢٠]. بەم شێوەیە حوسێن خان توانی بریکاری شا وەربگرێت و ڕەزامەندی میرە قزڵباشەکانیش بەدەست بهێنێت[٢١]، بەڵام بەهۆی تاوانبار کردنی حوسێن خان بە پیلان گێڕان لە

دژی شاو دەست تێکەڵکردنی لەگەڵ عوسمانیەکان لە ساڵی ١٥٣٣ز شا ئەویشی کوشت[٢٢]، بەم شێوەیە دوای سێ ساڵ (١٥٣٠-١٥٣٣ز) لە دەسەڵاتی شاملوەکان ئەوانیش کۆتایی بە دەسەڵاتیان هات، بە کوشتنی حوسێن خان کە فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی ئێران بوو شا توانی دەسەڵات بۆ خۆی بگەڕێنێتەوە بە تایبەت کە ئەو کات گەیشتبووە تەمەنی ١٩ ساڵان، وە دەسەڵاتی قزڵباشەکانی بە تەواوی لاواز کردو پایەی لەلەی شای لە قزڵباشەکان سەندەوەو دایە فارسەکان وەتا مردنی شا تەهماسب لە ساڵی (١٥٧٦ز) بە لاوازی مانەوە[٢٣]. جگە لە مەترسی قزڵباشەکان لەسەر دەسەڵاتی پاشا ئەوە چەندین یاخی بوون و ڕاپەڕینی مەترسیدار ناوچەکانی ئێرانیان گرتەوە، وەك ئەوەی کە لە ساڵی ١٥٣٥ز لە ناوچەی گەیلاندا ڕوویدا کە سەرکردەی (بیەبێش) توانی لەوێدا سەربەخۆیی خۆی ڕابگەیەنێت و لە دەوڵەتی ناوەندی جیابێتەوە، هەروەها لە ساڵی ١٥٤١ز ڕاپەڕینێکی میللی لە ناوچەی خوزستان دژی دەوڵەت هەڵگیرسا کە زێتر چینی هەژارو نەدارەکان بە پاڵپشتی بەرپرسە ناوخۆییەکان پێی هەستان[٢٤]. هەموو ئەمانە بوونە مایەی کۆسپ لەبەردەم هەنگاوەکانی شا تەهماسب بۆ بنیاتنانی دەوڵەتێکی بەهێز، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا توانی بەسەر بەشی زۆری ئەو کۆسپ و تەگەرانەدا زاڵ بێت.

## تەوەرەی دووەم

## شەڕەکانی تەهماسب دژ بە هەر یەك لە ئۆزبەگ و عوسمانیەکان

١-هەوڵەکانی تەهماسب بۆ لەناوبردنی ئۆزبەگەکان :

هەر لە سەرەتاکانی دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی ئۆزبەگەکان[٢٥] ڕووبەڕووی دەسەڵاتی شا ئیسماعیل بوونەوەو مەترسیەکی هەقیقیان لەسەر سنوری

ڕۆژهەڵاتی ئێران دروست کرد، بۆیە لەو کاتەوە وەکو دوژمنێکی سەرسەخت کەوتنە شەڕو ململانێ لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی. ئۆزبەگەکان هەستیان بەوە دەکرد کە بە هاتنە سەر دەسەڵاتی تەهماسب و هاندانی ئەوانەی دەوروبەری هێرش دەکرێتە سەریان، بۆیە بە ڕەچاوکردنی ڕێسای (چاکترین میکانیزم بۆ بەرگری لە خۆکردن هێرشکردنە)، (عبید الله خان) ی سەرۆکی هۆزەکانی ئۆزبەگ کە بە سەرکردەیەکی لێهاتوو و بوێر ناسراوە، بڕیاری دەستپێشخەری هێرشکردنی بۆ سەر دەوڵەتی سەفەویداو سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد بە بەشداری زۆربەی هۆزەکانی ئۆزبەگ و، لە ساڵی ١٥٢٨ز لە دەشتێك کە دەکەوێتە نێوان شاری هیراتی ئەفغانستان و خوراسانی ئێران شەڕی ((جام وزور ئاباد)) لە نێوان هەردوولادا قەوما[٢٦]. سەرەڕای بەهێزی و ئازایی ئۆزبەگەکان بەڵام هێزەکانی سەفەوی توانیان شکستیان پێ بهێنن، دیارە هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنی سەفەویەکان لەم شەڕەدا بۆ هەوڵەکانی تەهماسب دەگەڕێتەوە کە هەر لەسەرەتاوە (ئاینزای دوازدە ئیمامی شیعەی)[٢٧] کردە هاندەرێکی گرنگ بۆ جۆش و خرۆش خستنە نێو ڕیزەکانی سەفەوی و هانیدان بۆ شەڕ کردن لە دژی ئۆزبەگەکان کە خاوەنی ئاینزای سوننە بوون ئەمە لەلایەك، وەلەلایەکی ترەوە بایەخدانی تەهماسب بە چەکی ئاگرین بەتایبەتیش تۆپ کە لەو شەرانەدا دژ بە ئۆزبەگەکان بەکاری هێنا کاریگەریەکی مەزنی هەبوو لەسەر دەرەنجامی شەڕەکە کە لە بەرژەوەندی سەفەویەکان تەواو بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەهماسب نەیتوانی بە شێوەیەکی یەکجارەکی ئۆزبەگەکان کۆتایی پێبێنێت، چونکە دیارە ئەوە پێویستی بە خەرجیەکی بێ شومارو کۆششێکی نەپساو هەبوو کە ئەوەش لەو کاتەدا بۆ تەهماسب نەدەهاتە دی ئەمە جگە لە کێشەی (زولفوقار خانی کوردی) کە دەستی بەسەر شاری بەغدادا گرتبوو و ملکەچی خۆشی بۆ سوڵتانی عوسمانی دەبڕیبوو[٢٨].

ئۆزبەگەکان دوای شکستیان لەم شەڕە بەرەو ناوچەکانی (ما وراو النهر: ئەو ناوچانەی دەکەونە نێوان هەردوو ڕووباری جەیحۆن و سەیحۆن کە سەمەرقەندو بوخاراو خوارزم و چەند ناوچەیەکی تر دەگرێتەوە) هەڵاتن و خوراسان و هیراتیش بە شێوەیەکی کاتی لە دەستیان ڕزگاری بوو، هەر لە هەمان ساڵدا ئۆزبەگەکان چەندین هێرشی تریان کردە سەر خۆراسان، بۆیە دواتر تەهماسب دەسەڵاتدارێتی ئەو شارەی لە حوسێن خانی شاملو سەندەوەو دایە (بەهرام میرزا) ی برای کە هێشتا تەمەنی بچووك بوو ئەمەش بۆ زێتر قایم کردنی شارەکەو بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی ئۆزبەگ . لە ساڵی ١٥٣١ز (عبیداللە خان) سەرکردایەتی هێزێکی گەورەی ئۆزبەگەکانی کردو بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك گەمارۆی شاری هیراتی دا، ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە مایەوە تا کاتێ هەواڵی هاتنی شا تەهماسب بۆ هیرات بڵاو بوویەوە لەم کاتەدا (عبیداللە خان) هەڵات و ناوچەکەی بە جێ هێشت، ئەم جارەیان تەهماسب جڵەوی حوکمی خۆراسانی دایە دەست براکەی تری (سام میرزا) و هەوڵیدا کە لەشکرکێشی بکاتە سەر ناوچەی (ما وراء النهر)ی ئۆزبەگەکان، بەڵام مەترسیەکانی سوڵتان سلێمانی قانونی لە ڕۆژئاوادا ئەم هەوڵەی تەهماسبی لە بەین برد[٢٩]. بەشێوەیەکی گشتی ئۆزبەگەکان بۆ ماوەی پازدە ساڵ (١٥٢٥–١٥٤٠) بەبەردەوامی لەشکرکێشیان دەکردە سەر وڵاتی ئێران کە حەوت لەو لەشکرکێشیانە لە ڕووی سەربازیەوە بەهێز بوون، هیرات زێتر لە هەموو شارەکانی تر لەو هێرشانە تووشی زەرەرو زیان بۆوە، ئەمە جگە لە چەندین شاری تر کە ڕووبەڕووی هەمان چارەنووس بوونەوە لەوانەش شاری (مەشهەد)[٣٠].

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئۆزبەگەکان بەبەردەوامی هێرشیان دەکردە سەر ناوچەکانی ئێران ، بەڵام لەڕاستیدا ئامانجی ئەو هێرشانە زێتر تاڵانکاری بوو نەك داگیرکردنی ناوچەکان، چونکە هەر لە دوای مردنی سەرکردەی بەناوبانگیان

(محەمەد شەیبانی) ئۆزبەگەکان زێتر هەڵوێستێکی بەرگریکارانەیان لە بەرامبەر سەفەویەکان گرتە بەر نەك هێرشکاری، لە هەمان کاتیشدا دەوڵەتی سەفەوی لەو ماوەیەدا لەڕووی سەربازیەوە تەکانێکی باشی بەخۆیەوە دی بوو بە تایبەتیش بەکارهێنانی چەکی ئاگرین ئەنجامی شەڕەکانی لە بەرژەوەندی سەفەویەکان یەکلایی دەکردەوە، هەروەها پەیمانبەستنە ئاشتیەکانی تەهماسب لەگەڵ عوسمانیەکاندا سەفەویەکانی لە مەترسی شەڕ کردن لە دوو بەرەی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا دوور دەخستەوەو دەرفەتی بە تەهماسب دەدا کە خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ لاواز کردنی ئۆزبەگەکان[٣١]. هەرچەندە یاخی بوونە ناوخۆییەکان شا تەهماسبیان بێزار دەکردو ئۆزبەگەکانیش ئەمانەیان دەقۆزتەوە، وەك یاخی بوونەکەی (سام میرزا) ی برای لە ساڵی ١٥٣٢ز کە ئەو کات حوکمداری شاری قەندەهار بوو (عبیداللە خان)یش ئەمەی قۆزتەوەو هێرشی کردە سەر ناوچەی خۆراسان و شاری هیراتی داگیر کرد[٣٢]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دواتر ئۆزبەگەکان بەرەو لاوازی چوون بە تایبەتیش پاش مردنی (عبیداللە خان) ی سەرکردەی مەزنیان کە دوای ئەو چەندین فەرمانڕەوای لاوازو بێ دەسەلات هاتنە شوێنی، بە ڕادەیەك کە هێزە دەرەکیەکان چاویان بڕیە داگیرکردنی ناوچەکانیان لەوانەش لە ڕۆژهەلات نەورۆز ئەحمەد (بوراق خان) کە سەرۆك هۆزێك بوو لە ساڵی ١٥٥٢ز توانی دەست بەسەر زۆربەی ناوچەکانی ئۆزبەگەکاندا بگرێت و کاولیان بکات[٣٣]، تەهماسبیش لە ساڵی ١٥٥٦ز لەشکرێکی ئامادە کرد بۆ لەناو بردنی یاخی بوونی ئۆزبەگەکان کاتێ (عبیداللە خان) بەمەی زانی بەبێ بەرگری کردن دەستی لەو ناوچانە هەڵگرت کە داگیری کردبوون و بەرەو (ما وراو النهر) هەلات[٣٤]، بەڵام ماوەی لاوازی ئۆزبەگەکان درێژەی نەکێشا، چونکە ئەم بارودۆخە یارمەتی دەرکەوتنی سەرکردەیەکی تری ئۆزبەگیدا بەناوی (عبداللە خان) کە توانی ناوچەکە لە ژێر دەسەلاتی بوراق خان دەربێنێ و دووبارە هێزو مەزنێتی

ئۆزبەگەکان بگەڕێنێتەوەو ڕووبەڕووی سەفەویەکان بوەستێتەوە، بە شێوەیەك کە تا دوا ساتەکانی حوکمی تەهماسب توانی پارسەنگی هێز لەگەڵ فارسەکان ڕابگرێت بەڵکو زۆربەی کات ئەو زاڵتر بوو[٣٥].

## ٢-جەنگەکانی عوسمانی – سەفەوی لە سەردەمی شا تەهماسب دا

### أ/ ململانێی شا تەهماسب و سوڵتان سلێمانی قانونی لەسەر عێراق

دیارە ململانێی سەربازی نێوان عوسمانی و سەفەویەکان بۆ سەرەتای دروست بوونی دەوڵەتی سەفەوی دەگەڕێتەوە، بەیەکدادانەکانی شا ئیسماعیلی سەفەوی لەگەڵ سوڵتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی لە جەنگی چالدێران[٣٦] گەیشتە چڵەپۆپەی توندوتیژی و ئەم جەنگە بووە مایەی کردنەوەی بەرەیەکی شەڕو ململانێ لە نێوان هەردوولا بۆ ماوەیەکی درێژ مەودا. لە کاتی دەسەڵات وەرگرتنی شا تەهماسب (١٥٢٤ز) یەکێك لە بەهێزترین سوڵتانەکانی عوسمانی حوکمرانی وولاتی دەکرد کە ئەویش سوڵتان سلێمانی قانونی[٣٧](١٥٢٠-١٥٦٦ز) بوو، سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە هەر لە سەرەتاوە سوڵتانی عوسمانی بە بۆنەی وەرگرتنی تەختی پاشایەتی سەفەوی نامەی بۆ شا تەهماسب ناردووە کە نامەکەی چەندین گوزارشتی گەف کردن و هەڕەشەی تیا بووە، بەلاّم شا بۆ ڕەوینەوەی مەترسی عوسمانیەکان دەستی کرد بە ناردنی چەندین شاندو باڵوێز بۆ وولاتانی ئەوروپی تا ڕێککەوتنێك لەگەڵیاندا ببەستێ و بە یارمەتی ئەوان ڕووبەڕووی سوڵتان ببێتەوە[٣٨].

هۆکاری ڕاستەوخۆی دەست پێکردنەوەی جەنگەکانی عوسمانی – سەفەوی لە سەردەمی شا تەهماسب دەگەڕێتەوە بۆ دووبارە داگیرکردنەوەی شاری بەغدا لەلایەن هێزەکانی سەفەویەوە، چونکە پێشتر لە ساڵی ١٥٠٨ز کە شا ئیسماعیلی

سەفەوی شاری بەغدای گرت، دەسەلأتداریێتی شارەکەی دایە (ئیبراهیم سولتان خان) کە میرێکی هۆزی کەلهوڕ بوو، بەلأم دواتر زولفەقار خانی کوڕی ئەخوەت خان کە سەرۆك تیرەی موسلّو بوو لە هۆزی کەلهور لە ساڵی ١٥٢٧ز دژی ئیبراهیم سولتان خانی مامی راپەڕی و کوشتی، بەم شێوەیە فەرمانڕەوایی زۆربەی ناوچەکانی عێراقی گرتە دەست وە لە ترسی سەفەویەکانیش پەیوەندی لەگەڵ سولتان سولێمانی قانونی دا بەست[٣٩]، بەشێوەیەك کە پارەی بەناوی سولتانی عوسمانی لێداو ووتاریشی بەناوی ئەو دەخوێندەوە، شا تەهماسب بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر توڕەبوو، بۆیە سوپایەکی گەورەی کۆکردەوەو لە تەمموزی ساڵی ١٥٢٩ز هێرشی کردە سەر شاری بەغدا وەنەکا هاوکاری سولتانی عوسمانی بگاتە زولفوقار بە خێرایی هێرشەکەی ئەنجامدا، زولفوقار زۆر بە توندی ڕووبەڕووی بۆوەو بەرگرییەکی سەختی لە شارەکە کرد، بەلأم خیانەتی هەردوو براکەی (عەلی بەگ) و (ئەحمد بەگ) کە شا توانی هەڵیان بخەڵەتێنێ و لە دژی زولفوقار بەکاریان بهێنێت، کاریگەری گەورەی لەسەر دەرەنجامی شەڕەکە هەبوو، بە ڕێککەوتنی هەردوو براکە پیلانێکیان بۆ داناوەو دوای ئەوەی زولفوقار بۆ پشودان چۆوە ماڵەوە توانیان بیکوژن[٤٠].

به کوشتنی زولفوقار شا تەهماسب بە ئاسانی توانی لە ساڵی ١٥٣٠ز تەواوی شاری بەغدا بگرێت، بەمەش جارێکی تر ململانێ لەنێوان عوسمانی و سەفەویەکان لەسەر عێراق دەستی پێ کردەوە، سولتان سولێمانی قانونی هەرگیز بەوە ڕازی نەدەبوو کە وولأتی عێراق لە ژێر دەستی سەفەویەکاندا بێت بەتایبەتی کە بەردەوام هاوکاران و یاریدەدەرەکانی ئازایەتی سولتان سەلیمی باوکیان وەبیر دەهێنایەوە کە ئەگەر لە ژیاندا بووایە ڕەگی سەفەویەکانی دەردەهێناو عێراقیشی ڕزگار دەکرد[٤١]. بۆیە بە مەبەستی خۆ یەکلایی کردنەوە بۆ لێدانی سەفەویەکان کە ئەوکات چالاکیە سەربازیەکانیان بەشێوەیەکی بەرچاو لە کوردستان زیادی

کردبوو و ببوونە مایەی دروست کردنی هەڕەشەیەکی ڕاستەقینەبۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی، سوڵتانی عوسمانی ناچار کشانی هێزەکانی عوسمانی بەرەو ناوەوەی ئەورووپای وەستاندو پەیماننامەی ئاشتی لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٥٣٣ز لەگەڵ نەمسادا بەست[٤٢]. تەهماسبیش هەوڵی ئەوەیدا کە سوود لە دوژمنانی عوسمانی وەربگرێت و پەیمانیان لەگەڵدا ببەستێت، بۆ ئەم مەبەستەش نامەی بۆ هەریەك لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و پاشای مەجەر (هەنگاریا) نارد کە تیایدا داوای هاوپەیمانێتی لێکردن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام ئەمە هەرگیز نەدەهاتە دی ئەویش لەبەر چەندین فاکتەر، لەوانە: دووری نێوانیان و نەبوونی باڵوێزی ڕێکخراو لە نێوان ئێران و ئەورووپاداو، هیچ یەکێکیش لەو دوو هاوپەیمانە شارەزاییان لەبارەی توانا سەربازیەکانی یەکتری نەبوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە خودی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کێشەی ناوخۆیی ئایینی و کێشەی دەرەکی لەگەڵ فەرەنسادا هەبوو[٤٣].

عوسمانیەکان لە ساڵی ١٥٣٣ز هێرشیان کردە سەر ئازربایجان ئەمەش دوا بە دوای ئەوەی ئۆلامە بەگی سەرۆکی هۆزی تەکەلۆی قزلباش کە ئەوکات میری ئازربایجان بوو لە تەهماسب یاخی بوو پاڵی دایە لای عوسمانیەکان، ئۆلامە بەگ هانی سوڵتانی عوسمانیدا کە هێرش بکاتە سەر دەوڵەتی سەفەوی لەبەر ئەوەی گوایە سەفەویەکان لاوازن و توانای بەرپەرچدانەوەی هێرشی عوسمانیەکانیان نیە، بەم جۆرە سوڵتان لەشکرێکی بەسەرکردایەتی (صدر الاعظم) ئیبراهیم پاشا ئامادە کردو بەبێ بەرگرییەکی وا کە شایانی باسکردن بێت چوونە نێو خاکی ئێران و ساڵی ١٥٣٣ز شاری تەبرێزی پایتەختیان گرت[٤٤]. جێگای ئاماژە پێدانە کە ئیبراهیم پاشای عوسمانی لە کاتی هێرشەکەی بۆ سەر دەوڵەتی سەفەوی توانی دووبارە دەسەڵاتی عوسمانی لە ناوچە کوردیەکان بەهێز بکاتەوە بەتایبەتی کە فەرمانڕەوای بەتلیس[٤٥] (شەریف بەگ) کودەتایەکی بەسەر عوسمانیەکاندا

کردبوو، ئەم شارەش گەڕایەوە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان و دوای مردنی شەریف بەگ عوسمانیەکان میرێکی نوێیان بەناوی (ئیبراهیم پاشا) بۆ بەتلیس دانا[٤٦].

تەهماسب بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی عوسمانیەکان وازی لە بەرەی ڕۆژهەڵات (شەری ئۆزبەگەکان) هێناو ڕووی کردە بەرەی ڕۆژئاوا، بەڵام لەڕاستیدا شا بەهۆی کەمی ژمارەی سەربازو دڵنیا نەبوون لە سەرکردەکانی کە هەندێك لە سەرکردە قزلباشەکان خیانەتیان لێکردو پاڵیان دایە لای عوسمانیەکان، نەیتوانی ڕووبەڕوو لەگەڵ عوسمانیەکان بجەنگێت، بەڵکو سیاسەتی پەلاماردانی پارتیزانی بەکار دەهێناو هێرشی خێرای دەرکردە سەر عوسمانیەکان لەمەشدا کەشی زستانی سەختی تەبرێز زیانێکی زۆری لە عوسمانیەکانداو سوڵتان سلێمان ناچار ئازربایجانی بەجێ هێشت و لە ڕێگای شارەزورەوە بۆ بەغدا بەڕێکەوت[٤٧]. سوڵتانی عوسمانی هەستی بەوە دەکرد کە دەسەڵاتی سەفەوی لە عێراقدا کەوتۆتە لێژیەوە بەتایبەتی دوای گرتنی تەبرێزی پایتەخت کە بووە مایەی پچڕانی پەیوەندیان لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی و یارمەتی و هاوکاری ئەوێیان پێ نەدەگەیشت، بۆیە ئومێدی ئەوە هەبوو کە سوپای سەفەوی لە بەغدا بکشێنەوەو هاوڵاتیان بەهۆی شەرەوە زیانیان پێ نەگات[٤٨]. دوای نزیك بوونەوەی سوڵتان سلێمان لە بەغدا بە هێزێکی مەزنەوە کە چەندین جۆر تۆپیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو ، ترس و دڵە ڕاوکێ لە نێو سەفەویەکاندا بڵاو بوویەوەو بەم شێوەیە لە کۆتا ڕۆژەکانی ساڵی ١٥٣٤ز بەبێ بەرگریەکی ئەوتۆ چووە نێو بەغداوەو داگیری کرد، ئەوەی زانراوە کە سوڵتان ڕێگەی بە تاڵانکاری و ئەزیەتی خەڵك نەداوە[٤٩]. هەندێك سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن کە خەڵکی عێراق پێشوازیەکی گەرمیان لە عوسمانیەکان کردووەو ئاهەنگی خۆشی و سەرکەوتنیان بۆ گێڕاون، تەنانەت فەرمانڕەوای بەغدا (محمەد خانی تەکەلۆ) بەچەند کەشتیەك چۆتە بەسرەو

پێشوازی لـە هێزەکـانی عوسمـانی کـردووە، لەوانەیـە سـۆزی خـەڵکی عێـراق بـۆ عوسمانیەکان بەهۆی سیاسەتی خراپی سەفەویەکانەوە بێت لە عێراق وەهەروەها لەبـەر ئـەوەش بێـت کـە لـە ڕووی مەزەبـەوە هـەردوولایان یـەك مـەزەبن کـە سوننەن[٥٠].

دوای ئـەوەی عوسمانیـەکان ئازربایجانیـان جـێ هێـشت و ڕوویـان لـە عێـراق کرد،تەهماسب هێرشـی کـردە سـەر پاشمـاوەی سـوپای عوسمـانی بـە تایبـەتیش قەڵای وان کە ئولامە سـوڵتان و (ذوالقـدر) ی تیـادابوو ئـەو دووانـە خیانـەتیان لـە تەهماسب کردبوو، بۆیە سەفەویەکان گەمارۆی قەڵاکەیاندا بەڵام بە هـاتنی زسـتان شەڕ وەسـتا. سـوڵتانی عوسمـانی جارێکی تـر لـە ١٥٣٥ز هێرشـی کـردەوە سـەر ئازربایجان و دووبـارە شـەر دەسـتی پێکـردەوە، بـەڵام لـە یـەکێك لـە شـەڕەکاندا سـەرکردەیەکی قزڵباشـەکان تـوانی چـەند سـەربازێکی عوسمـانی بکوژێـت و سەرەکانیـشیان بـۆ تەهماسـب بنێرێـت، لەلایـەکی تریـشەوە (سـەنان پاشـا)ی سەرکردەی عوسمانی لە شەرێکدا بەدیل گیرا، ئەمانە کاریگـەریان لەسـەر سـوڵتان هـەبوو کـە هەسـت بـە لاوازی خـۆی بکـات لـە هەمبـەر سـەفەویەکان، بۆیـە دواتـر هەردوولا گەیشتنە ڕێککەوتنێك و ئاشـتی لـە نێوانیانـدا بـەرپابوو سـەنان پاشـاش ئازاد کراو ڕەوانەی دەوڵەتی عوسمانی کرایەوە[٥١].

ب/ هێرشی سێیەمی عوسمانی بۆ سەر دەوڵەتی سەفەوی:

ڕێککەوتنی ئاشتی نێوان هەردوو دەوڵەت ماوەیەکی زۆری نەخایانـدو دووبـارە شەرو ململانـێ لـە نێوانیانـدا دەسـتی پێکـردەوە ، هۆکـاری ئـەمجارەی شـەڕەکە یاخی بوونی برای شـا تەهماسـب ( قـاس مـیرزا) ی فـەرمانڕەوای شـێروان بـوو لـە ساڵی ١٥٤٧ز کە چووە ڕیزی عوسمانیەکان [٥٢]، جێگای گوتنە کە براکەی تریـشی (سـام مـیرزا) بـەر لـەو لـە ناوچـەی خۆراسـان لێـی یـاخی بـوو و پـاڵی دایـە لای

عوسمانیەکان[٥٣]، قاس میرزا دوای هەڵاتنی لە چنگی تەهماسب و چوونە لای سوڵتان کەوتە پیلان دانان لە دژی برایەکەی و هانی سوڵتانیدا کە هێرش بکاتە سەر دەوڵەتی سەفەوی، بۆ ئەم مەبەستەش بەڵێنی یارمەتی تەواوی بە سوڵتاندا، بۆیە سوڵتانیش بە بەڵێنەکانی ئەو هەڵخەڵەتاو جارێکی تر شەڕی دژ بە سەفەویەکان دەست پێکردەوە، بەڵام بەڵێنەکانی سام میرزا ڕاست دەرنەچوون بەوەی کە هاوکارانی لە نێو دەوڵەتی سەفەوی یارمەتی دەدەن لە دژی تەهماسب، وە نەیتوانی تەختی پاشایەتی سەفەوی وەربگرێت هەروەك چاوی تێبڕی بوو[٥٤]، بەڵکو لە کۆتاییدا سوڵتانی عوسمانیش پشتی تێکرد تا دواتر لەلایەن هێزەکانی سەفەویەوە لە کوردستان دەستگیر کراو دوای یەك ساڵ لە بەندیخانە کۆچی دوایی کرد[٥٥].

لە ساڵی ١٥٤٨ز عوسمانیەکان سێیەم هێرشیان بۆ سەر دەوڵەتی سەفەوی دەست پێکرد، سوڵتان سلێمان سوپایەکی مەزنی لە ناوچەکانی ئەنازۆل و سوریاو میسرو عێراق و ئەستەمبوڵەوە بە یارمەتی قاس میرزا بەرەو وولاتی ئێران بەڕێکرد[٥٦]، سەرەتاش هێرشی کردە سەر ناوچەی ئازربایجان، لەگەڵ گەیشتنی هێزەکانی عوسمانی بۆ ناو خاکی ئێران تەهماسب فەرمانی سوتاندن و لەناوبردنی گشت خواردەمەنی و دانەوێڵەو کوێرکردنەوەی ئاوو کانیاوەکانی دا، هەرچەندە عوسمانیەکان لە هەمان ساڵدا توانیان بچنە نێو تەبرێزی پایتەختەوە، بەڵام بەهۆی برسێتی و هێرشی بەردەوامی قزڵباشەکان عوسمانیەکان نەیانتوانی لەوێ بمێننەوەو تەورێزیان جێ هێشت، تەنانەت باس لەوە دەکرێ کە سوڵتانی عوسمانی شەوێکی تەواو لەسەر ئەسپەکەی ماوەتەوە لە ترسی هێرشی قزڵباشەکان[٥٧]، سەرچاوەیەکی مێژوویی ئامارە بەوە دەکات کە لەو شەڕەدا پورتوگالیەکان یارمەتی تەهماسبیان داوەو تۆپ و تەنانەت هێزی سەربازیان بۆ ناردووە[٥٨]. دوای ئەو هێرشانەی عوسمانیەکان تەهماسب بیری لە گواستنەوەی

پایتەخت کردەوە چونکە تەوریز کەوتبووە بەردەم هێرشی عوسمانیەکان، بۆیە شاری قەزوینی وەکو پایتەختێکی نوێی دەوڵەتی سەفەوی دەست نیشانکرد[٥٩] ئەمەشی لە ساڵی ١٥٤٨-١٥٤٩ز بە ئەنجام گەیاند[٦٠].

ج/ ڕێککەوتننامەی ئەماسیە:

سوڵتان سلێمانی قانونی بۆ جاری چوارەم لە ساڵی ١٥٥٣ز هێرشی کردەوە سەر سنورەکانی ئێران ئەمەش دوای ئەوەی کە قزلباشەکان شاری ئەرزنجانیان گرت و قەڵای (ئەخلاط) یان بە فەرمانی تەهماسب ڕووخاندو پاسەوانە کوردەکانی قەڵاکەشیان کوشت، کاتێ تەهماسب بە هێرشی عوسمانیەکانی زانی نوێنەرێکی بەناوی (فرخزاد بەگ) بۆ دانوستانی ئاشتی نارده لای سوڵتان، ئەو نوێنەرە ڕۆڵی لە ئاکامەکانی بەیەکگەیشتنی هەردوولادا هەبوو، لە ڕاستیدا تەهماسب گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کە ناتوانێ بەغدا بگرێتەوەو عوسمانیەکانیش دەتوانن بۆ چەندین جاری تر سەرکەوتن بەدەست بێنن، بەڵام بەبێ ئەوەی بتوانن لە خاکی ئێراندا بمێننەوە، بۆیە باشترین چارەسەر ڕێککەوتنێکی ئاشتیە، بۆ ئەم مەبەستەش لە ساڵی ١٥٥٥ز ڕێککەوتننامەی ئاشتی (ئەماسیە) لە نێوان هەردوولادا مۆرکرا کە گرنگترین بەندەکانی ئەمانە بوون[٦١] :

١- ویلایەتی قارس و قەڵای قارس بۆ دەوڵەتی عوسمانی بەجێ دەهێشترێت. دیارە قەڵای قارس نەك هەر تەنها بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی فارس گرنگ بوو، بەڵکو بەرامبەر روسیاش هەروا بوو.

٢- سنوری ویلایەتی شارەزور دیاری دەکرێت بۆ ڕێگە گرتن لە هەر ڕووداوێك کە لەوانەیە ئاشتی نێوان هەردوولا بخاتە مەترسیەوە. لێرەوە کورد وەکو مەسەلەیەکی گرنگ وابوو لە کێشە سنوریەکانی نێوان هەردوولا بە تایبەتی سنوری باکوری نێوان هەردوو دەوڵەت کە کوردەکان تیایدا نیشتەجێ بوون.

٣- دابینکردنی سەلامەتی ئەو ئێرانیانەی کە سەردانی مەزارە پیرۆزەکان لە عێراق دەکەن. هەرچەندە عوسمانیەکان هەوڵیان دەدا کە سەلامەتی شیعەکان بپارێزن چونکە ئەوە داهاتێکی باش بوو بۆ خەزێنەی عوسمانی، بەڵام هۆزە عەرەبەکان زۆر جار هێرشیان دەکردنە سەر، ئەو ڕێککەوتنە بووە مایەی بەرقەراربوونی ئاشتی لە نێوان هەردوولادا[٦٢].

چوار ساڵ دوای ئەو ڕێککەوتنە(واتە ساڵی ١٥٥٩ز) بایەزیدی کوڕی سوڵتان سلێمان[٦٣] لە جەنگی باوکی رایکردو هاتە لای تەهماسب، هەرچەندە سەرەتا تەهماسب بە گەرمی پێشوازی لێکرد، بەڵام دواتر زانی کە ئەو هیچ سودێکی بۆ ئێران نیە بۆیە لە ساڵی ١٥٦١ز لە بەرامبەر ٤٠٠ هەزار پارچە زێڕ ڕەوانەی لای سوڵتانی باوکی کردەوەو ئەویش خۆی و هەر چوار کوڕەکەی لە سێدارەدا. هەرچەندە ڕەخنە لە تەهماسب دەگیرێت بۆ ئەم کارەی، بەڵام ئەگەر ئەوەی نەکردایە لەوانەیە دووبارە شەڕی نێوان سەفەوی و عوسمانی دەستی پێ بکردایەتەوە، چونکە ئەمە دەبووە مایەی شکاندنی پەیمانەکە. لە ساڵی ١٥٧١ز باڵوێزی بوندوقیە (فنسنتیۆد سندەری) هاتە لای تەهماسب بۆ هاوپەیمانیەتێك لە دژی عوسمانیەکان، بەڵام تەهماسب بەمە ڕازی نەبوو کە ئەمەش نیشانەی پابەندیەتی بوو بە ئاشتیەکە، بۆیە تا کۆتایی دەسەڵاتی تەهماسب ئاشتی لە نێوان هەردوولادا بەرقەراربوو[٦٤].

## تەوەرەی سێیەم

## پەیوەندیە دەرەکیەکانی دەوڵەتی سەفەوی لە سەردەمی شا تەهماسب دا

١-پورتوگال و ئیسپانەکان:

پەیوەندیەکانی نێوان تەهماسب و پورتوگالەکان لە ڕووکەشدا دۆستانە بوون، بەڵام لە ڕاستیدا ووردەکاری تەواومان لەبەردەستدا نیە، لەو ئامارژانەی کە

نیشاندەری پەیوەندی نێوان هەردوولایە ئەوەیە کە دۆن سیباستیان (١٥٥٧-١٥٧٨ز)ی پاشای پورتوگال لە ساڵی ١٥٧٤ز باڵوێزێکی ناردۆتە لای تەهماسب بە چەندین دیاری و خەڵاتەوە، بەڵام شا بە ساردو سڕی پێشوازی لێکردووە، چونکە پورتوگالیەکان لە دوورگەی هورمز مامەڵەیەکی خراپیان لەگەڵ موسڵمانەکاندا کردووەو ڕێگەیان نەداون کە مزگەوت دروست بکەن. وەتەنانەت ڕێگەی نەداوە کە ئەو باڵوێزە بچێتەوە پورتوگال تاوەکو شا تەهماسب خۆی مرد. لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندیەکانی نێوان هەردوولا نەچۆتە حاڵەتێکی خراپەوە، ئەمە لە کاتێکدا کە هەندێك لە بەندەرەکانی باشوری ئێران وەکو (هورموزو قشم) لە بن دەستی پورتوگالیەکاندا بوون، بەڵام تەهماسب بەهۆی خەریك بوونی بە شەڕەکانی عوسمانی و ئۆزبەگەکان هەوڵی نەداوە شەڕ هەڵبگیرسێنێت و ئەو ناوچانە ڕزگار بکات، هەروەك پێشتر شا ئیسماعیل هەوڵی لەم جۆرەیدابوو[٦٥]. دەربارەی ئیسپانیەکانیش بە هەمان شێوە پەیوەندیەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی لەو سەردەمەدا ساردو سڕی پێوەدیارە، لە ساڵی ١٥٢٩ز شارلی پێنجەمی ئیمپڕاتۆری ئیسپانیا نامەیەکی بۆ شا ئیسماعیل ناردووە، وادیارە نەیزانیوە کە شا ئیسماعیل پێنج ساڵ پێشتر مردووە بێگومان ئەمەش نیشانەی لاوازی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوولایە[٦٦].

٢-بەریتانیا:

لەوانەیە ئاستی پەیوەندیەکانی نێوان هەریەك لە دەوڵەتی سەفەوی و بەریتانیا لە میانەی ئەو نامەیەی کە شاژنی بەریتانیا(ئێلیزابێت)[٦٧] بۆ تەهماسب ناردوویەتی ڕوون بێتەوە، شاژنی بەریتانیا لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٥٦٢ز لە ڕێگەی (ئەنتۆنی کین سون)ی دەریاوانەوە نامەیەکی بۆ شای سەفەوی نارد، کە تێیدا هاتبوو ((داگیرساندنی دۆستایەتی و دابینکردنی هاتووچۆی ئازادانەی

بازرگانان و خەڵکی ئێمە، سەفەرو هاتن و چوون لە قەڵەمڕەویدا بۆ هێنانی شت و مەکی ئێمەو بوونی کاڵاکانی خۆیان لەسەر شەرەفی دوو فەرمانڕەواو بە مەبەستی قازانجی هاوبەشی دوو وڵات و خێرو خۆشی جەماوەرەکانیان))[٦٨]. لە دەقی نامەکەدا دیارە کە بەریتانیا بۆ مسۆگەرکردنی بەرژەوەندیە ئابوریەکانی خۆی بە تایبەتی بەرژەوەندیە بازرگانیەکانی هەوڵی پتەو کردنی ئەو پەیوەندیانەی داوە، بەتایبەت کە ئەو کات ئیلیزابێت بایەخی زۆری بە بازرگانی دەریایی داوەو ئەو بازرگانیەش گەیشتوونەتە ئاستێکی بەرز لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپا[٦٩].

٣-ڕوسیا:

هەر لە سەرەتاکانی سەدەی پازدەهەمەوە روسەکان بە بایەخەوە سەیری وڵاتی ئێرانیان لە چوارچێوەیەکی بازرگانیدا کردووە. چەندین جار ناوی تەبریز لە نوسینی گەریدە روسەکاندا هاتووە، لە کۆتاییەکانی سەدەی پازدەهەم گەریدەی ڕوسی (ئەفناسی نیکتین) لەکاتی گەڕانەوەی لە وڵاتی هیند بە شاری تەبریزدا تێپەڕیوەو بە مەڵبەندێکی بازرگانی گرنگ وەسفی کردووە[٧٠].

لە ساڵی ١٥٦٩ز ئیمپراتۆری روسی ئیڤانی چوارەم (١٥٣٠-١٥٨٤ز) کە بە (ئیڤانی ترسناك) ناسراوە، نوێنەرێکی بەناوی (دولمێت کارپیدیچ) ناردۆتە لای تەهماسب، کە ٣٠ تۆپ و چوار هەزار تفەنگی بە دیاری دابووە شا لەگەڵ چەندین ئەفسەری ڕوسی بۆ مەشق پێکردنی سوپای سەفەوی، ئەم یارمەتیانەش لە بەرامبەر دژایەتی کردنی ئێران بۆ ئەڵمانیا بووە، بەڵام دیارە شا بەدەم داواکاریەکەی ئیمپراتۆری ڕوسیەوە نەچووەو پەیوەندیەکانیان هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی بەخۆیەوە نەبینیوە[٧١].

٤-پەلامارەکانی تەهماسب بۆ سەر قەفقاس:

لە نێوان ساڵانی ١٥٤٠-١٥٥٥ز شا تەهماسب چوار جار پەلاماری ناوچەی قەفقاسی دا لە ئەنجامی ئەو هێرشانە چەندین کەسی گورجی و چەرکەسی و ئەرمەنی وەکو دیل گیران[٧٢]، بۆنمونە بە تەنها لە ساڵی ١٥٥٢-١٥٥٤ز لە هێرشێکی بۆ سەر جۆرجیا سی هەزار دیلی گرت کە چەندین خانەدانیان تیابوو. هەندێك لەو خانەدانانە دواتر ڕۆڵی سیاسیان لە ئێران گێڕا یەکێکیان بووە حاکمی شێروان[٧٣]، هەندێك لەو دیلانەش ژن بوون بە تایبەتی ژنە جوانەکان لەلای میرەکانی سەفەویەوە مارەکران و چوونە نێو سیاسەت و دەسەلات و هەوڵیان بۆ منداڵەکان دەدا تا ببنە سەردارو بەرپرس، لەلایەکی تر ئەو ناوچانە مەسیحی نشین بوون و دەوڵەمەند بوون بۆیە ڕێژەیەکی زۆر لە زێڕو گەوهەرو سامانیان لەوێدا هێنا[٧٤].

تەوەرەی چوارەم

**دامەزراوەی ئایینی لەسەردەمی شا تەهماسب دا**

١-دەمارگیری مەزەبی و کاریگەری لەسەر سیاسەتەکانی:

یەکێك لە خەسڵەتە دیارەکانی تەهماسب دەمارگیریەکی توندی هەبووە بۆ ئاینزای شیعە، تەنانەت پێی وابووە کە ئەوانەی لەسەر ئاینزای شیعە نین کەسانی پیسن، وە هزری شیعەگەری لە ڕەفتاری ڕۆژانەی ڕەنگی داوەتەوە، باس لەوە دەکرێ کە هۆکاری وازهێنانی لە عەرەق خواردنەوە لە تەمەنی بیست ساڵی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە خەوندا ئیمام (عەلی رەزا) قەدەغەی ئەمەی لێکردووە. لەو بارەیەوە (کارل برۆکلمان) ی مێژوونووس دەڵێت:"شا تەهماسب دەیویست بە ووردی مەزەبی شیعە جێبەجێ بکات"[٧٥]. وادیارە هاریکاری کردنی هەر هێزێکیش لەلایەن شاوە بە مەرجی شیعە قبوڵ کردن بووە، ئەوەتا سەرچاوەیەکی

مێـژوویی ئامـاژە بـەوە دەكـات كـاتێ (هومـايۆن)ی ئیمپراتـۆری مـەغۆل لەلایـەن ئەفغانیەكانەوە هێرشی كراوەتە سـەر، ڕووی كردۆتـە شـا تەهماسـب تـا یارمـەتی بدات، بەڵام شا مەرجی گۆڕینی مەزهەبی لە سوننەوە بۆ شیعە لەسەر دانا ئەویش بەنابەدڵی مەزهەبی شیعەی قبولێ كردو كە دواتر گەڕایەوە هیند بـۆوە سـوننە[٧٦]. ئەو هەستی كردووە فاكتەری سەرەكی سـەركەوتنە یـەك لـە دوا یەكـەكانی بـاوكی بەسـەر تـەواوی دوژمنـەكانی وەكـو ئۆزبـەگ و عوسمانیـەكان لـە دەسـتگرتن و بایەخدانی بووە بە ئاینزای شیعە، چونكە ئەمە تەنێ خاڵی جیاوازی ئایینیان بووە لەگـەڵ دوژمنـە سـوننیەكانی، وەهـەر ئەمەشـی كردۆتـە ژێلـەمۆی وورووژانـدن و ڕاپەڕینەكانی هۆزە قزڵباشەكان دژ بەوان، بۆیە دەكـرێ لـە ڕوانگـەی كەوتنـە ژێـر كاریگەری كارەكانی باوكیەوە سەیری دەمارگیریەكەی بكەین[٧٧].

شا تەهماسب سیاسەتێكی توندوتیژی لە هەمبەر كورد گرتۆتەبـەر بەتایبـەتی كە زۆرینەی كورد لایەنگری عوسمانی بوون و سوننە مەزهەب بوون، بۆیە فاكتـەری مەزهەبی ڕۆڵی سـەرەكی هـەبووە لـە دڵڕەقـی شـا بەرامبـەر كـورد، مێژوونووسـی ڕوسی (لازاریـف) دەڵێـت: "سـێ مـیرو چوارسـەد كەسـی كـوردی سـەر بـە خێڵـی دومبلی لە ماوەی یەك ڕۆژدا بە فـەرمانی شـا كـوژراون"[٧٨] كـاتێ شـا ناوچـەكانی كوردسـتانی لـە سـاڵی ١٥٥٣ز گـرت وەكـو ئـەرزنجان و دیاربـەكر ئـاوەدانی تێـدا نەهێشت و ناوچەكانی تالآنكرد، محەمەد ئەمین زەكی مێژوونووسـی كـوردیش لـەو بـارەوە دەڵێـت:"ئـەو خراپەكاریـەی سـەفەویەكان، خـەڵكی خراپـەكاری هۆلاكـۆو تەیمورلەنگی لەبیرچۆوە "[٧٩] . وەهەر لەهەمان ساڵدا دوای گرتنی قەڵای ئـەخلات لەلایـەن قزڵباشـەكانەوە قـەڵای ئـەرجیش گـیراو لـە تۆڵـەی ئـەو بەرگریـەی كـە قەڵادارەكان نواندبوویان شا فەرمانیـدا "كـەوڵی سـەری ئـەو كوردانـەی قەڵاكـەیان پاراسـت بـوو بـە زیندوویـەتی بگـروون"[٨٠]. هەرچـەندە كـە شـا دەمارگیریـەكی مەزهـەبی تونـدی هـەبووە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕێـزی لـە مـیر شـەرەفخانی

بەدلیسی(١٥٤٣-١٦٠٣ز) خاوەنی کتێبی بەناوبانگی (شەرەفنامە) ناوە کە لەسەر مەزهەبی سوننە بووە، دەسەلاٌتدارێتی چەندین ناوچەی پێداوە لەوانەش: سالیان و مەحمود ئابادو موغان و شیروان و، بەشداری لە شەڕەکانی شا کردووە بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشی یاخی بووان[٨١].

٢-بەهێزبوونی دامەزراوەی ئایینی:

تەهماسب هەر زوو زانی کە ئەو وەکو شا ئیسماعیلی باوکی ناتوانێ لەیەك کاتدا سەرۆکی دین و دەوڵەت بێت، چونکە باوکی دەوڵەتێکی بەهێزو پتەوی بنیاتناو متمانەی بەخۆی بوو کە دەتوانێ لەیەك کاتدا سەرپەرشتی سوپاو کاروباری دەوڵەت و دین بکات و پێویستی بە هیچ کەسێك نیە تا ڕێنمونی بکات، چونکە خۆی (مورشیدی کامل) بوو، بەلاٌم تەهماسب هەستی کرد کە ئەو خەسڵەتەکانی باوکی تێدا نیەو پێویستە مەسەلەی بلاٌوکردنەوەی شیعەگەری بە پسپۆرانی ئەو بوارە کە فەقیهەکانن بسپێرێت[٨٢]. بۆ ئەم مەبەستەش (شیخ علی بن عبدالعالی الکرکی) بانگهێشت کرد بۆ دەرباری سەفەوی تا بەو کارە هەستێت[٨٣].

شێخ عەلی کەرەکی خەڵکی گوندێکی سەر بە شاری بەعلەبەکی لوبنانە، لەو کاتەی کە شا بانگهێشتی کردە ئێران لە شاری نەجەف دادەنیشت، کاتێ گەیشتە جێ شا پێشوازیەکی گەرمی لێکردو فەرمانێکی بۆ تەواوی وولاٌت دەرکرد کە شێخ عەلی جێگری ئیمامی نادیار"صاحب الزمان"ە[٨٤]، بۆیە خاوەنی ڕاستەقینەی دەوڵەتەو لەسەر هەمووان پێویستە کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن، "ئەوەی شێخ لەسەر کار لایدەدات نابێ بێتەوە سەرکارو ئەوەی کە داشی دەنێت نابێت لەسەر کار لادرێت" ، وە شا چەندین دێی کشتوکاڵی پێبەخشی تا خەراجەکەی وەربگرێت. بەم شێوەیە شێخ عەلی بووە فەرمانڕەوای ڕاستەقینە لەسەردەمی

تەهماسبدا بەتایبەتیش لە کاروباری دینی[٨٥].

شێخی ناوبراو بەوە ناسرابوو کە دەمارگیرییەکی توندی بۆ مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی هەیە، چەندین فەرمانی لە شێوەی یاسا بۆ هەموو لایەکی ئێران دەرکرد کە لەسەر هەمووان بوو ملکەچی بن، ئەو یاسایانەش لەبارەی هێنانەدی دادپەروەری و ڕەفتاری دەسەڵاتداران لەگەڵ ژێردەستان و چۆنیەتی و چەندێتی و ماوەی وەرگرتنی خەراج لەلایەن والیەکانەوە بوو، فەرمانیدا کە لە گشت شارو شارۆچکەو لادێیەك ئیمامێك پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات و فێری ڕێنماییە دینیەکانیان بکات[٨٦]. لەبەر ئەوەی شێخ عەلی وای دەبینی کە تەهماسب شایەکی دادپەروەرە، بۆیە بە پێی فەرمانێك نوێژی هەینی فەرز کرد، چونکە شیعەکان لە کاتێکی زووەوە بەهۆی نەبوونی ئیمام و دەسەڵاتدارێك کە مەرجەکانی دادپەروەری لێ هاتبێتە دی نوێژی هەینیان بەتاڵ کردبۆوە[٨٧].

زۆرێك لە زانایانی ئەوکاتی شیعە بە توندی ڕووبەڕووی ئەو ڕێچکەیەی شێخ بوونەوە کە خزمەتی بە دەسەڵاتداران دەکرد، چونکە پێیان وابوو بەبێ بوونی ئیمام هەر شایەك بێتە سەر دەسەڵات ستەمکارەو نابێت زانایان بچنە خزمەتیەوە، (ابراهیم القطیفی) کە نیشتەجێی شاری نەجەف بوو یەکێك لە ناودارترین ئەو زانایانە بوو کە دژایەتیەکی زۆری شێخ عەلی کردو ئەمەشی لە چەندین نامەدا دەربڕی کە تێیدا ڕەخنەی لە بیروڕاکانی شێخ دەگرت، بەتایبەتیش لەبارەی پشتیوانی کردنی دەسەڵاتداران و حەڵاڵ کردنی وەرگرتنی خەراج لەلایەن شای سەفەویەوە، ئەوەشی دەرخستبوو کە شا داوای لە ئەمیش کردووە تا بچێتە دەرباری سەفەوی و خزمەت بە دەوڵەت بکات، بەڵام ئەو ئەمەی ڕەت کردۆتەوەو نەیوستووە حەرام بخوات[٨٨].

شێخ عەلی چەندین شتی نوێی لە شیعەگەریدا داهێناو زیادی کردن کە پێچەوانەی شەرع بوون، بۆیە بە "مخترع الشیعه" ناسراوە، لەوانەش بە دروست

دانانی جوێنـدان، کڕنـۆش بـردن بـۆ مـرۆڤ ،کڕنـۆش بـردن لەسـەر خـۆڵی ئیمـامی حوسێن، لە هەموو ئەم مەسەلانەش (ابراهیم القطیفی) وەڵامـی شـێخی دەدایـەوەو ئەمانـەی ڕەت دەکـردەوە، ئـەو ململانێیـەی نێـوان هـەردوولا کاریگـەری لەسـەر زانایانی ئەوکاتی شیعە هەبوو کە بۆ دوو دەستەی دژبەیەك دابەشـی کـردن، بـەڵام ئەو دابەشبوونە درێژەی نەکێشاو تێیدا لایەنی شـێخ عـەلی بـەهۆی پـشتگیریەکانی دەوڵـەت و هەڵخەڵەتانـدنی زاناکـانی تـر بـە پـارەو سـامان توانیـان بەسـەر نەیارەکانیاندا زاڵ بن[89]. لە سۆنگەی ئەمانەی سـەرەوە دەتـوانین بڵـێین کـە شـا تەهماسب دامەزراوەی دینی لە ئێران بەهێز کردو دەسەڵاتێکی فراوانی بە پیـاوانی دینی داو ئەوان بوونە حوکمداری ڕاستەقینەی وڵات.

٣-کۆتاییەکانی دەسەڵاتی شا تەهماسب:

لەگەڵ نزیك بوونەوەی کۆتاییـەکانی تەمـەنی شـا بـارودۆخی ئـابوری ئێـران بـەرەو خراپی هەنگاوی ناو ڕێگری و جەردەیی لە گشت لایـەکی وڵات بڵاوبوویـەوە، تەنانـەت بەهۆیانەوە ڕێـڕەوی هەنـدێك ڕێگـای بازرگـانی گـۆڕان، دەرەبـەگ و سـەرەك هۆزەکـان جوتیارانیان دەچەوساندەوەو چۆنیان بویـستایە ئـاوا ڕەفتاریـان لەگـەڵ دەکـردن و لـە خزمـەتی خۆیـان بـەکاریان دەهێنـان. لـە سـاڵی ١٥٧١ز برسـێتیەکی زۆر بڵاوبوویـەوە بەتایبەتی لەنێو چینی جوتیارو هەژارەکاندا بەجۆرێك کە گۆشتی مردارەبوو و مرۆڤیش دەخورا، ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ تەشەنەکردنی پەتاو نەخۆشی ترسـناك[90]. شـا لـە ساڵی ١٥٧٦ز نەخۆش کەوت و نەخۆشـیەکەی دوو مـانگی خایانـد، دوای حـوکم کردنـی بۆ ماوەی ٥٣ ساڵ و شەش مانگ و ٢٠ ڕۆژ لە هەمان ساڵدا بـەهۆی ژەهـر خواردکردنی کۆچی یەکجارەکی کردو لە دوای خۆی ٩ کوڕو ٧ کچی بە جێهێشت[91]، لەو نـۆ کـوڕەی شا حەوتیان لە دایکـانی چەرکەسـی و گـورجی بـوون و تـەنیا دووانیـان دایکیـان تـورك بوو، کە ئەوانیش محەمەد خودابەندەو ئیسماعیل بوون[92].

دەرئەنجامەکان:

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەدا گەیشتینە ئەم دەرئەنجامانەی خوارەوە:

١- هۆزە قزلباشەکان لە سەرەتاکانی فەرمانڕەوایەتی شا تەهماسب دەسەڵاتی ڕاستەقینەی دەوڵەتیان لە ژێر دەستدا بوو، هەر یەکێك لەو هۆزانەش بۆ یەکلایی کردنەوەی لەلە (وصایە) ی شا بۆ بەرژەوەندی خۆی کەوتۆتە ململانێیەکی توند لەگەڵ ئەوانی تر.

٢- لەو شەڕە بەردەوامانەی شا تەهماسب لەگەڵ هەردوو هێزی سوننە مەزهەب ئۆزبەگ و عوسمانیەکان دەیکرد، یارمەتی دەری سەرەکی بریتی بوو لە ئایینزای شیعەگەری کە بەهۆیەوە ئێرانیەکانی دەووروژاند لە دژی هەردوولا.

٣- هەرچەندە شا تەهماسب عێراقی لە دەستداو کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکانەوە کە تا مردیش نەیتوانی بیگەڕێنێتەوە،بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانی بۆ ماوەی ٥٢ ساڵ ڕووبەڕووی عوسمانیەکان بوەستێ و خۆی ڕابگرێت.

٤- پەیوەندیە دەرەکیەکانی دەوڵەتی سەفەوی لە سەردەمی ئەودا تا ڕادەیەك لاواز بووە بە تایبەتی لەگەڵ هێزە ئەوروپاییەکان.

٥- ڕۆڵی سەرەکی لە بەهێز کردنی دامەزراوەی دینی لە ئێراندا هەبووەو دەسەڵاتی پیاوانی دینی لە ئێران بەرفراوان کردووە.

٦- هەوڵی داوە ئایینزای شیعەی دوازدە ئیمامی بە هەر میکانیزمێك بێت لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتەکەیدا بڵاوبکاتەوە، لەپێناو ئەم مەبەستەش لە کوشتن و بڕین سڵی نەکردۆتەوە.

٧- سیاسەتێکی خراپ و توندوتیژی لە هەمبەر کوردان گرتۆتە بەر، ئەم هەڵوێستەشی لە دەمارگیریە مەزهەبیە توندەکەی کە پێی ناسرابوو، سەرچاوەی گرتووە.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:

---

(١)E. Bosworth encyclopedia.of Islam .P.J Berman ,TH,Bianquis , E. Van Donzel And W.P; the Hein Richs, ٢٠٠٠, vol, x T_U , P: ١٠٨ .

(٢) شەری جام لەساڵی ١٥٢٨ز لە نێوان سەفەویەکان وهۆزە ئوزبەگەکانەوە قەوما کە ئەو هۆزانە بۆ ماوەی چەندین مانگ گەمارۆی شاری هیرات (باکوری ڕۆژهەڵاتی ئێران) یاندا . بۆ زانیاری پتر بڕوانە: تەوەرەی دووەم .

(٣) راجر سێیڤری: ئێرانی سەردەمی سەفەوی، وەرگێڕانی: سەلاحەددین ئاشتی، لە بلاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ١٠٦ .

(٤) د. حسن كريم الجاف : الوجيز في تأريخ ايران دراسة في التأريخ السياسي، الجزء الثالث( من ظهور الدولة الصفوية الى نهاية الدولة القاجارية) ، دار ئاراس للطباعة والنشر ، الطبعة الثانية ، اربيل ، ٢٠٠٨ . ص ٣٦ .

(٥) راجر سێیڤری : س . پ، ل ١١٤ .

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٠٦-٢٠٧ .

(٧) د. حسن كريم الجاف : م . س ، ص ٢٦-٢٧ .

(٨) د. عبدالعزيز سليمان نوار : تاريخ الشعوب الاسلامية ، الجزء الاول ، دار النهضة العربية ، بيروت ، ١٩٧١ ، ص ٤٣ .

(٩) پژوهش از دانشگاه كمبريج : تاريخ ايران دوره صفويان ، مترجم ، دكتر يعقوب اذند ، ضاث دوم ، تهران ، ١٣٨٦ ، ل ٥٠ .

(١٠) د.حسن الجاف : م . س ، ص ٢٧ .

(١١) قزلباش بە مانای (کلاوسوور) دێت، ئەمانە چەند هۆزێکی تورکی شیعە مەزهەب بوون، کە لە ناوچەکانی قەوقازو کەناری باشوری دەریای خزر و ڕۆژئاوای خوراسان نیشتەجێ بوون و بە (حەوت هۆزەکە) ناسراون کە ئەمانەن: ئوستاجلۆ، شاملۆ، تەکەلۆ، بەهارلۆ، ذولقەدر، قاجار، ئەفشار. ئەمانە دواتر بوونە کۆڵەگەی دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی لە کاتی شا ئیسماعیل. بۆ پتر زانیاری بڕوانە: د. عبدالعزيز سليمان نوار: م. س ، ص ٢٤-٢٥.

(١٢) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١٠٥ .

(١٣) د. ابراهيم خليل احمد و خليل علي مراد : ايران وتركيا دراسة في التاريخ الحديث والمعاصر ، دار الكتب للطباعة والنشر ، الموصل ، ١٩٩٢ ، ص ٢٥ .

(١٤) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١٠٤ .

(١٥) پژوهش از دانشگاه کمبریج : تاريخ ايران.. ، ل ٥١ .

(١٦) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١٠٥ .

(١٧) د. ابراهيم خليل احمد و خليل علي مراد : م . س ، ص ٢٥ .

(١٨) راجر سێیڤری : س . ث ، ل ١٠٨ .

(١٩) شاری هیرات دەکەوێتە ئەوپەڕی ڕۆژئاوای ئەفغانستان و لە دوای شاری کابول و قەندەهار بە سێیەمین شاری گەورەی ئەفغانستان دێت .

(٢٠) پژوهش از دانشگاه کمبریج : تاريخ ايران.. ، ل ٥١ .

(٢١) امير محمود خواندامير : تاريخ شاه اسماعيل و شاه طهماسب صفوى (ذيل تاريخ حبيب السير) ، تصحيح و تحشية : دكتر محمد على جراحى ، تهران ، ١٣٧٥ ، ص ١٣٣ .

(٢٢) راجر سێیڤری: س . پ ، ل ١٠٨ .

(٢٣) د. ابراهيم خليل احمد و خليل علي مراد : م . س ، ص ٢٥ .

(٢٤) د. حسن كريم الجاف : م . س ، ص ٢٧ .

(٢٥) ئۆزبەگ بە مانای سەربەخۆیی دێت ، ڕەگەزیان دەگەڕێتەوە بۆ ئۆزبەگ خانی ئۆیەمین فەرمانڕەوایی بنەماڵەی جوجی و نیشتیمانی کۆنیان بەرزاییەکانی تورانە ، ئەوانە سەرەتا کۆمەڵێ هۆزی کۆچەر بوون لە ناوچەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی فارس و دواتر محەمەد شەیبانی توانی بەشێکی زۆریان لەژێر سەرکردایەتی خۆیدا یەکبخات و لە ساڵی ١٥٠٠ز خۆی بکاتە پاشای سەمەرقەند کە ئێستا شارێکی وولاتی ئۆزبەگستانە. بۆ پتر زانیاری بڕوانە : د. حسن الجاف : م . س ، ص ٦٧ ، د. عبد العزيز سليمان نوار ، م . س ، ص ٣٥ .

(٢٦) د. عبدالعزيز سليمان نوار : م .س ، ص ٤٤ .

(٢٧) مەزهەبی دوازدە ئیمامی کە بە جەعفەری و ئیمامیش ناسراون پێیان وایە تەنها دوازدە ئیمامی پارێزراو(معصوم) مەرجی ئەوەیان تێدایە کە ببنە پێشەوای موسڵمانان، ئەوانیش: علي بن أبي طالب، حسن بن علي ،حسين بن علي، علي زين العابدين بن الحسين، محمد الباقر بن علي، جعفر

الصادق بن محمد، موسى الكاظم بن جعفر، علي الرضا بن موسى، محمد الجواد بن علي، علي الهادي بن محمد، حسن العسكري بن علي، محمد المهدي بن الحسن. بۆ زیاتر زانیاری بروانە: عبدالقادر صالح: العقائد والاديان، دار المعرفه، بيروت، ٢٠٠٦، ص ١٠.

(٢٨) د. حسن الجاف : م . س ، ص ٢٩ .

(٢٩) حسن پيرنيا (مشير الدوله) : تاريخ ايران ، جلد اول ، انتشارات بهزاد ، چاپ پنجم ، تهران ، ١٣٨٦ ، ص ٨١٢-٨١٣ .

(٣٠) كارل بروكلمان : تاريخ الشعوب الاسلامية ، ت : نبيه امين فارس و منير البعلبكي ، دار العلم للملايين ، بيروت ، ٢٠٠٥ ، ص ٤٩٩ .

(٣١) د. عبدالعزيز سليمان نوار : م . س ، ص ٤٦-٤٧ .

(٣٢) حسن پيرنيا (مشير الدوله) : تاريخ ايران.. ، ل٨١٤ .

(٣٣) د. عبدالعزيز سليمان نوار : م . س ، ص ٤٧-٤٨ .

(٣٤) د . حسن الجاف : م . س ، ص ٢٨-٢٩ .

(٣٥) ) د. عبدالعزيز سليمان نوار : م . س ، ص ٤٧-٤٨ .

(٣٦) ئەو شەڕە بوو کە لە ساڵی (١٥١٤ز) لە نێوان عوسمانیەکان بە سەرکردایەتی سوڵتان سەلیم و سەفەویەکان بە سەرکردایەتی شا ئیسماعیل لە نزیك تەبریز ڕوویداو تێیدا عوسمانیەکان سەرکەوتن. بۆ پتر زانیاری بروانە: د. حسن الجاف: م . س، ص ٢٢.

(٣٧) سوڵتان سولێمان لە دوای باوکی سوڵتان سەلیمی یەکەم (یاوز) دەسەڵاتی گرتە دەست سەردەمی ئەم سوڵتانە بە چەرخی زێرینی عوسمانی دادەنرێت ، ئەمەش بەهۆی ئەو دەسکەوتە زۆرانەی کە لە ماوەی حوکمیدا بەدەستی هێنا کە توانی دەسەڵاتی عوسمانی بگەیەنێتە ناوەندی ئەوروپا ، بۆ پتر زانیاری لەم بارەیەوە بروانە : محمد العريس : موسوعة التاريخ الاسلامي (العصر العثماني) ، دار اليوسف ، بيروت ، ٢٠٠٥ ، ص ٤٩-٥٢ .

(٣٨) ستيفن همسلي لونكريك : اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث ، ت : جعفر الخياط ، ط٥ ، بغداد ، د. س ، ص ٣٥ ، د. عماد الجواهری : صراع القوى السياسية فی المشرق العربی ((من الغزو المغولی حتى الحكم العثمانی)) ، مطابع التعليم العالی ، الموصل ، ١٩٩٠ ، ص ٧٦ .

(٣٩) میر شەرەفخانی بدلیسی : شەرەفنامە(( مێژووی ماڵە میرانی کوردان)) ، وەرگێڕانی : مامۆستا هەژار ، چاپی سێهەم ، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس ، هەولێر ، ٢٠٠٦ ، ل ٤١٧-٤١٨ .

(٤٠) المحامی عباس العزاوی : تاریخ العراق بین احتلالین ، ج ٣ ، انتشارات الشریف الرضی ، قم، ١٤١٠ق-١٣٦٩ش ، ص ٣٦٣-٣٦٤ .

(٤١) د . حسن الجاف : م . س ، ص ٣٠ .

(٤٢) د.عماد الجواهری : م . س ، ص ٧٧ .

(٤٣) د. عبدالعزیز سلیمان نوار : م . س ، ص ٤٩ .

(٤٤) د. حسن الجاف : م . س ، ص ٣٠ .

(٤٥) بەتلیس شارێکە دەکەوێتە باشوری ڕۆژئاوای دەریاچەی وان و دەکەوێتە دووری ٦٠ میل لە میافارقین و ٣٥ میل لە ڕۆژهەڵاتی شاری ئەسعەرد. بۆ پتر زانیاری بڕوانە:مصطفی احمد النجار: شرفخان البدلیسی ومنهجه التاریخی من خلال کتابه شرفنامة، دار سبیریزللطباعة والنشر، دهوك، ٢٠٠٧، ص ١٥.

(٤٦) د. عماد الجواهری : م . س ، ص ٧٨ .

(٤٧) د. حسن الجاف : م . س ، ص ٣٠ .

٤٨ د. عماد الجواهری : م . س ، ص ٧٨ .

(٤٩) د . علی الوردی : لمحات اجتماعیة من تاریخ العراق الحدیث ، ج١ ، المطبعة اسوة ، قم ، ٢٠٠٤ ، ص ٥٦ .

(٥٠) بروانة : عباس العزاوی : تاریخ العراق بین احتلالین ، ج ٤ ، ص ٢٨ و د. عماد الجواهری : م . س ، ص ٧٩ .

(٥١) د. حسن الجاف : م . س ، ص ٣١ .

(٥٢) حسن پیرنیا (مشیر الدوله) : تاریخ ایران.. ، ل ٨١٤-٨١٥ .

(٥٣) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١١٣ .

(٥٤) د. حسن الجاف : م . س ، ص ٣٢ .

(٥٥) حسن پیرنیا (مشیر الدوله) : تاریخ ایران.. ، ل٨١٥ .

(٥٦) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١١٨ .

(٥٧) د. حسن الجاف : م . س ، ص ٣٣ .

(٥٨) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١٧٧ .

(٥٩)H.J.kissling. F.R.C Bagley. N.B Barbour: The Muslim world part III, E.J.Brill, ١٩٦٩, p:١٩٠.

(٦٠) د. ابراهيم خليل احمد و خليل علي مراد : م . س ، ص ٢٦ .

(٦١) د. حسن الجاف : م . س ، ص ٣٣–٣٤.

(٦٢) د. عبدالعزيز سليمان نوار : م . س ، ص ٥١.

(٦٣) ململانێیەکی توند لە نێوان بایەزیدو سەلیمی برای لەسەر جێگرتنەوەی پاشایەتی هەبوو کۆتاییەکەشی بە شەڕێك لە ناوچەی قۆنیە هات کە لەو شەڕەدا سەلیم سەرکەوتنی بەدەست هێناو بایەزیدیش ناچار بەخۆی و هەر چوار کوڕو چەندین هێزی سەربازیەوە ڕایکاتە لای تەهماسب کە دواتریش شا تەسلیمی باوکی کردنەوەو ئەویش کوشتنی. بڕوانە : د. حسن الجاف : م . س ؛ ص ٦٩-٧٠.

(٦٤) المصدر نفسه، ص ٣٤–٣٥.

(٦٥) نصرالله فلسفي : ايران وعلاقاتها الخارجية في العصر الصفوي ٩٠٦–١١٤٨الهجري/ ١٥٠٠–١٧٣٦الميلادي، ترجمة: محمد فتحي يوسف الريس،دار الثقافة للطباعة والنشر، طهران، ١٩٨٩، ص ١٦–١٩.

(٦٦) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١٧٩.

(٦٧) شاژنە ئیلیزابێت کیژی هێنری هەشتەمی پاشای ئینگلیز، کە لە ساڵی ١٥٥٨ تا ١٦٠٣ ز فەرمانڕەوایی بەریتانیای کردووەو لەسەردەمی ئەودا بەریتانیا لە گشت لایەکەوە گەشەی بەخۆیەوە بینی، ڕێنیسانسی ئەوروپی لە سەردەمی ئەودا دەستی پێکردو پەرەی سەند، بە دایکی نەتەوایەتی ئینگلیزەکان دادەنرێت لەم بارەیەوە خۆی دەڵێت: "هیچ شتێك لە دنیادا ئەوەندەی میللەتەکەم لە گیان و دڵم نزیك نیە" بۆ پتر زانیاری بڕوانە: سیدنی دارك: مێژووی ڕێنیسانس، وەرگێڕانی: ئەبوبەکر خۆشناو، چاپخانەی داناز، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٤٩-٥٣.

(٦٨) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١٨٣.

(٦٩) : سیدنی دارك: مێژووی ڕێنیسانس، ل ٥١.

(٧٠) د. كمال مظهر احمد: دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، مطبعة اركان، بغداد، ١٩٨٥، ص ١٢.

(٧١) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١٨٤.

(٧٢) المصدر نفسه، ص ١٢١.

(٧٣) د. ابراهيم خليل احمد و خليل علي مراد : م . س ، ص ٢٦.

(٧٤) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١٢١.

(٧٥) كارل بروكلمان: م،س ، ص ٥٠٠-٥٠١.

(٧٦) راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١٢٣.

(٧٧) د. حسن الجاف : م . س ، ص ٣٦.

(٧٨) م.س. لازاريف واخرون: تاريخ كردستان، ترجمة: د. عبدى حاجى، دار سثيَريَز للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٦، ص ٨٧.

(٧٩) محەمەد ئەمین زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان،بلاّوکراوەکانی کتێبخانەی سۆران، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١٢٧-١٢٨.

(٨٠) نەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردو عەجەم مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٢٣.

(٨١) د. حسن الجاف: م . س، ص ٧١.

(٨٢) د. علي الوردي:لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، الجزء الاول، مكتبة الصدر، قم، ٢٠٠٤، ص ٦٢-٦٣.

(٨٣) د. حسن الجاف: م . س، ص ٣٦.

(٨٤) مەبەست پێی محەمەدی مەهدیە کە دوازدەهەمین ئیمامی شیعەکانەو پێیان وایە کە لە ساڵی (٢٦٠ك)ی لە سەردەمی عەباسیەکان لە تەمەنی پێنج ساڵیدا لە سامەڕا خۆی شاردۆتەوە لەبەرچاو وونبووەو پێش ڕۆژی قیامەت دەگەڕێتەوەو زەوی پڕ دەکات لە دادوەری و خۆشی و ئاسایش. بۆ پتر زانیاری بڕوانە: موسا موسەوی: شیعەو ڕاستکردنەوە ململانێی نێوان شیعەو تەشەییوع، وەرگێڕانی: ئاسۆ حەسەن، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ٧.

(٨٥) د. علي الوردي: م. س، ص ٦٣.

(٨٦) د. حسن الجاف: م . س، ص ٧١.

(٨٧) نفس المصدر ونفس الصفحة.

(٨٨) د. علي الوردي: م. س، ص ٦٤-٦٥.

(٨٩) المصدر نفسه ، ص ٦٥-٦٦.

(٩٠) د. حسن الجاف: م . س، ص ٢٨.

(٩١) المصدر نفسه، ص ٣٦.

[٩٢] راجر سێیڤری : س . پ ، ل ١٢٤.

# مەلیك سیف الدین قطز و
# بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ مەغۆلەکان

ڕێبوار فەتاح

دەروازە

یەکەم : مەمالیك

دووەم : دەوڵەتی مەمالیکی بحری

سێ یەم : رەوشی سیاسی لەسەردەمی مەمالیکی بەحری

**یەکەم : مەمالیك**

**دەروازە**

**یەکەم : مەمالیك**

مەمالیك کۆکراوەی ناوی (کۆیلە یاخود رقیق)ە بەوکۆمەڵەکەسانەدەووترا کەلەلایان سەرکردەو خەلیفەکان کرین وفرۆشتنیان پێ دەکرا یاخود وەکودیاری دەیان بەخشی بەیەکتری ،ئەوەی جێگای ئاماژەیە ئەوکۆیلانە زۆربەیان لەکاتی جەنگ دا کەبەدیل دەگیران دەکران بەکۆیلەو پاشان دەفرۆشران [١] .

ناوچەکانی ئاسیای ناوەراست و ولاتی پشت روبارو و ولاتانی منغۆلیا و ئەفغان و سەقالبە[٢] و قەفجاق [٣]حەزەرو قەفقاسیا[٤]سەرچاوەی وسەرەکی هێنانی کۆیلە بوو بۆ ولاتانی ئیسلامی[٥] ، هەروەها لە ولاتانی ئیسلامی مەمالیك بەوکۆیلانە دەووترا کەواسپی پێست بوون نەوەکو رەش پێست [٦].

ئەومەمالیکانە دوای هێنانیان لەوناوچانە چەند یەکەیەکی سەربازیان لێ پێك دەهێنرا[٧] ، و پەروەردە دەکران لەسەرپەیرەوی سوارچاکی وسەربازی و چەند ئیزامێکی توند کەپەیوەست بوون

بەکاروباری جەنگی [٨] ، دواتریش وەکو سەربازان دەخرانە ناو سوپاو بەژدار دەبوون لەشەرکردن تاوای لێهات ئەو مەمالیکانە بوونەتاکە ئامێری جەنگ و بە تەنیا لەمەیدان شەریان دەکرد[٩] .

ئەگەر چاوێك بەمێژووی ئیسلامی دا بخشێنینەوە دەبینین ئەومەمالیکە توورکانە رۆڵی کارایان گێراوە لەبەرێوەبردنی و دامەزراندی هەندێ دەوڵەت لەوانە :

لەسەردەمی خەلیفە (معتصم) (٢١٨-٢٢٧ ك/ ٨٣٣-٨٤١ز) لەژێر سایەی باری ململانێ ی توندی نێوان عەرەب وفارس وتێکچوونی هاوسەنگی نێوان ئەو رەگەزانەی کەدەوڵەتی عەباس یان لێ پێك هات بور خەلیفە رەگەزی تورکی هێنایەناو دەوڵەت و پلە وپایەیی تایبەتی پێ بەخشین کە دواتر کایگەری هەبور لەسەر دەوڵەت [١٠] ، و حوکمرانی سەردەمی دووەمی دەوڵەتی عەباسیان کرد کە بەسەردەمی تورکەکان ناسراوە لەمێژوودا لە نێوان ساڵانی (٢٣٢-٣٣٤ك/ ٨٤٧-٩٤٥ز) [١١].

دەوڵەتی تۆلۆنی (٢٥٤-٢٩٢ك / ٨٦٨-٩٠٥ ز ) ئەم دەوڵەتە لەسەر دەستی (احمدی کوری طولون ) کە لە مەمالیکەکان بوو دامەزرا لە میسر [١٢] .

دەوڵەتی مەمالیك (٦٤٨-٩٢٣ك / ١٢٥٠ – ١٥١٧ ز ) : ئەم دەوڵەتەش لە ئەنجامی کرینی کۆیلەیەکی زۆر لەلایان مەلیك ( صالح نجم الدین ایوب ) دەمەزرا لە میسر کە دواتر ئاماژەی پێدەکەین [١٣] .

تۆلونیەکان و ئەخشیدیەکان [١٤] . بەیەکەم دەوڵەت دادەنرێن کە مەمالیکی تورکیان لە میسر زیاد کردووە دەووترێت ژمارەیان گەیشتۆتە ٢٤ هەزار مەمالیك [١٥] .

## دووەم : دەوڵەتی مەمالیکی بحری

سەرکردەکانی دەوڵەتی ئەیوبی [١٦] بەهۆی ئەو ناکۆکی و پەشێویە خێزانیەی کە کەوتبووە نێوانیان لە ناوچە جیاجیاکانی ژێر دەسەڵاتیان ناچار بوون پەنا بۆ مەمالیکە تورکەکان ببەن و دەستە دەستە دەیان کرین تا پشتیان پێیان قایم بکەن [١٧].

یەکێك لە هۆکارەکانی کرینی کۆیلەکان ئەوە بوو کە بە ئازایەتی ناوبانگیان دەرکرد بوو [١٨] ، بە تایبەتی دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیەیی دژی فەرنجەکان نیشانیان دا لە ناوچەکانی فارسکو و دمیات [١٩] ، مەلیك ( صالح نجم الدین ایوب ) ژمارەیەکی زۆری مەمایکەکانی لە

میللەت و هۆزە تورکەکان هێنایە میسر و لە دەوری خۆی کۆیکردنەوەی خزاندنیە ناو ریزەکانی سوپاو پلە وپایەیی بەرزی پێ بەخشین [٢٠] .

کارگەیشتە ئەوەی کە مەمالیکەکان بەئارەزووی خۆیان رەفتاریان دەکرد [٢١] ، ژمارەیان ئەوەندە زۆر بوو لە قاهیرە جێگایان نەدەبۆوە ، وە ببونە مایەیی نائارامی و پەشێوی بۆ خەڵك وە کەلوپەل و شمەکی دوکانەکانیان بە تالان دەبرد بۆیە خەڵك لێیان بێزار بوون و راپەرین، کاتێك مەلیك (صالح نجم الدین )ئەمەی بیست قەلایەکی لە دوورگەی (الروضة ) لە نزیك (المقیاس)[٢٢]، بۆ بنیات نان و لەوێ نیشتەجێی کردن کە ژمارەیان نزیکەی ١٠٠٠ مەمالیك دەبوو دواتر ئەم کۆمەڵە بە ( مەمالیکی بحری ) ناسران [٢٣] .

## سێیەم : رەوشی سیاسی لەسەردەمی مەمالیك

سەردەمی مەمالیکەکان بەیەکێك لەگرنگترین سەردەمەکانی ئیسلامی دادەندرێت چ لەروی سیاسی بێت یان لەرووی پێشکەوتنی شارستانی بێت کەبۆ ولاتی میسر و شام سەروەری و سەربەخۆی هێنا [٢٤]، ئەگەر رەوشی سیاسی ئەوکات باس بکەین دەبینین سەردەمی مەمالیکەکان پر بوو لەرووداوی یەك لەدوای یەك لەفیتنەنانەوە و شۆرش و شەر لەناوە و لەدەرەوە[٢٥].

مردنی مەلیك (صالح نجم الدین )لەسالی ٦٤٧ك / ١٢٤٩ز وگەیشتنی (المعظم توران شاە)ی کوری بۆ دەسەلات بارودۆخەکەی بەرەو ئالۆزی برد[٢٦] ، چونکە رەفتاری لەگەل مەمالیکەکانی باوکی خراپ بوو، هەندێکی لابردن و کەسی تری لە شوێنی دانان [٢٧] ، لەبەرئەوەی بەهێز بوون و هەستی دەکرد دەبنە کۆسپ لەبەردەمی بۆیە پەیوەندی لەگەڵیان تێکچوو، وە داوای ( شجرالدر) خێزانی باوکی کرد کەئەو پارەو سامانەی کەلەسەردەمی باوکی بەدەستی کەوتووە بۆی بگێرێتەوە بۆیە پەیوەندی لەگەڵ ئەویشدا بەرەو خراپی رۆیی[٢٨].

ئەم هەڵوێستەی(توران شاە) رق و کینەی لەدڵی( شجرالدر) ومەمالیکەکان دروست کرد بۆیەلێ ی کەوتەپیلانگێران ، بەم شێوەیەلەدوای تێپەربوونی ٣ هەفتە بەسەر سەرکەوتنەکانیان بەسەر فەرەنجیەکان کۆمەڵەلێك لە مەمالیکەکان لە سالی ٦٤٨ك / ١٢٥٠ز لەناکاو هێرشیان کردە سەرخێوەتەکەی (توران شاە) کەلەدەرەوەی شاری هەلی دابوو کوشتیان بە سەرکردایەتی(عزالدین ابیك)و[٢٩](بیبرس البندقداری)[٣٠].

بەم جۆرە لەسەر دەستی مەمالیکەکان کۆتایی بەئەیوبییەکان هات پاش فەرمانڕەوای کردنیان بۆماوەی ٨٠ ساڵ لە میسر[٣١]، دوای کوشتنی (توران شاه) مەمالیکەکان هەموو کارەکانیان گرتبووە دەست لەسەر ئەوە ریککەوتن کە (شجرالدر)ی ژنی مەلیك (صالح نجم الدین ئەیوب)بخەنە سەر دەسەلات[٣٢].

ئەم شاژنە ( شجرالدر)لەبنەڕەت دا لەرەگەزی ئەرمەنی یان تورکی بوو مەلیك (صالح نجم الدین) کری و دواتر ئازادی کردوکردی بە هاوسەری خۆی[٣٣]. سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا ( شجر الدر )یەکەم ئافرەت بوو لە مێژووی ئیسلام دا دەسەلاّت بگرێتە دەست[٣٤]، (مقریزی) یش بە یەکەم سولّتانی مەمالیکی تورکی دایدەنێت لە میسر[٣٥].

ئەم شاژنە سەرەرای ئەوەی کە پارەی بەناوی خۆی لێداوە و لە ووتاری رۆژرانی هەینیش ناوی دەخوێندایەوە[٣٦]. بەلاّم ئەم بارودۆخە زۆر نەخایاند چونکە لەلایەك ئەیوبییەکان لەشام بەدەسەلاّتی مەمالیك رازی نەبوون بیریان لەوەدەکردەوەکەدەست بەسەر میسردا بگرن و دەسەلاّت بۆ ئەیوبیەکان بگێرنەوە، لەلایەکی تریش خەلیفەی عباسی رازی نەبوون کە ژنێك ببێتە سولّتانی میسر[٣٧].

بۆدەرچونی لەو بارە نارەحەتە( شجرالدر) لەگەڵ (عزاالدین ایبك) کە ئەتابگی سەربازان بوو هاوسەرگیری کردو دواتر خۆی لەدەسەلاّت لاچوو[٣٨]، دوای ٨٠ رۆژ لە فەرمانڕەوایی کردن[٣٩]. ئەوە بوو(عزاالدین ایبك الترکمانی) لەساڵی ٦٤٨ك / ١٢٥٠ز دەسەلاّتی وەرگرت[٤٠].

(المعزابیك) لەسەرەتادا رووبەرووی چەند کێشەیەك بووە لەوانە کۆمەلّێك لە مەمالیکە دلّسۆزەکانی ئەیوبی داوایان دەکرد یەکێك لە ئەیوبییەکان ببێتە سولّتانی میسر بۆیە لە ئەنجام دا ( الاشرف موسی بن یوسف بن مسعود ) کرا بە سولّتانی میسر و (المعزابیك)یش کرا بە سەر لەشکری سوپای میسر و سەرپەرەشتیاری سولّتان چونکە تەمەنی بچووك بوو[٤١].

هەرچەندە (المعزابیك) هەولّی دەدا رەزامەندی ئەیوبییەکان بەدەست بهێنێ بەلاّم ئەنجامی نەبوو چونکە بەبەردەوام دژایەتیان دەکرد[٤٢]، هەروەها رازی بوونی (المعزابیك) بە دانانی (الاشرف موسی ) کاتی بوو دواتر لەدەسەلاّت لایداو بە دیل گرتی و خۆی دەسەلاّتی گرتەوە دەست[٤٣].

دواتر لەشکری ئەیوبییەکان بەسەرکرداتی ناسر یوسف و لەشکری مەمالیکەکان بەسەرکردایەتی(المعز ابیك)لە شەرێك دا رووبەرووی یەکتر بوونەوەو کە مەمالیکەکان سەرکەوتن بەسەر ئەیوبییەکان و ناکۆکی نێوانیشان هەروا مایەوە[٤٤]، تا دواتر لە رێگای خەلیفەی عەباسی

(مستعصم ) (٦٤٠ – ٦٥٦ ك / ١٢٤٢ – ١٢٥٨ ز ) كە نوێنەرێك دەنێرێ هەردوولا رێك دەوكەون لە ساڵی( ٦٥١ك / ١٢٥٣ ز)لەسەر ئەوەی (میسر و باشوری فەلەستین و غەزە و بیت مقدس بۆ مەمالیكەكان بێت ، وە ئەوی مایەوە لە وولآتی شام و فەلەستین بۆ ئەیوبیەكان بێت[٤٥] .

لەو سەردەمە جولانەوەیەك سەریهەڵدا لە ناوچەی (الصعید ) لە دژی مەمالیكەكان بەلآم ( ایبك ) بە جولانەوەكەی زانی هێزێكی بەسەر كردایەتی (فارس الدین اقطای ) نارد و توانی ئەو جولانەوەیە دابمركێنێتەوە [٤٦] ، دوای ئەمەش (فارس الدین اقطای ) وەكو گەورەی مەمالیكی بحری ناوبانگی دەركردو و بەربەرەكانێی (المعز ایبك) دەكرد بۆیە (ایبك )بە پیلانێكی دارێژراو بانگهێشتی لای خۆی كرد و كوشتی لەساڵی (٦٥٢ ك /١٢٥٤ز) [٤٧] .

دوای ئەم رووداوەش شوێنكەوتوانی (اقطای ) ناچاربوون بەرەوشام بچن بۆ لای ناسریوسف كەلەسەروی هەمووشیانەوە ( بیبرس البندقداری ) و ( سیف الدین قلاروون ) و (سنقر اشقر ) بوون [٤٨] .

هەروەها مەترسیەكی گەورە كە رووبەرووی (المعز ایبك )بۆوە ( شجر الدر )ی خێزانی بوو كەناكۆكی كەوتە نێوانیان ، ناكۆكیەكە زیاتر لەوە سەری هەڵدا كە (ایبك) دەیویست كچی (بدرالدین لؤلؤ)ی خاوەنی موسڵ بخوازێ ،(شجر الدر ) هەوڵی دا خۆی ( ایبك ) رزگار بكات ، بۆ ئەم مەبەستە نامەی بۆ مەلیك ناسر یوسف نارد و وتی پاڵپشتیت دەكەم ئەگەر بێت و میسر داگیر بكەی و (ایبك ) لەسەر دەسەلآت لابدەی ، بەلآم مەلیك ناسر یوسف ئامادەنەبوو یارمەتی بدات[٤٩]. چونكە لە مسیر نامەیان بۆ مەلیك ناسر نارد و داوایان لێكرد یارمەتی( شجر الدر)نەدات .لە بەرامبەر ئەوەش دا داوایان لێكرد بێت بۆ دیمەشق و فەرمانرەوای دیمەشق بكات ئەویش رازی بوو [٥٠] .

دواتر (شجر الدر) بە پیلانێكی دارێژراو لەگەڵ مەمالیكەكان توانی (المعز ایبك) بكوژێ [٥١] لە ساڵی(٦٥٥ك / ١٢٥٧ ز) وە هەوڵی دا خۆی دووبارە دەسەلآت بگرێتەوە دەست، بەلآم لە لایان مەمالیكەكانی( ایبك ) دەست بەسەر كرا [٥٢] وە دواتریش لە هەمان ساڵدا (شجر الدر ) لەسەردەستی ژنی یەكەمی (ایبك) كوژرا [٥٣] .

كوژرانی( ایبك )ودواتر ( شجر الدر) بووە هۆی پەیدابوونی بۆشای لە دەسەلآت بەو شێوە كێشە لە نێوان مەمالیكەكان لەسەر دەسەلآت پەیدا بوو وە پشتیان بەسیاسەتی خۆیان بەست ئەویش زۆرداری بوو نەوەكو سیاسەتی پشتا و پشت [٥٤] ، ئەوەبوو مەمالیكەكان لەسەر ئەوە

ڕێککەوتن کە(علی کوری المعز ایبك) دەسەڵات وەربگرێ کە ناسراوە بە(منصور) سەرەنجام لەهەمان ساڵدا(٦٥٥ك/ ١٢٥٧ز)دەسەڵاتی وەرگرت [٥٥] .

(منصورعلی ) دووەم مەلیکی مەمالیکە تورکەکان بوو لەدوای باوکی دەسەڵاتی گرتە دەست لە میسر [٥٦] ، لە رۆژگاری مەلیك ( منصور علی ) دا هەندێ لە مەمالیکی بحری بە تایبەتی ئەوانەی ولاتی شام چوونە لای ( المغیث عمر ) خاوەنی( کرك ) [٥٧]هانیان دا تاوەکو میسر بگرێ بگێڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی ئەیوبیەکان، ئەوەبوو دووجار هەوڵیان دا لە ساڵی (٦٥٥-٦٥٦ ك / ١٢٥٧- ١٢٥٨ز ) بەلام هەردوو جار سەر کەوتوو نەبوون ئەویش بە هۆی ئازایەتی ( سیف الدین قطز ) بوو[٥٨] کە جێگرو یارمەتی دەری مەلیك (منصور) بوو چونکە(منصور)تەمەنی ١٥ ساڵان بوو[٥٩] .

جێگای ئاماژە پێ کردنە تەمەن بچووکی مەلیك ( منصور) لەلایەك و نزیك بوونەوەی مەغۆلەکان[٦٠] وترسی ئەیوبیەکان لەلایەکی تر ئەمانەی چەند هۆکارێکی تر وای لە ( سیف الدین قطز ) کرد کە هەستێ بە لادانی مەلیك(منصور علی ) لە ساڵی ( ٦٥٦ك ١٢٥٨ ز ) دوای حوکم کردنی بۆ ماوەی دووساڵ و حەوت مانگ و بیست رۆژ[٦١] .

## بەشی یەکەم

### تەوەری یەکەم

**یەکەم : ناو و نازناو و کەسایەتی مەلیك ( سیف الدین قطز ) :**

بەپێی ئاماژەی سەرچاوەکان مەلیك (سیف الدین قطز ) ناوی تەواوی (محمود بن ممدود )ە [٦٢] ، ئەمەش لە لە ڕووداوێك سەرچاوەی گرتووە کە شمس الدین الجزری ئاماژەی پێ دەکات و دەڵێ : (قطز)[٦٣] کۆیلەی ( ابن الزعیم ) بوو ڕۆژێك خاوەنەکەی لێ ی دەدا ئەویش دەگریا و نان ناخوات ، پاشان خاوەنەکەی داوا لە خزمەتکارەکەی دەکا کە ناوی( الحاج علی الفراش ) بوو بچێتە لای بۆ ئەوەی چیتر نەگریا و نان بخوات ، خزمەتکارەکە دەڵێ بۆ دەگریەیی ؟ (قطز)یش دەڵێ: بۆ باوکم و باپیرم دەگریم کە قسەی ناشرینی پێ ووتوون ، ئەویش دەڵێ ، بۆ باوکت کێ یە ؟ کەسێکی کافرە ، ئەویش ووتی ، نەخێر من موسڵمانی کوری موسڵمانم من ( محمود بن ممدود )م کوری خوشکی سوڵتان ( جلال الدین خوارزم شاە )م و لە منداڵی پاشاکانم ، بەم جۆرە خزمەتکارەکە ڕازی کرد ، ئینجا دوای ئەوەی کە (قطز) دەسەڵاتی وەرگرت(٥٠٠ )دیناری دا بە خزمەتکارەکە و موچەشی بۆ بریەوە [٦٤] .

شایەنی باس کردنە کاتیك مەغۆل هێرشیان کردە سەر میرنشینی خوارزمی مەلیك ( قطز ) یەکێك بوو لەو کەسانەی کە لەلایان مەغۆلەکان بە دیل گیرا و لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ دیمەشق و فرۆشتیانە بازرگانەکان،دواترلە بازاری کۆیلە فرۆشان مەلیك(المعز ایبك) کریویەتی وکردویەتی بە کۆیلەی خۆی[٦٥] .

سەبارەت بە نازناوی (مظفر ) لە وشەی ( ظفر ) وەرگیراوە کە بەنامای سەرکەوتن دێت لە ڕووی جەنگەوە ، وە بە مانا ئاینیەکەشی ( مظفر ) بەو کەسانە دەووترا کە چاکە خوازوو خواپەرەست بوون [٦٦] ، موسڵمانان لەسەر ئەو بنەمایە ئەو نازناوەیان پێ بەخشی کەئەوە ڕەحمەتی خوایە بۆ موسڵمانان ، خوای گەورە ناردوویەتی بۆ ئەوەی مەغۆلەکان تێك بشکێنێ [٦٧] .

هەر سەبارەت بە نازناوەکانی مەلیك ( قطز )سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا( قطز) دوا بە دوای سەرکەوتنەکانی ناو ونازناوی خۆی لە سەر پارەو زێر و زیو نووسی بەو شێوەیە(مەلیك مظفر شمشێری دونیاو دین قطز)،ئینجا دواتر ئەم نازناوە (مظفر) لەسەردەمی مەمالیك بووە نازناوی زۆرێك لەسوڵتانەکانی مەمالیك[٦٨] .

سەبارەت بە کەسایەتی مەلیك( قطز )سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە( قطز )پاڵەوانێکی ئازا و بەجەرگ و لێهاتوو بوو، وە کەسێکی زیرەك بوو لە بواری بەڕێوەبردن و کارکردن

و دەگەرایەوە بۆ ئاینی ئیسلام و خێر و چاکە، هەروەها دەستێکی سپی واتە دەستێکی باڵای هەبوو لە جیهاد کردن دژی تەتەرەکان [٦٩].

هەروەها مەلیك ( قطز ) گەورەترین مەلیك بوو لە نێو مەمالیکەکان، چونکە گەنجایەتی خۆی تەرخان کردبوو بۆ رازی کردنی خوای گەورە [٧٠]، وە بە پێ ی ئاماژەکانی (الکتبی ) مەلیك ( قطز ) گەنجێك بوو ریشکی گەورەی هەبوو لەگەڵ قژێکی رەنگ زەرد و سور (الشقر ) [٧١].

زۆربەی سەرچاوەکان باس لە هەڵوێستێکی دیاری مەلیك ( قطز )دەکەن و دەڵێن لە کاتی شەر کردن لەبەرامبەرمەغۆلەکان ئەسپەکەی کوژرا هەر چەند هەندێك لەسەربازەکانی ئەسپەکانی خۆیان بۆ هێنا بەڵام ئامادە نەبوو سواربێ تاکو دواتر سواری یەکێك لەوە کۆمەڵە ئەسپانە بوو لەگەڵ خۆیان دەیان برد بۆ شەر [٧٢].

جزری لە مێژوەکەی خۆی دا دەڵێت باوکم بۆ گێرامەوە کە لە ( ابوبکر الدرهیم الاسعردی و الزکی ابراهیم جلیلی و استاذ اقطای) گوێ ی لێ ببوو وتی : ئێمە لای مەلیك (سیف الدین قطز) بووین کاتێك کە مامۆستاکەی ( المعز ایبك) دەسەڵاتی پێ دا ، ئەستێرە ناسێکی رۆژئاوایش لە وێ بوو ، ویستیمان هەستین مەلیك ( قطز ) فەرمانی پێکردین کە لە جێگای خۆمان دانیشین ، دواتر مەلیك ( قطز ) داوای لە ئەستێرە ناسەکە کرد کە تیرێك بهاوێژێ و بیدا لەو کەسەی کە لە دوای مامۆستاکەی دەسەڵات وەردەگرێت و مەغۆلەکان تێك دەشکێنێ . ئەوە بوو ئەستێرە ناسەکە تیرەکەی هاوێشت و ماوەیەك راوەستا بۆ ئەوەی لێکی بداتەوە دواتر وتی : گەورەم پێنج پیت دەرکەوتن کە بێ خاڵن واتە( قُطُز ) ئەویش وتی بۆ ناڵێی ( محمود بن ممدود )، ئەستێرەناسەکەش وتی: گەورەم جگە لە تۆ هیچ کەسێك نیە( قطز )یش وتی : من (محمود بن ممدود)م ، من مەغۆلەکان تێك دەشکێنم و تۆڵەی خاڵم سوڵتان ( خوارزم شاه ) دەکەمەوە ، ئێمەش وتمان انشاالله ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ، ( قطز )وتی: بائەمە نەهێنی بێ دواتر (٣٠٠) درهەمی دا بە ئەستێرەناسەکە [٧٣].

دووەم : وەرگرتنی دەسەڵات لەلایان مەلیك ( سیف الدین قطز) :

دوای داگیر کردنی بەغدا لەلایان مەغولەکان لەساڵی( ٦٥٦ ك / ١٢٥٨ز )، و کوشتنی خەلیفە (المستعصم بالله) [٧٤]، وەئەنجام دانی کاری کوشتن و برین و لەناوبردنی شارستانی ، [٧٥] ،

پاشان هاتنیان بەرەو وولاتی شام مەمالیکەکانی میسری توشی ترس و دڵە راوکێ کرد ، بە تایبەتی لەوە دەترسان کە مەغۆلەکان خۆیان کۆبکەنەوە و هێرش بکەنە سەر ئەوانیش [٧٦] .

ئەم مەترسیەش تەنها لەسەر میسر نەبوو بەڵکو لەسەر هەموو ولاتانی ئیسلام بوو[٧٧]، لەو کاتەشدا منداڵیکی تازە پێگەیشتوو سوڵتانی میسر بوو وشارەزاییەکی ئەو تۆی نەبوو لە بەرێوەبردنی کاروباری دەوڵەت ئەویش مەلیك (منصور علی ) بوو ، زۆربەی کاتەکانی بە یاری کردن و سورانەوە لە کۆشك و سوار بوونی حوشتر و ئەسپ بەسەر دەبرد [٧٨] .

لەم بارودۆخەدا بریاردرا کۆبوونەوەیەك لە قەلا سازبکرێ ، لەوکۆبونەوەیەش دا مەلیك ( قطز ) ئەمیر و زانایانی کۆکردەوە و بۆ ئەوەی فتوا دەربکەن لەسەر ئەوەی کە ( منصور ) منداڵە و لە توانای دانیە کاروبارەکان بەرێوە ببات وە بارودۆخی وولات پێویستی بەسەرکردەیەك هەیە بۆ جیهاد چونکە مەغۆلەکان گەیشتونەتە وولاتی شام و خەڵکی میسر پێویستیان بە هاوکاری هەیە[٧٩] .

هەروەها خەڵکەکەش داوایان دەکرد کە مەلیك ( منصور ) لە دەسەلات لابرێت و مەلیك ( قطز ) دەسەلات وەربگرێت و کاروبارەکان بەرێوە ببات[٨٠]، مەلیك ( قطز )یش دەرچوونی هەندێك لە میرەکان بۆ راو کردن بە دەرفەت زانی لەوانە ( میر علم الدین سنجر الغنمی ) و (میر سیف الدین بهادر )و هەندێك لە میرەکانی تر بۆ ئەوەی دەسەلات بگرێتە دەست و مەلیك (منصور علی ) لابدات[٨١].

ئەوەبوو لە ساڵی (٦٥٧ك / ١٢٥٨ز )مەلیك (منصور) ی لەدەسەلات لابرد [٨٢]، دواتریش مەلیك (قطز)مەلیك (منصور )و قاقانی برای لەگەڵ داکیانی دەست بەسەر کرد لە قەلای چیا ( قلعه الجبل )[٨٣] ، پاشانیش دووری خستنەوە بۆ (بلادالاشکری )[٨٤] ، پاش ماوەیەکی زۆریش مەلیك ( منصور ) کۆچی دوای کرد[٨٥].

دوای هاتنەوەی میرەکان لەدەرەوە مەلیك ( قطز ) دەستی بەسەر ئەوانیش داگرت لەوانە ( میر علم الدین سنجر الغنمی ) و (میر سیف الدین بهادرالمزکور ) [٨٦] ، هەندێ میری تری وەکو ( میر عزالدین ایدمر النجیبی الصغیر و میر شرف الدین قیران المعزی و میر شیس الدین قرانسقر و عزالدین ایبك النجمی الصغیر و میر سیف الدین داود ) خانی مەلیك (منصور علی )، دواتر میرەکان و سەربازەکان دانیان بە دەسەلاتی مەلیك ( قطز ) دانا [٨٧]

مەلیك (مظفر سیف الدین قطز بن عبدالله بن المعزی ) سێ یەم پاشایی بەرەگەز تورك بور لە میسر لە دوای (المعز ایبك ) و ( منصور)ی کوری بە شێوەیەکی رەسمی لەسالّی (٦٥٧ك ⁄١٢٥٨ز )لەسەر تەختی دەسەلاّت دانیشت[٨٨]، لە قەلاّی چیا [٨٩] .

لە رۆژی ٥ ی ذی القعدة مەلیك ( قطز )، ( زین الدین یعقوب)ی کردە وەزیری خۆی لەگەڵ ئەویش دا( فارس الدین اقطای الصغیر الصالح )ی دانا بۆ بەرێوەبردنی کاروباری سەربازەکان و رێکخستنی کاروبارەکانی دەوڵەت وە بەرم بۆنەیەوە ناهەنگێکی رێکخست بۆ نامادەکردن و رێکخستنی سەربازەکان بۆ جیهاد[٩٠]، ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنە مەلیك ( قطز ) کاتیك دەسەلاّتی وەرگرت ولاّت لە وپەری پەشێوی و نائارامی دابوو[٩١] .

### تەوەری دووەم

#### یەکەم : سیاسەت و هەڵوێستی مەلیك ( قطز )

##### أ- هەڵوێستی بەرامبەر بە ناسر یوسف ئەیوب :

لەگەڵ هاتنی مەغۆلەکان مەلیك ناسر یوسف خاوەنی حەلەب هەستی بە مەترسی کرد وە پێش بینی دەکرد هۆلاکۆ[٩٢] و سەربازەکانی دەست بەسەر شام دادەگرن بۆیە لە سالّی( ٦٥٧ك ⁄١٢٥٧ز) ناسر یوسف وەفدێکی بە نوێنەرایەتی عەزیز محمدی کوری ناردە لای هۆلاکۆ و داوای لێکرد یارمەتی بدات تا میسر لەدەست مەمالیکەکان دەربهێنێت[٩٣] .

هۆلاکۆ لە وەفدەکە توڕەبوو ، و نامەیەکی بە وەفدە کە نارد بۆ ناسر یوسف بۆ ئەوەی گوێرایەڵی بکات بەبێ هیچ مەرجێك ، بەلاّم ناسر بە پێچەوانەوە بە نامەیەکی پڕ لە هەرەشە وەلاّمی هۆلاکۆی دایەوە[٩٤]، لەم بارودۆخە دا ناسر دەیزانی کە محالّە بەتەنیا بەرامبەر مەغۆلەکان بوەستێ ، بریاری دا داوای یارمەتی لە مەمالیکەکان بکات کە سولّتان و مەلیکی ئەوکاتە مەلیك (قطز ) بوو لەمیسر ، مەلیك ناسر لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ مەلیك (قطز) خراپ بوو بەلاّم ئەو هەڵوێستە ترسناکەی مەغۆل وای لە مەلیك (قطز) هەموو ناخۆشیەکان لەبیر بکات و داواکەی قبوڵ بکات[٩٥].

هەڵوێست و ولێهاتووی مەلیك( قطز ) بەروونی لەو نامەیە دەردەکەوێ کە ناردی بۆ ناسر یوسف لەو نامەیە دا سوێند دەخوات لەسەر دەسەلاّت ململانێ ی لەگەڵ نەکات وە

بەرەنگاری نەبێتەوەو بەڵکو دەبێتە جێگری ئەو لە میسر ، هەرکاتێك ویستی دەتوانێ لەسەر کورسی دەسەلات لای بدات ، ئەگەر دەتەوێت خۆم و سەربازەکانم دێین بۆ هاوکاریت دژ بەوەی کە لەرووت دا وەستاوە ، ئەگەریش متمانە نییە بە ئامادە بوونی من ئەوە سەربازەکان دەنێرم لەگەڵ هەرکەسێك کە دەست نیشانی بکەیت، بەم نامەیە مەلیك ناسر دڵنیا بۆوە [٩٦] .

دوای ئەوەی کە مەلیك ( قطز ) پێشوازی لە ناسر و سوپاکەی کرد زۆربەی میر و سەربازەکانی ناسر چوونە پاڵ سوپاکەی مەلیك ( قطز ) تا وای لێهات جگە لە چەند کەسێکی کەم کەس لەگەڵی نەمایەوە، ئەویش ناچار بوو بەرەو باشووری فلسطین رۆیی دواتر لەلایان مەغۆلەکان بە دیل گیراو کوشتیان [٩٧] .

بەم جۆرە مەلیك ( قطز ) لە یەکەم هەنگای دا سەرکەوتوو بوو لەیەك خستنەوەی هەردوو سوپای میسر و شام پێش بەر پابوونی جەنگ دژی مەغۆلەکان[٩٨] .

**ب- هەڵوێستی بەرامبەر مەسیحی و مەغۆلەکان دوای چوونی بۆ دیمەشق :**

دوای داگیر کردنی دیمەشق لە لایان مەغۆلەکان لە( مانگی الربیع الاول ٦٥٨ك / مایسی ١٢٦٠)[٩٩] هەندیك لە مەسیحیەکان چوونە لای هۆلاکۆ بۆ ئەوەی گوێرایەڵی خۆیان بۆ نیشاندەن و لەوێ دا نیشتەجێبن ، ئینجا دوای رازی بوونی هۆلاکۆ مەسیحیەکان دەستیان کرد بە بانگەشەکردن بۆ بەرز کردنەوەی ئاینەکەی خۆیان و دژایەتی کردنی ئاینی موسڵمانان [١٠٠] .

هەروەها رەفتاری خراپیان بەرامبەر بە موسڵمانەکان دەکرد لەوانە رەشوەیان لە موسڵمانان وەردەگرت ، پیاو ماقولانیان ناچار دەکرد لەبەرامبە خاچ ( صلب ) هەستنە سەر پێ ، ووتاریان بۆ خەڵکی دەداو باسی ئاینی مەسیحیان دەکرد و بە ئاشکرا دەیان ووت ئاینی مەسیحی راسترە لە ئاینی ئیسلام [١٠١] ، لە مانگی رەمەزاندا بە ئاشکرا ئارەقیان لە مزگەوتەکان دەخواردەوە و بەسەر جلوبەرگ و لەشی موسڵمانەکانیان دادەرشت و سوکایەتیان پێ دەرکردن [١٠٢] .

موسڵمانەکان زۆر نیگەران بوون لەم کارە ناڕەوایانە بۆیە کۆمەڵێك لە موسڵمانان چوونە لای (کتبغا) ی جێگری هۆلاکۆ و سکاڵایان کرد بەلام ئەو سوکایەتی پێ کردن و ئازاری هەندێکیشیانی دا [١٠٣] ، بەلام دواتر مەلیك ( قطز) نووسراوێکی بۆ خەڵکی دیمەشق نووسی کەیەکەم نووسراوی سوڵتان بوو بۆ دیمەشق تیایدا مژدەی سەرکەوتنی موسڵمانەکانی بەرامبەر بە مەغۆلەکان پێ راگەیاندن و پەیمانی پێدان کە خۆی دێت بۆ لایان و دادوەریان لەناو بلاوەدەکاتەوە ، خەڵکی دیمەشقیش بەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوون [١٠٤] .

مەلیك ( قطز ) هەندێ سەربازی پێش خۆی نارد بۆ دیمەشق کە تیایدا مەلیك (مەنصور)ی خاوەنی حەماشیان لەگەڵ دابوو [١٠٥] ، دواتریش خۆی هاتە ناو دیمەشق و بەوپەری سەربەرزی و شانازیەوە خەڵکی پێشوازیان لێکرد و رێزێکی زۆریان لێ گرت [١٠٦] .

مەلیك ( قطز ) لە رۆژی چوونە ناوەی بۆ دیمەشق فەرمانی لە سێدارەدانی دەرکرد بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە پاڵپشتی مەغۆلەکانیان دەکرد ، لەناویان دا حەسەنی کوردی لەگەڵ بوو کە کاتی خۆی هەواڵی بە مەغۆلەکان دابوو سەبارەت بە شوێنی ناسر یوسف[١٠٧] ، ئینجا پاش ئەم سەرکەوتنە گەورەیە موسڵمانان و خەڵکی دیمەشق دەستیان کرد بە بە تۆڵە سەندنەوە لە مەسیحیەکان بەرامبەر ئەو کارانەی کە لە سەردەمی مەغۆلەکان ئەنجام یان دابوو، بۆ ئەم مەبەستە هێرشیان کردە سەر مەسیحیەکان و ماڵ و سامان و و بەروبوومەکانیان بەتاڵان بردن و ژمارەیەکی زۆریشیان لێ کوشتن [١٠٨] .

پاشان هێرشیان کردە سەر کەنیسەی یعاقبە و رووخاندیان و ئاگریشیان لە کەنیسەی مریەم بەرداو سوتاندیان ، هەروەها هێرشیان کردە سەر چەندین کەنیسەو شوێنی تری مەسیحیەکان[١٠٩] ، جگە لەوانەی کە باسمان کرد مەلیك ( قطز ) سزای مادیشی بەسەر مەسیحیەکان سەپاند کە بریتی بوو لە سەد و چل هەزار درهەم[١١٠] .

ئەو زنجیرە رووداوانەش دوای ئەوە روویان دا کە مەغۆلەکان دیمەشق یان بەجێهێشت ئەوانەی مانەوەش هەندێکیان بەدیل گرت و کۆمەڵێکیشیان لێ کوشتن[١١١] ، دیمەشق لە مەغۆلەکان پاك کرایەوە کە بۆ ماوەی حەوت مانگ و ١٠رۆژ لە ژێر دەستیان دابوو [١١٢] .

### ج - هەڵوێستی بەرامبەر مەلیك سەعید :

پاش ئەو هەموو سەرکەوتنە گەورە و یەك لە دوایەکانی کەموسڵمانان بەدەستیان هێنا لە ناوچەکانی میسر و شام بەرامبەر بە مەغۆلەکان ، موسڵمانەکان کەوتنە تۆڵە سەندنەوە لەو کەسانەی کە مامەڵی خراپیان دەکرد بەرامبەریان [١١٣] .

موسڵمانەکان بۆ ئەم مەبەستە هەستان بە دەست گیرکردنی مەلیك سەعیدی خاوەنی (الصبیبە ) و بەدیل هێنایانە ژێر دەستی مەلیك ( قطز ) ئەویش راستەوخۆ فەرمانی دەرکرد کە لە ملی بدرێت ، چونکە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن مەلیك سەعید کەسێکی زاڵم و خوێن رێژ بوو بەرامبەر خەڵکی بەگشتی موسڵمانان بە تایبەتی [١١٤] .

## دووەم : ڕێکخیستنەکانی مەلیك ( قطز ) لە شام :

### أ- ناوچەی دیمەشق :

مەلیك ( قطز ) دوای رزگار کردنی دیمەشق لەدەست مەغۆلەکان دەستی کرد بە ڕێکخستنەوەی ئەو شارە ، بۆ ئەم مەبەستەش میر ( علم الدین سنجر حلبی ) کردە فەرمانڕەوا لەسەر دیمەشق ، چونکە پێشتر یارمەتی دابوو لە لادان و دەست بەسەر داگرتنی مەلیك ( منصور علی ) ، هاوکات لەگەڵ ئەویش دا میر (مجیر الدین ابو الهجاء بن عسی بن خشتر الازکشی الکردی ) دانا [١١٤] ، هەروەها مەلیك ( قطز) هەستا بەلادانی قاضی( ابن الزکی )ولە شوێنی ئەویش دا( ولی کوری سنی)کردە قاضی وبەڕێوبەری کاروباری دادوەری لە دیمەشق [١١٦] .

### ب- ناوچەی حومس :

سەبارەت بە ناوچەی حومس، مەلیك ( قطز )هەر میر ئەشرەف موسی کوری منصوری خاوەنی حەما ی کردەوە بە فەرمانڕەوا لەسەر ناچەی حومس کە کاتی خۆی لەگەڵ مەغۆلەکان دژی مەمالیکەکان جەنگا بوو ، پاشان پەشیمان بۆوەو داوای پەنای لە مەلیك ( قطز ) کرد، ئەویش پەنای دا ، کەهات بۆ لای ڕێزی لێگرت وە ئەوەی لەدەستی بوو بۆی هێشتەوە[١١٧] .

### ت- ناوچەی حەما:

سەبارەت بەناوچەی حەما مەلیك ( قطز ) وەکو پاداشت و چاکەیەك بەرامبەر بەوەی کە مەلیك (منصور) دژی مەغۆلەکان و مەسیحییەکان بە تایبەتی لە وڵاتی شام دا ، بۆیەکردیەوە بە فەرمانڕەوای (حماه) و ناوچەی باریشی پێداو هەروەها ناوچەی (المعرە)شی بۆ گێرایەوە[١١٨]، کە کاتی خۆی لە ساڵی( ٦٣٥ ك / ١٢٣٧ز)خەڵکی حەلەب دەستیان بەسەر داگرتبوو [١١٩]

### پ- ناوچەی حەلەب

سەرەتا میر (بدرالدین طیدم العزیزی ) کردە فەرمانڕەوای ناوچەی حەلەب بەڵام ماوەی چەند ڕۆژێك مایەوەو دواتر کۆچی دوای کرد[١٢٠]پاشان مەلیك (قطز)میر (سعید علاء الدین بن بدرالدین لؤلؤ)ی خاوەنی موسڵی کردە فەرمانڕەوای ناوچەی حەلەب دوای ئەوەی لەگەڵی هاتبوەوە وڵاتی شام ، مەبەستی مەلیك (قطز) ئەوەبوو کە هەواڵی مەغۆلەکان بزانێ لە ڕێگای برایەکەی

کەناوی مەلیك سالح بور ،کە لە دوای باوکی فەرمانرەوای ناوچەی موسلی گرتبووە دەست[١٢١] .
ئەم کاردی مەلیك ( قطز ) بووە هۆی ئەوەی لەگەڵ بیرس بپێتە ململانێ یان ، چونکە بە لێنی پێدا بور کە حەلەبی بداتێ ، دواتریش کوشتی[١٢٢] .

ج- ناوچەی غەزەو دەورووبەری :

مەلیك( قطز ) میر (شمس الدین اقوش البرلی ) کردە فەرمانرەوا لەسەر ناوچەکانی نابلس و غەزەو کەنارەکانی دەورووبەری[١٢٣] ، هەرلەگەڵ ئەویش دا کۆمەلێك مەمالیکی تری لەوناوچانە لەگەڵ دانا[١٢٤] ، شایەنی باسە میر ( شمس الدین ) وگشت ئەو مەمالیکانەی کە لەگەلی دانران لەو ناوچانە بە مەمالیکی(المعزیه)[١٢٥]ناسرابوون .

بەم شێوەیە هەموو ناوچەکانی ولاتی شام هەر لە سنوری رووباری فوراتەوە تاکو سنوری میسر کەوتە ژێر دەسەلاتی مەلیك ( قطز )[١٢٦] ، وەدوای دانانی چەندین فەرمانرەواو و نوێنەرو فەرمانبەر لەسەر دیوانەکان [١٢٧]پاش مانەوەی بیست شەو لە دیمەشق بریاری دا بگەرێتەوە بۆ میسر[١٢٨] .

## بەشی دووەم

تەوەری یەکەم:

یەکەم: ناردنی نامەپر لەهەرەشەکەی هۆلاکۆ بۆ مەلیك قطز

دووەم: وەلامدانەوەی مەلیك (قطز)و ئامادەکردنی سوپا

سێ یەم: شەری عین جالوت

چوارەم: گرینگترین ئەنجامەکانی شەری عین جالوت

تەوەری دووەم : کوشتنی مەلیك( قطز ) و هۆکارەکانی

### یەکەم : ناردنی نامە پر لەهەرەشەکەی هۆلاکۆ بۆ مەلیك( قطز ):

دوای ئەوەی سوپای مەغۆلەکان بەغدایان داگیر کرد بەردەوام بوون لەداگیرکردن تاکو گەیشتنە دیاربکرو ئامەد و ناوچەکانی رولاتی شام لەوانە دیمەشق و حەلەب و ...هتدهەموویان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیان[١٢٩] .

ئینجا مەترسی لەسەر میسر نزیك بۆوە کە مەمالیکەکان فەرمانڕەوای یان دەکرد ، ئەم مەترسیە وای لە (قطز) کرد کە هەڵێك بقۆزێتەوە و مەلیك (منصور) لابدات و خۆی دەسەلات وەربگرێ ، سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن وولات لەو پەڕی ئالۆزی و ناثارامی دابوو کە ( قطز ) دەسەلاتی وەرگرت ، تەنانەت بەر لە تەواو بوونی مەراسیمی وەرگرتنی دەسەلات ، هۆلاکۆ لە رێگای وەفدێکەوە نامەیەکی پر لە هەڕەشەی بۆ مەلیك قطز نارد[١٣٠] ، نامەکەیان دایە دەست مەلیك( قطز) ، کە ئەمە دەقەکەیەتی :

( لە خانی گەورە، پاشای پاشاکانی رۆژهەلات و رۆژئاوا ، بەناوی خوای راخەری زەوی و راگری ئاسمان، بۆ مەلیك (مضفرقطز)کە لە رەگەزی ئەو مەمالیکانەیە کە لەترسی شمشێرەکانمان هەڵهاتوون بۆ ئەم هەرێمە و تێیدا رادەبوێرن و لە خێرو بێری دەخۆن هەرکەس دەکوژن کە بە دوای ئەو دەسەلاتەدا بێت، مەلیك( قطز) بە سەرجەم میرەکانی وولات و خەلکی میسرو شارەکانی دەورووبەرت رابگەیەنە کەوا ئێمە سەربازی خواین لەسەر زەوی دا ،ئێمەی لە تورەی خۆی دروست کرد و زالیشی کردین بەسەر هەموو ئەوکەسانەی کەلێیان تورەیە ،ئێمەش بەزەیمان بەکەسەدا نایەتەوە کەدەگریا ، نەرمیش نابین بەرامبەر ئەوەی سکالا دەکار دەپارێتەوە ، بیستوشتانە ئێمە چەندین وولاتمان ئازادکردوەو زەویشمان پاك کردۆتەوە لە گەندەلی، زۆربەی خەلکەکەشمان کوشتووە، بۆیە ئێوە لەسەرتانە رابکەن و ئێمەش دواتان بکەوین ، چ زەویەك هەیە دالدەتان بدات ، چ رێگایەك هەیە رزگارتان بکات ، چ وولاتێك هەیە بتان پارێزێت ؟ لە مەترسی و شمشێرەکانی ئێمە دەرباز بوون نی یە ، چونکە ئەسپەکانمان خۆشرەون و تیرەکانمان کونکەرن، شمشێرەکانمان وەك بروسکەن ، دلمان وەك چیایە ، ژمارەشمان وەکو خۆل زۆرە ، هیچ شورەو قەلایەکی سەخت بەربەست نیە لەبەردەمان ، بۆ کوشتنی ئێمە سەربازەکانتان هیچ سودیان نییە ، دوعاکانیشتان لە دژی ئێمە گیرا نابێ ، چونکە ئێوە حەرامتان خواردوەو خۆشتان لە قسەی بێسوود ناپارێزن، خیانەتتان لە پەیمان و بەلێنەکانتان کردوەو ئازارو تاوانی گەورەتان تێدا بلاو بۆتەوە،جا وەرن سوکایەتی و سەرشۆری قبوڵ بکەن، هەرکەسێ داوای جەنگان بکات لێی پەشیمان دەبێتەوە، بەلام ئەگەر گوێرایەلی مەرج و فەرمانەکانمان بن ، ئەوا ئێمە چ ئەرك و مافێکمان هەبوو ئێوەش هەمان ئەرك و مافتان دەبێ ، بەلام ئەگەر دژایەتیمان بکەن لە ناو دەچن ، میللەتەکەی خۆشتان بەدەستی خۆتان لەناو مەبەن ، ئێمە ئاگادارمان کردنەوەو ئێوەش بە ئارەزووی خۆتان بکەن ، زانراویشە لای ئێوە کە ئێمە کافرو بێ بڕواین ، لای ئێمەش چەسپاوە کە ئێوە بەد رەوشتن ، ئەوانەی توانایی جێ بەجێکردن و بەرێوەبردنی کاروباریان هەیە دەیانکەین بە لێپرسراوتان ، زۆری ئێوە لای

ئێمە کەمە ، بەرێزەکانتان لای ئێمە بێ رێزن،جگە لە سوکایەتی وسەرشۆری هیچی دیکەمان پێ نییە بۆ پاشاکانتان ،نامەکەشتان با دوور و درێژ نەبێ بە خێرایش وەڵامان بدەنەوە ، بەر لەوەی ئاگری شەر هەڵگیرسێ و پریشکیشی بۆ لای ئێوە بێ ، ئەوسا بەهیچ شێوەیەك لە ئێمەوە رێز و پلەو پایە نابینن، هیچ کەسێکیش ناتوانێ پشتیوانی و پارێزگاریزتان لێ بکات ، دووچاری گەورەترین بەڵاتان دەکەین و وڵاتەکەشتان بە چۆڵی دەمێنێتەوەو ، بۆیە نامەشمان بۆ نووسین بە زەیمان پێتان هاتەوە ، جگە لەوەی کە بێین بەرەو رووتان هیچ مەبەستێکی دیکەمان نەماوە ، سڵاو لە ئێمەو لە ئێوە ، لە ئەوانەشی کە فەرمانەکانمان پەیرەو دەکەن و لە دوارۆژی سەخت دەترسێن،گوێرایەڵی پاشای گەورە دەکەن)[١٣١].

دووەم : وەڵامی مەلیك (قطز) و ئامادەکردنی سوپا:

دوای ئەوەی نوێنەرەکانی هۆلاکۆ گەیشتنە میسر داوایان لە سولتانی مەمالیك مەلیك ( قطز) کرد کەوا گوێرایەڵی فەرمانەکانی هۆلاکۆ بێت ودان بە دەسەڵاتی ئەو دا بنێت [١٣٢] ، مەلیك (قطز ) میرو سەربازەکانی کۆکردەوەو نامەکەی بۆ خوێندنەوە و لەم بوارەدا راوێژی پێکردن و وتی :( هۆلاکۆ لە توران بەرێکەوت بەرەو ئێران ، هیچ کەسێك لە جێنشینەکان و فەرمانڕەواکانی مەلیکەکان نەیانتوانیوە بەرگری لێبکەن دەستی گرتووە بەسەر هەموو وڵات ، پاشان هاتووە بۆ دیمەشق ، ئەگەر هەواڵی مردنی براکەی پێ نەگەیشتبوایە ئەوا میسری وەکو وڵاتانی تر لێ دەکرد ، لەگەڵ ئەوەش دا (کتبغا) لەم ناوچەیە جێ هێشتووە کەوەکو شێرە ، ئەگەر مەبەستی میسر بێت ئەوا پێویستە بەرگری لێ بکەین پێش ئەوەی ئەو هەڵەمان لەدەست بچێ)[١٣٣].

ناسرەدین قیمری[١٣٤] کەمیرێکی کورد بوو لەرێزی سوپای مەمالیك ووتی: ( هۆلاکۆ بەو پێیەی نەوەی جەنگیز خانەوکوری تۆلۆ برای منگۆ قاقانە، بۆیە ناوبانگ و سام و شکۆی لە باس نایە، وڵاتانیش هەر لە چینەوە تادەرگای میسر ئێستا هەموویان لە دەستی ئەوەدان، پاڵپشتی ئاسمانیشی لەگەڵ دایە، جا ئەگەر بچینە لای ئەو و داوای پاراستن ودڵنیا بوونی لێ بکەین ئەوە هیچ شەرمەزاری و ئابڕۆچوونێکی تێدا نیە، بەڵام بەخۆ خەڵاتاندن چوون بەرەو مەرگ و پێشوازی کردنی مەرگ دوو شتی دوور لە بڕیاری عەقڵن ، ئەو کەسێك نیە متمانەی پێ بکرێت ، چونکە گوێی لێنیە چەند سەر ببڕێت، وەفاشی نیە بۆ بەڵێن و پەیمانەکانی خۆی ، چونکە لە کتوپڕێك دا

مەلیك خور و خەلیفە و حسام الدینی عەکا و گەورەی هەولێری کوشت ، دوای ئەوەی بەڵێن و پەیمانی پێدان ، جا ئەگەر ئێمەش چووین بۆ لای هەمان سەرەنجامان دەبێت )[١٣٥] .

مەلیك ( قطز ) یش ووتی ( بارودۆخەکە وایە ، چونکە هەموو شارەکانی دیار بکر و رەبیعە و شام پڕن لە کارەسات و نەهامەتی ، ناوچەو شارەکانیش هەر لە بەغداوە تا رۆم توشی وێرانکاری هاتوە ، چ کەس و مرۆڤ و بەروبومیشە هەمووی لەناوو بردووە ئیدی خێزان و ئاژەڵ و بەروبومی تێدا نەماوە ، جائەگەر ئێمە نەچین لەگەڵ ئەو دەستەوو تاقمانەی کەووڵاتی ئێمەیان دەوێت بجەنگین ئەوا میسریش وەکو شارەکانی تر تەواو وێران و کاول دەبێ ، جا پێوویستە ئێمە یەکێك لەم سێ رێگایە بگرینە بەر ، یان رێککەوتن ، یان شەر ، یان بەجێ هێشتنی ووڵات ، راکردنیش لە ووڵات ناکرێ چونکە هیچ شوێنێکی تر بەدی ناکەین تا بۆی رابکەین جگەلە مەغریب کە نێوان ئێمەو ئەویش ماوەیەکی دوورە ).

ناسرەدین قیمریش وەڵامی دایەوە و وتی:( بەرژەوەندی لەوە دانیە کە رێکبکەوین لەگەڵیان چونکە متمانە بە پەیمانەکانیان ناکرێ )، سەرکردەکانی تریش ووتیان:( هیچ هێزو توانایی بەرەنگاربوونەوەی ئەوانمان نییە ئیدی تۆ چ رایەکەت هەیە وابکە )، ئەوکات مەلیك (قطز ) وتی:( رای من ئەوەیە کە هەموومان بەیەکەوە بەرەو جەنگ بچین، ئەگەر سەرکەوتین ئەوە مەبەستی ئێمەیە ، ئەگەر نا لەبەردەم خەڵك دا دەبینە جێگا سەرزەنشت ) ، سەرکردەکانیش بەو قسەیە رازی بوون [١٣٦].

ئینجا مەلیك (قطز ) رووی کردە (ظاهر بیبرس ) کە پلەی میری میرای پێبەخشی بوو دوای گەرانەوەی بۆ میسر[١٣٧] ،لەو بارەیەوە راوێژی پێ کرد ، ئەویش وتی : ( من پێم باشە کە نێردراوەکان بکوژین و رووبەرووی (کتبغا)ببنەوە جا ئەگەر سەرکەوتین یان شکستمان خوارد ئەوە لە هەردوو باردا بیانوومان بەدەستەوەویە ) مەلیك (قطز )یش ئەورایەیی پێ باش بوو و قبوڵی کرد[١٣٨] .

مەلیك (قطز )یش فەرمانی لە خاچ دانی بۆ هەرچوارنێردراوەکەی هۆلاکۆ دەرکرد و فەرمانەکەش جێ بەجێ کراو لاشەی یەکێکیانی لە بازاری ئەسپ لە خوار قەڵای چیاو ، یەکێکی تریشیانی لەدەرگای زویلە ، سێ یەمیشیانی بەدەرگای نصر ، و چوارەمیشیانی بەدەرگای ریدانیە هەڵواسی ، هەروەها مەلیك (قطز ) منداڵی نێردراوەکانی هێشتەوەو خستنیە رێزی مەمالیکەکان[١٣٩] .

ئینجا مەلیك ( قطز ) دەستی کرد بە خۆ ئامادەکردن کە پێویست بوو لەسەری سوپایەکی یەکگرتوو و بەهێز ئامادەبکات بۆ رووبەرووبوونەوەی مەغۆلەکان بۆ ئەم مەبەستەش باجی نوێ ی خستە سەر میسریەکان چونکەسەرمایەکی زۆری بۆ سوپا پێویست بوو[١٤٠] ، بەم جۆرە لە

هەرکەسێك هەژارو ئافرەتیش دینارێکی وەرگرت، لـە دەوڵەمەنـدەکانیش زەکـاتی وەرگـرت ، سـێ یەکی ماڵیشی لە تورکە ئەهلیەکان وەرگرت ، بەم شێوەیە ئـەو پارەیـەی کـە کۆکرایـەوە بـۆ ئـەم جەنگە شەش سەد دینار بوو[١٤١] .

بەڵام زانایان و دادوەران بەو بریارە رازی نـەبوون پێیـان وابـوو تـەنیا (بیـت مـال)بەسـە بـۆ پرکردنەوەی پێداویستی سوپا ، هەروەها مـەلیك ( قطـز ) کەسـایەتی (شـیخ عزالـدین کـوری عبدالسلام)ی کردە بەرپرسی خەزێنەی دەوڵەت[١٤٢] .

مەلیك ( قطز ) هەستا بە کۆکردنەوەی فەرماندەو خـەڵکی گـشتی لـە صـالحیە[١٤٣] ، لـەو کۆبوونەوەیەدا ووتارێکی ئاراستەکردن و ووتی : ( ئەی سەرکردەی موسڵمانان ئێوە ماوەیەك لەپارەی (بیت مال )تان خواردوە کەچی ئێستا بێزارن لـە جـەنگ ، هەرکەسـێك جیهـاد هەڵدەبـژێرێت بـا لەگەڵم بێت هەرکەسێکیش جیهاد هەڵنابژێرێ با بگەرێتەوە ماڵەکەی خـۆی )[١٤٤] ، ئـەم وشـانە کاریگەری کارای هەبوو لەسەر دەروونی سەرکردەکان، بەم جۆرە هـەموو یـەکیان گـرت بـۆ جیهـاد کردن دژی دوژمن و دوورخستنەوەی لە وولات[١٤٥]، هەروەها هەر لەوێدا مەلیك( قطز ) ئامـاژەی بە (شێخ عزالدین ) کرد کە قسەیان بـۆ بکـات چـونکە سـەرکردەیەك بـوو لـە زۆربـەی کـات دا دەیتوانی رای جەماوەر بۆ خۆی رابکێشێ ئەویش وتارێکی دا و وتـی: (کاتێـك کـە دوژمـن هێـرش بکاتەسەر وولات ئەوە لەسەر هـەموو کەسـێك جـەنگ پێوویسـتە ، وەدەکـرێ ئەوەنـدە پارمـەتی لەخەڵك بسەندرێت کە سوپا ئامادەی بەرەنگاربوونەوەی پێ بکات، بە مەرجێك (بیت مـال )هیـچی تیانەمابێ وە دەبێ هەرشتێکتان هەبوو بیفرۆشن ، دەبێ هەرکەسێك لە ئێوە خـۆی و وولاغەکـەی و شمشێرەکەی مابێتەوە،دەبێ ئێوەو فەرمانرەواکان لەگەڵ جەماوەر و خەڵك دا یەکسان بن واتـە ماڵ سەندن لەخەڵکی گشتی و مانەوەی سەروەت و ماڵ لەدەست سەرکردەکان دروست نیە )[١٤٦].

هەروەهـــا لە میسـر و شام سەرجەم هەرێمەکانی تر بانگەوازی جیهاد بڵاو بۆوە بۆ وەستان لەدژی سوپای مەغۆل[١٤٧] . ئەوەی زیاتر بـووە پاڵنـەر و هـانی مـەلیك (قطـز ) یـدا بـۆ ئـەوەی رووبەرووی سوپای مەغۆل بێتەوە ئەو نامەیە بوو کـە (صـارم الـدین ازبـك )[١٤٨] نـاردبووی بـۆ مەلیك (قطز ) وە ئاماژە بەوە دەکات کە مەغۆلەکان بەم شێوەیە نینە کەوا جێگـای مەترسـی بـن هەروەها لەرووی سەربازیەوە ژمارەیان کەمە[١٤٩] .

### سێ یەم : شەری عین جالوت:

دوای ئـەوەی مـەلیك( قطـز ) سـور بـوو لەسـەر رووبەرووبونـەوەی لەگـەڵ مـەغۆل[١٥٠] ، سوپایەکی گەورەی لە سەربازە موسڵمانەکانی میسر و شام و خەڵکانی تـر کـۆکردەوە کـە مـەلیك (منصور)ی خاوەنی حەما و مەلیك (علی )براشی لەگەڵ دابوو[١٥١]، هەروەها مەلیك( قطز) پـێش

لي في صفة جاسوس ، وأمرته ان يجتمع بالملك المظفر قطز ، والامير بيبرس البندقداري ، وبلبان الرشيدي ، وسنقر الرومي ، ويعرفهم أن التتار لا شيء ، فلا تخافوا منهم ، وأن تكون ميسرة المسلمين قوية بالخيل والرجال ، وعرفهم بأن التتار في عسكر قليل • وأوصيته أن يوصي المسلمين أن يكون الملتقى عند طلوع الشمس • فلما وصل غلامي الى عسكر المسلمين ، وجدهم خائفين من التتار خوفا عظيما ، فاجتمع ببعض الأمراء الذين عرفته بهم ، وعرفهم ما أوصيتهم به • وكنت قلت في جملة كلامي : قل للامراء لا تخافوا ، هأتذا وأصحابي والملك الاشرف ننهزم بين أيديكم، والله وكذلك كان • فلما سمع الأمراء كلام غلامي ، قال بعضهم لبعض : لا يكون هذا معسولية على المسلمين » •

فلما كان ملتقى الجمعين على عين جالوت ، طلعت الشمس علينا ، وظللت عساكر الاسلام • وكان أول سنجق سبق ، أحمر وأبيض ، وكانوا لابسين العدد المليحة • وأشرقت الشمس على تلك العدد ، فظلني كتبغا وقد بهت هو والتتار الذين معه لكثرة تلك العساكر وحسن ما عليهم ، وجمالهم وهم منحدرون من الجبل • وقال لي : يا صارم ، هذا رنك [1] من ؟ قلت : سنقر الرومي • ثم ظهرت سناجق صفر • قال : هذا رنك من ؟ قلت : بلبان الرشيدي • ثم تتابعت الاطلاب أولا فأولا ، وانحدروا من سفح الجبل • ودقت الكوسات [2] والطبلخانات ، وامتلأ الوادي والبر

(١) سبق ان اشرنا الى أن كلمة رنك معناها شعار فيه رسوم تدل على الوظيفة التي يشغلها صاحب هذا الشعار . وكان من عادة كل أمير مملوكي كبير أو صغير ان يكون له رنك يخصه . وبينما كانت رنوك المسلمين في المشرق تدل على الوظائف ، اذا بها في اوربا العصور الوسطى ترمز للاسر الاقطاعية . فكل اسرة لها شعار خاص تتميز به عن غيرها .

(٢) الكوسات آلات نحاسية مثل الصاجات .

من العياط ، وغابت الفلاحين وأهل القرى والبلدان من كل جانب • وكنت غرا بمعرفة رنوك المسلمين ، فصار كتبغا يسألني : هذا رنك من ؟ فصرت أي شيء طلع على لساني قلته •

ثم ان التتار انحازوا الى الجبل ، وفتح الله ونصر هذه الملة المحمدية بالمماليك الترك البحرية ، ولم يسلم من التتر من يرد خبر الى هلاوون ، ولكن قتل الجميع ، ولم يرد خبرهم الا من كان مقيما بدمشق أو حلب • انتهى ما ذكره قرطاي [1] •

---

(1) يلاحظ أن هذا النص فضلا عن الحيوية التي يشتمل عليها ، والاشارات القيمة التي يتضمنها ، كان له أهمية خاصة للتاريخ السياسي والحضاري على السواء . وقد بالغ صارم الدين ازبك في الدور الذي قام به خلال احداث تلك الفترة ، ولكن يبدو أنه لم يغير من جوهر الحقائق التاريخية .

**بروانه ، احمد مختار العبادى : قيام دوله المماليك الاولى فى مصر وشام ،ص- ص ٢٥٦- ٢٦٨ .**

## پاشکۆی ژمارە (٢)

ضـيـمة رقم ــ ٤ ــ

قال القلقشندي [١] :

وهذه نسخة كتاب ، كتب بها عن الملك المظفر قطز ــ وصاحب اليمن يومئذ المنصور [٢] ــ بالبشارة بهزيمة التتار . وأظنها من انشاء القاضي محيي الدين بن عبد الظاهر [٣] ، وهي : ــ

أعز الله تعالى أنصار المعز الشريف العالي ، المولوي ، السلطان ، الملكي المنصوري ، وأعلا منارە ، وضاعف اقداره ، نعلمه أنه لما كان النصف من شهر رجب [٤] ، فتح الله بنصر المسلمين على أعداء الدين .

... ... أما النصر الذي شهد الضرب بصحته ، والطعن بنصيحته ، فهو أن التتر خذلهم الله تعالى ، استطالوا على الايام ، وخاضوا بلاد الشام ، واستنجدوا بقبائلهم على الاسلام :

سعى الطمع المردي بهم لحتوفهم ومن يمسكن ذيل المطامع يعطب

---

(١) القلقشندي : صبح الاعشى جـ٧ ص ٣٦٠ ــ ٣٦٢ .

(٢) لعله الملك المنصور نور الدين عمر بن علي سلطان الدولة الرسولية باليمن .

(٣) صاحب ديوان الانشاء ايام قطز وبيبرس وقلاوون والاشرف خليل وتوفي سنة ١٢٩٢ م . وله كتاب تشريف الايام والعصور في سيرة المنصور تحقيق مراد كامل ( القاهرة ١٩٦١ ) .

(٤) هذا التاريخ يتعارض مع ما ورد في المراجع العربية الاخرى من ان موقعة عين جالوت حدثت يوم الجمعة ١٥ رمضان سنة ٦٥٨ هـ ٣ سبتمبر ١٢٦٠ م .

فأقلعت بهم طرائق الضلال ، وسارت مراكب أمانيهم في بحار الآمال، فتلك آمال خائبة ، ومراكب الظنون عاطبه ... هذا وعساكر المسلمين مستوطنة في مواطنها ، جاذية عقبانها في وكور ظباها ، رابضة آسادها في غيل أقناها ، ما تزلزل لمؤمن قدم الا وقدم ايمانه راسخة ، ولا ثبتت لاحد حجة الا وكانت الجمعة ناسخه ، ولا عقدت برجمة ناقوس الا وحلها الآذان ، ولا نطق كتاب الا وأخرسه القرآن .

ولم تزل أخبار المسلمين تنتقل الى الكفار ، وأخبار الكفار تنتقل الى المسلمين ، الى ان خلط الصباح فضته بذهب الاصيل ، وصار اليوم كأمس ، ونسخت آية الليل بسورة الشمس ، واكتحلت الاعين بمرود المشبات ، وخاف كل من المسلمين اصدار البيات :

ينام باحدى مقلتيه ويتقي بأخرى الاعادي ، فهو يقظان نائم!

الى ان تراءت العين بالعين ، واضطرم نار الحرب بين الفريقين ، فلم تر الا ضربا يجعل البرق نضوا ، ويترك في بطن كل من المشركين شلوا ، حتى صارت المفاوز دلاصا ، ومراتع الظبا للظبا عراصا ، واقتضت آساد المسلمين المشركين اقتناصا ، ورأي المجرمون النار فظنوا أنهم مواقعوها ولم يجدوا عنها مناصا ، فلا روضة الا درع ، ولا جدول الا حسام ، ولا غمامة الا نقع ، ولا وبل الا سهام ، ولا مدام الا دماء ، ولا نغم الا صهيل ، ولا معربد الا قاتل ، ولا سكران الا قتيل ، حتى صار كافور الدين شقيقا ، وتلون الحصباء من الدماء عقيقا ، وضرب النقع في السماء طريقا ، وازدحمت الجنائب في الفضاء فجعلته مضيقا ، وقتل من المشركين كل جبار عنيد ، ذلك بما قدمت أيديهم ، « وما ربك بظلام للعبيد » .

وقلت (1) : وهذه النسخة تلقفتها من أفواه بعض الناس ، ذكر أنه وجدها في بعض المجاميع فحفظها منه ، وهي في غاية من البلاغة ، الا أنها لا تخلو من تغيير وقع في بعض أماكنها ، ولعله من الناقل لها ، من حيث انه ليس من أهل هذه الصناعة ، ولم يسعني ترك ايرادها لما فيها من المحاسن ، ولانفرادها بأسلوب من الاساليب التي كتب بها الى ملوك اليمن ، فأوردتها على ما هي عليه ، وجزى الله خيرا من ظفر لها بنسخة صحيحة فقابلها عليها وصححها وأصلح ما فيها .

---

(1) هذا كلام القلقشندي معلقا على الرسالة .

بروانه ، احمد مختار العبادى : قيام دوله المماليك الاولى فى مصر وشام ،ص- ص ٢٦٩- ٢٧١ .

# ئێران لەسەردەمی ڕەزا شای پەهلەوی

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی د. محمد عبدالله کاکەسوور

پێشەکی :

بابەتی ئێران لەسەردەمی ڕەزاشا ( ۱۹۲۵_۱۹٤۱) گرنگی مێژوویی بە خۆوە دەگرێت , لەبەر ئەوەی ئێران لەو سەردەمەدا لەسەر لێواری قۆناغێکی مێژوویی نوێ و وەستابوو , کە خۆی لە بنیات نانی دەوڵەتی ئێرانی هاوچەرخ بینیەوە , بەهۆی ئەورۆڵەی ئێران لە ڕووداوە نێودەوڵەتیەکانی ناوچەکە بینی و پەیوەندیەکانی لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێیەکانی گرنگی بابەتەکە پتر دەبێ . وێنەیەکی ڕوونمان پێ دەبەخشێ سەبارەت بەسروشتی مونافەسە کردنی ئیستعماری لەپێناو دەست بەسەر داگرتنی ناوچەکە و ئێران بەشێوەیەکی تایبەتی.

هەروەها لێکۆڵینەوەی مێژووی دەوڵەتە دراوسێیەکانی ئێران لەوانەش ئێران یارمەتیمان دەدا لەسەر تێگەیشتنی سروشتی بارودۆخە کۆمەلأیەتی و ئابووری و سیاسییەکان لە ئێران و یارمەتیشمان دەدا لەوەرگرتنی هەڵوێستی تەواو لە پەیوەندییەکانمان لەگەڵیدا و بەهۆی ئەو شەرەی کەلایەنی ئێرانی لەهەشت ساڵەوە سەپاندوویەتی بە سەرماندا ( ئەمە بیرورای نووسەرە ئێمە باوەرمان پێ ی نییە , وەرگێر ) , ئەوە نێوەندە ئەکادیمییەکان و ڕاگەیاندنەکانمان و لایەنی تر هەڵستان بەلێکۆڵینەوە لە لایەنی جیاواز لە مێژووی ئێران . چەند سەرچاوەیەکی لەباری مێژووی ئێران فەراهەم کرد کە خراپ نین , و لەپێشتردا کتێبخانە عێراقی و عەرەبییەکانمان لە ڕوویەوە هەژار بوون . هەروەها لەگەڵ ئەوەش ئێمە

پێویستییەکی زۆرمان هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی تر کە باس لەهەمان بابەت بکات .
لێکۆڵینەوەکە تیشك دەخاتە سەر لایەنی جۆر بە جۆر لە مێژووی ئێران لە سەردەمی رەزا شای پەهلەوی ( ١٩٢٥_١٩٤١) , ئەوە باسمان کردووە لەبارو دۆخی گشتی ئێران لەبەرەبەیانی کودەتای حەوت ساڵی ١٩٢١ ئینجا کودەتایەکەو ئەو شتانەی کە پەیوەندییان هەیە بەچوونە سەر تەختی رەزاشا . ئینجا چاکسازییەکانی رەزاشا لەبواری سوپا و پیشەسازی و کوشتوکاڵ و خوێندن و چاکسازی گشتی تر . هەروەها باسمان لەپەیوەندی رەزاشا بەپیاوانی ئاینی و نەتەوە نا فارسییەکان لە ئێران کردووە . هەرچی سیاسەتی دەرەوەی رەزاشایەوە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیەتی ئەوە شوێنی گرنگی لە لێکۆڵینەوەکە دا هەیە , بەشێکی لێکۆڵینەوەکەشمان تەرخان کردووە بۆ لێکۆڵینەوەلەپەیوەندییەکانی ئێران _ عێراقی لەماوەی ئاماژە پێکراودا . ئینجا ئێران لەبەرەبەیانی شەری دووەمی جیهانی و رووخانی رەزاشا لەساڵی١٩٤١ , ئەمە سەرەرای پێشەکی و دەر ئەنجام .

### ئێران لەچارەگی یەکەمی سەدەی بیستەیەم

ئێران شوێنێکی ستراتیجی جیاکەرەوەی هەیە , کەبەدرێژایی ئەو قۆناغەی بەدوای چوونەناوەوەی ئیستعماری نویّ بۆ ناوچەکانی رۆژ هەلاّتی ناوەراست بەتایبەتی داهات , گرنگییەکی تایبەتی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان پیّ بەخشیوە . لەمەشەوە شتێکی سروشتی بوو کە ببێتەیەکێك لە گرنگترین شوێنەکانی مونافەسەکردن و دەست بەسەرداگرتنی ئیستعماری سەرەرای ئەوەش کە بازارێکی گەورەی ئەو رۆژانەش بوو بۆ سەرف کردنی شمەکەکانی دەوڵەتە پیشەسازییە گەورەکان . ئەوە گرنگیەکی زۆری هەبوو لە پیلانی ئەو دەوڵەتانە بۆ مسۆگەرکردنی بەرژەوەندییەکانیان لە ناوچەکەدا . ئەوە بوو بەریتانیا بە ( رێگری مانەوەی هیند )

دانابوو . [١] ئەویش ئەوەیە کە ئێران ئەو خەونەبوو کە هەردەم روس دەیانبینی بۆ گەیشتن [٢] بەکەنداوی عەرەبی . [٣] ناپلیۆنیش ویستی پردێکی ئاسان بێ بۆ پەرینەوە بۆ هیند لەرێگای روسیاوە بۆ ئەوەی لەوێوە لەبەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بدات [٤] . نەك هەر ئەوەندە , بەڵکو ئەو ئەڵمانیایەی کەدەستی پێکردبوو بەدوای شوێنێکدا دەگەرا لەژێر خۆر بۆخۆی , لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست پەیوەندی ئابووری گرنگی لەگەڵ ئێران دامەزراندبوو , ئەمەش بووە مایەی دڵە راوکێ ی هەریەکە لە روسیا و بەریتانیا سەبارەت بەبەرژەوەندییەکانیان لە ئێران [٥] . کاتێك ئێران خواحافیزی لەسەدەی نۆزدە کرد لە ئەنجامی تێکەڵ بوون لەگەڵ بازاری سەرمایە داری , و خراپ بوونی بەرهەم هێنانی سروشتی و سەرهەڵدانی بەرهەم هێنانی شمەکی و بزربوونی پەیوەندییە باوکسالارییەکان و دیاردە کۆمۆنەییەکان گۆرانی کۆمەڵایەتی و ئابووری گەورەی بەخۆوە بینی بوو [٦] . بەچاو پۆشین لە گۆرانی ئابووری لە سروشتییەوە بۆ ئابووری پشت بەستوو بە پەیوەندییە دراوسییەکان , ئەوە پابەندبوونە هۆزایەتییەکان لەنێوان جووتیاران و موڵکدارانی زەوی وەکو خۆی مایەوە [٧] . ئەمەش بووە مایەی خراپ بوونی بارودۆخی دارایی دەوڵەت , خراپتریش بوو دوای ئەوەی ئێران تووشی زنجیرەیەك قەرز بوو کە پترسبۆرغ پێشکەش بە شای کردبوو , ئەو شایەی کەخۆی نەپاراست لەوەی هەمووشتێك رەهەن بکات لەپێناوی بەدەست هێنانی پارە [٨] تاکو قەرزەکانی روس بەسەر ئێرانەوە لەساڵی ١٩٠٣ , گەیشتە , چوارملیۆن جونیەی ئەسترلینی [٩]. تاران نەیتوانی بیداتەوە , ئەو کارەی بووە هۆی ئەوەی هەلێکی تری نوێ بەروس بدرێت بۆ دەست تێوەردانی زیاتر لەبارو دۆخی ئێران . ئەمەش رەنگدانەوەی هەبوو بەسەر کاردانەوەی گەلانی ئێران بەرامبەر دەوڵەتە ئیستعماریەکان لەلایەك و بەرامبەر بە حکومەتەکەیان لەلایەکی ترەوە . ئەم قۆناغە سەرهەڵدانی توێژی

کۆمەڵایەتی و پەیوەندی و بیری نویّ ی بەخۆوە بینی کە دەیانویست لەو بارو دۆخەی هەبوو رزگاریان ببێت . کاریگەری شۆرشی روسی لەساڵی ١٩٠٥ لەسەر روسیا کەم نەبوو , شۆرشی دەستووری ( ١٩٠٥_١٩١١ ) بەرپابوو , ئەوشۆرشەی سەرەتای قۆناغێکی نویّ بوو لەمێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێران [١٠].

دەوڵەتە گەورەکان لەلایەك و هێزە ئێرانییەکان لەلایەکی تر رووداوەکانی شۆرشی دەستووریان بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندی تایبەتی بەکارهێنا , داوەکان لەیەکتر ئاڵاّن و کاغەزەکان تێکەلّ بەیەکتری بوون و کارەکان لەدەست دەرچوون نەك هەر لەدەستی سەرپەرشتیارانی بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی بەڵکو لەزۆر لەمەسەلە گرنگەکانیش لەدەست حکومەتیش دەرچوون ( ئەوەبوو کارەکان و پەیوەندی پێکردنەکان و چارەسەرکردنەکان لەزۆربەی کاتدا لەناو خودی تارانی پایتەخدا لەنێوان چوارلایەنی بنەرەتی روویاندەدا , ئەوانیش کۆشك و شەقام و بارەگای هەردوو موفەوەزیەتی بەریتانیا و روسیا بوون [١١]. ) لەپێناو هاوئاهەنگی کردن لەهەڵوێستەکان و روو بە روو بوونەوەی رووداوەکان لەسەر ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان لەلایەك و ئاستی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان لە ئێران لەلایەکی تر , هەریەکە لەروسیا و بەریتانیا لەیەکتر نزیك بوونەوە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانیان لەناوچەکە بەشێوەیەکی گشتی و لەئێران بەشێوەیەکی تایبەتی . ئەنجامەکەشی رێکەوتنامەی ساڵی ١٩٠٧ بوو , کە بەگوێرەی ئەم رێککەوتنامەیە ئێران بووە کۆلۆنییەی سەر بەم دوو دەوڵەتە لەدوای ئەوەی وڵاتەکە بەسەر دوو ناوچەی دەست رۆیشتنی نێوانیان دابەش کرا . ئەوەبوو دەستی یەکەمیان لەناوچەی باکور دەستی دووەمیان لەناوچەی باشور ئاوەڵاّکرا و تەنها تارانی پایتەخت ما کە ببووە ناوچەیەکی لەیەك جیاکەرەوە لە نێوان دەست رۆیشتنی هەردوو دەوڵەتەکە و تەنها لەرووی ناویشەوە سەربەخۆ بوو [١٢].

کاتێك شەری یەکەمی جیهانی بەرپابوو , ئێران بیّ لایەنی خۆی راگەیاند , کەچی

شوێنی ئیستراتیجی و بوونی ئەڵمان و رۆڵیان لەئێراندا بووە مایەی کەم بوونەوەی سەربەخۆیی و , چوونە ناوەوەی هێزەکانی روسی و بریتانی بۆ خاکی ئێران بەبێ ئەوەی حکومەتی قاجاری بجوڵێتەوە بۆ بەرگری کردن لە وڵات ئەوەی کە رەنگدانەوەی بەسەر بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی هەبوو , کە رق و قینەی بەرامبەر بەحوکمی قاجاری زیاتر بوو ئەوەبوو ئێران لەدوای شەری یەکەمی جیهانی زنجیرەیەك لە گەشەکردن و راپەرینی بەخۆوە بینی ئەوەندەی نەمابوو رژێمی فەرمانرەوایی رایماڵێ وەکو راپەرینەکانی عەرەبستان و گەیلان و ئازاربیجان و خوارسان و کوردستان کە خاوەن ئامانجی شۆرشگێری رزگاریخوازی و نەتەوایەتی بوون [١٣]. ئەحمەد شای دوا شای قاجارییەکان لەساڵی ١٩٠٩ گەیشتبووە حوکم و هەموو هۆکارەکانی لاوازی و نەتوانینی بەرێوەبردنی کاروباری وڵاتی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو ئەوەی کە رێگای خۆش کرد لەبەردەم مونافەسەکردن لەپێناو دەست خستنە زیاتری سەرئێران ئەوەبوو بریتانیا رێککەوتنامەی ساڵی ١٩١٩ ی نا هاوتای لەگەڵ بەستا . [١٤]لە ئەنجامەکانی ئەم رێککەوتنامەیەش کاردانەوەی فراوان بوو لەناوخۆ ئێرانییەکان بە جۆرێك لە پارێزگاری کردنی دامامکداری بریتانیایان بەسەر وڵاتەکەیان داناو خۆپیشاندنیان ئەنجامدا کە دەربرین بوو لەتورەبوونی توندیان لەسەر رێککەوتنامەکە ئەمە سەرەرای رەخنە دەرەکییەکانی ئاراستە کراوی رێککەوتنامەکە لەلایان رۆژنامەگەری ئەمریکی و فەرەنسی [١٥].

لاوازی کەوتەکیانی دەوڵەتی ئێرانی لەسەردەمی ئەحمەدشا بەشێوەیەك کە لەمێژووی نویێ ی ئێراندا وێنەی نییە دەوڵەت دەستەوەستان بوو تەنانەت لە مەراسیمی پێشوازی کردنی میوانەکانیش بەشێوەیەکی تەواو بەڵکو لەزۆر کاتدا پەنای دەبردە بەریەکێك لەبازرگانە دەوڵەمەندەکان بۆ پرکردنەوەی تێچوونەکانی میوانداری شابووە داردەستێکی بریتانییەکان ئەوەبوو تەنانەت لەکاروباری

کەسایەتی خۆشی پشتی پێ بەستن زۆر بەسانایی پارەو موخەسەساتی لە حکومەتی بریتانی وەردەگرت [١٦].

ڕووداوەکانی بەدواداهاتوو سەلماندیان کە حکومەتی قاجاری لەوە دەستەوەستان تربوو کە لە ڕووی ئەو شەپۆڵە ڕام کەرە نوێیە بوەستێ , ئەو کارەی وایکرد کە هێزی ناوەخۆ و دەرەکی دیاری کراو مەیلیان هەبێ

بۆ گۆرانێك لە جۆرێکی تایبەتی کە ڕێگربێ لە بەردەم ڕوودانی _ ئەو گۆرانە بنەرەتییەی کە سەرەتاکانی لە ئاشۆدا ڕوون بوو [١٧].

سەرەرای ئەوهەڵوەشانەوەی دەوڵەت پێ ی گەیشت و هەڵکردنی بایەکانی گۆران بە ئاراستەی گەیشتنی هێزی نیشتمانی بۆ حوکم ئەوەگوران بەو جۆرە ڕوویدا کە چەند هێزێکی دەرەکی ویستیان , ئەوە بوو ئینگلیزیش کشاندنەوەی هێزەکانیان لە ئێران کاریان کرد لە پێناو بەدیهێنانی دەسەڵاتێکی بەهێز لە ولآتدا کە خزمەتی بەرژەوندییەکانیان بکات و پارێزگاری دەسست ڕۆیشتنیان لە کۆنترۆڵ کردنی بیرە دەوڵەمەندەکانی پترۆڵ لە ئێران بکات [١٨]. بەرامبەر بەبەهێزبوونی بازووی بزوتنەوەی نیشتمانی و ئەولایانانەی ئارەزووی گۆرانێکیان دەکرد کە بگونجێ لەگەڵ ئەوهێزانەی کەلەناوچەکەدا سەریان هەڵدا بارودۆخ ڕێك کەوت بۆکەسایەتییەك هەموو مەرجە پێویستیەکانی لەتێروانینی لایەنەخاوەن بەرژەوەندییەکان تیایدا فەراهەم بوو بۆئەنجامدانی گۆران ئەوەبوو ڕەزاخان پەیدابوو [١٩]. سەرکردایەتی کودەتایەکی کردو ئێرانی لەسەرلێواری قۆناغێکی نوێ دانا .

کودەتای ٢١ی شوباتی ١٩٢١ لە ئێران

ماوەی پێش ئەم کودەتایە لەتەنگژاوترین ماوەکان بوو لە مێژووی ئێراندا , ڕەنگدانەوەی نەخۆشییە کۆمەلآیەتی و سیاسی و ئابوورییەکانی کۆمەڵگای ئێرانی

بوو , ئەوانەی لەئەنجامی داگیرکردنی ئێران بۆچەندین جاری بەدوای یەکتردا هاتوو لەلایان دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەورۆژانە تووشی ئێران ببوون , ئەوەبوو بەلاوازی و بێ هێزی و پارچە پارچەیی لەشەری یەکەمی جیهانی دەرچوو , سوپاکانی بێگانە بەدەرواتنی تارانی پایتەخت هەموو خاکەکەیان داگیر کردبوو [٢٠].

ئەوهێزە بریتانیانەی لەشەری یەکەمی جیهانییەوە هاتنە ولآتەکەوە , تیایدا مانەوە بەبیانووی بوونی هێزی ۆڤییەتیانەی لەساڵی ١٩٢٠ باکوری ئێرانیان گرت تیایدامانەوە بۆ یارمەتی دانی کۆماری گەیلان و لەچاوەروانی واژۆکردنی رەشنووسی رێککەوتنامەیەك لەگەڵ حکومەتی موشیر ئەلدەولە لەئەنجامی وتوێژ لە نێوان هەردوو لادا کە لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠ دەستی پێکردبوو [٢١].

لەسەر ئاستی ناوەخۆش رژێمی قاجاری گەیشتە نزمترین پلەکانی لێك هەڵوەشانەوەی خۆی و بووە بارێکی قورس لەسەر ئەستۆی ئەو ئێرانیانەی کە لەنزیکترین کاتدا چاوەروانی کەوتنی رژێمیان دەکرد. [٢٢]

ئەوەی بارودۆخەکەشی خراپتر کرد ئەوەبوو کە ئێران بەزستانێکی توند تێ پەردەبوو بەتایبەتی لەبەشە باکورییەکانی , ئەوەی کەبووە هۆی خراپی وەرزی کشتوکاڵی و دەسەلآتی قاجاری نەیتوانی خواردن بۆ دانیشتوان فەراهەم بکات. [٢٣]

سەرنەکەتنی حکومەت لەرووبەرووبوونەوەی ئەم رووداوانە بووە مایەی هەرایەکی گشتی لەنێوان نوێنەرانی ئەنجوومەن لە ئەنجامیشدا حکومەتی موشیر ئەلدەولە رووخا لەدوای ئەوەش تەنگەژیەکی وەزاری روویدا کەسێ کەس وەزارەتیان پێك هێنا ئەوانیش یەك لەدوای یەك ئەمانەبوون مستەوفی ئەلمەمالیك و فرمان فرما ئینجا موشیر ئەلدەولە لەجارێکی تر لە کۆتایشدا ساهدان وەزارەتەکەی پێك هێنا کە ئەویش لەلایان نوێنەرانی ئەنجوومەنەوە بەوە تاوانبار کرا کە لەزیاترین وەزارەتە ئێرانییە کانە لەرووی لایانگری بریتانیاوە [٢٤].

لەسایەی ئەم بارودۆخانەدا بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی چووە قۆناغێکی نوێوە و هەڵکشانێکی شۆرشگێرانەی فراوانی بەخۆوە بینی کەوای لێهات نەك هەر هەرەشە لەدەسەلاتی قاجاری لاواز بکات بەڵکو هەرەشەی لە هەموو هێزە دەرەکییە خاوەن بەرژەوندییە گرنکەکان لەئێران دەکرد بەتایبەتی بریتانیا , لەبەرئەوەی رژێمی قاجاریش توانی رووبەروونەوی ئەم شەپۆڵە گێرەی نەبوو ئەوە هێزێکی دەرەکی هاتەپشت و چەند هێزێکی ناوەخۆ پشتگیریان لێ دەکرد لەپێناو گۆرانێك لەجۆرێکی تایبەتی رێگا بگرێ لەوگۆرانە بنەرەتیەی کەسەرەتاکانی لە ئاسۆدا بەدیار کەوتبوو و رووداونی نزیك ببووەوە [٢٥].

بریتانیا دەست پێشخەری کرد بۆئەو هێزانەی کێشیان زیاتر و دەست رۆیشتنیان گەورتر بوو لە ئێران بۆ وازهێنان لەسیاسەتە کۆنەکەیان و بۆئەوەی رۆڵێکی شاراوەیان بۆبکێشی لەشانۆگەرییەك کە لایەنە رووکەشەکەی بەنیشتمان پەروەری داپۆشرابوو و پاڵەوانەکانی خۆجێ ی بوون بۆ ئەنجامدانی گۆران و بۆرێگا گرتن لەبەردەم هەرگۆرانێك و لەهەرجۆرێك [٢٦].

هەڵوێستەکە دووانەیەکی دەویست کەپێك هاتبایە لەسیاسەتمەدرێکی ناسراو و سەربازێکی دڵسۆز و ئازا یەکەمیان رۆژنامەنوسێکی لێهاتوو ناسراو و ناوی سەید زیادئەددین تەباتەبائی بوو [٢٧].

ئەو کەسەی بنووسی رۆنامەی ( رەعد ) ی بەجێ هێشت و پێش رووادنی کودەتا سەربازییەکە هاتە ناوسیاسەتەوە , و بەیەکێك لەهاورێیەکانی وتبوو , لەسەرمانە خۆمان بەئەرکەکە هەڵبستین [٢٨].

هەرچی دووەمە ئەوە کۆلۆنێل رەزاخان بوو , ئەوکەسەی ماوەیەك بوو چاوی بریبووە جێ بەجێ کردنی کودەتاکە [٢٩].

رەزاخان توانای جیاوازی لە هاورێیەکان و هاو کوفەکانی خۆی لەئەفسەرانی تیپی قۆزاق هەبوو لەبەرئەوەهەڵبژاردنی بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکە هەر لەخۆرا نەبوو

بەڵکو وەکو یەکێك لە مێژوو نووسە بێگانەکان ( هەڵبژاردنێکی ) بوو [٣٠].

ئەوە تاکەکەسێك بوو کەتوانای دامرکاندنەوەی ئاشووبە ناوەخۆییەکانی لەلایەك و وەستاندنی هەڵکشانی شۆرشگێرانەی بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی لەلایەکی ترەوە هەبوو [٣١].

لەدوای ئەوەی حکومەتی ئەحمەدشای قاجار نەیتوانی ئەمە جێ بەجێ بکا , ئەوە رەزاخان ئەوپیاوەگونجاوە بوو کەماوەیەکی درێژ بوو رووداوە ئێرانییەکان چاوەروانیان دەکرد بۆئەوەی یەکلایان بکاتەوە و بارودۆخی پەشێوی کۆتایی پێ بهێنێ [٣٢].

رەزا لەشارۆچکەی ئەلشت لەسەوادکۆی سەربەهەرێمی مازندەران یەکێك لە هەرێمە گرنگەکانی باکور لە ٦ی ئاداری ١٨٩٧ لە باوکێکی فارسی کەناوی عەباس قلی خان کە بەپلەی ئەفسەر لەسوپا کاری دەکردو دایکێکی قەفقاسی رەگەز لەدایك بوو دایکی لەدوای دەست بەسەر داگرتنی روسیا بەسەر هەرێمەکە بە گوێرەی پەیماننامەی تورکمانچای زۆر لە مازندەران نەمایەوە , لەدوای مردنی باوکی , لەگەڵ دایکی چوونە تاران ئەمەش لەدوای روودانی ناکۆکی خێزانی ئەبوو خرایەماڵی خاڵی لەدوای ئەوەی دایکی مێردی بەپیاوێکی تر کرد کە ئەویش ئەفسەر بوو لەسوپادا , بۆیە رەزا لە خانەوادەیەکی سەربازی پێ گەیشت , پیاوەکی و دریەتی و پشت بەخۆ بەستنی بەخۆ لە منداڵیەوە لێ فێر ببو [٣٣].

لەتەمەنی پازدە ساڵی رەزا چووە تیپی قۆزاق ئێرانی , بەهۆی ئەو لێهاتووییەی لەسەرەتای چوونە سوپاوە پیشانی دا پلە بە پلە لە پایە سەربازییەکان بەسەرکەوت تاکو لەپێش ئەو کودەتایەی لەساڵی ١٩٢١ سەرکردایەتی کرد , لەتەمەنی چل و دوو ساڵی گەیشتە پایەی کۆلۆنێل [٣٤].

لە ئێران لەزۆربەی کاتەکاندا سازش کردن تەنها یەکێك بوو لە ئامرازەکانی بەدیهێنانی ئامانجەکان بەڵکو پەنابردنە بەرهێزێکی دیاریکراو بۆ پشت پێ بەستنی

کە یەکێك لەئامرازەکانی هاوسەنگ کردن بوو لە واقیعێکی تاڵدا کەوڵات تیایدا دەژیا لەم بارودۆخەشدا پشت بەستنی ڕەزاخان بەهێزێکی دەرەکی کەسەنگی خۆی هەبێت لە گۆڕەپانی ئێرانیدا کارێکی سەیر نییە هەروەها گەرانی بریتانیەکانیش لەهەمان گۆڕەپاندا کارێکی نائاسایی نەبوو لەئێراندا بەمەش هەڵپەکردنی ڕەزاخان لەگەڵ ویستی بریتانیەکان بۆ حکومەتێکی بەهێز یەکی گرتەوە کە ئێران یەکبخات و لەڕووی هاتنە ناوەوەی دەوڵەتە گەورەکانی تر بۆ ئێران بوەستێ و لەهەمان کاتیشدا بەرژەوەندییەکانی مسۆگەر بکات ئەوکارەی کودەتای ساڵی ١٩٢١ لێکەوتەوە [٣٥].

ئێرانییەکان بەگشتی ئەو بیرو باوەڕەیان هەبوو , کە بریتانیەکان ڕەزاخانیان گەیاندە دەسەڵات[٣٦] .

ئەوانەی نەك هەر کودەتایەکە بە بیرۆکەیەکی بریتانی دادەنێن بەڵکو خۆیان بەوە ماندوو دەکەن کە بیسەلمێنن کە بریتانیا لەهەموو بەستێك کە ڕەزاخان بری بۆگەیشتنە دەسەڵات یارمەتیان داوە [٣٧].

لەم بیرو باوەڕەشیان پشت بەزیاتر لەبەڵگەیەکی بەرجەستە دەبەستن , پەیوەندی کردنی بەپیاوی هەواڵگری بریتانی ئەدموند ئیرونساید Eiranside ئەوەی کەدوای دەربرینی سەرسورمانی پێ ی گەیاندیە پایەی سەرکردەی هێزەکانی قۆزاق [٣٨].

ئەمەش گومان نایگرێتەوە ئەوەبوو جارێك لەبارەیەوە وتبووی ( ڕەزاخان ... تاکە پیاوە کە بتوانێ ئێران رزگاربکات ) [٣٩]زیاتریش لەمە پێش نۆ ڕۆژ لەڕوودانی کودەتاکە ڕەزاخان لەگەڵ ناوبراودا کۆببوەوە . ئەوکارەی کە جەخت لەسەر بوونی دەستی ئەو لەکودەتاکە دەکاتەوە , هەروەها بوونی ژمارەیەکی تری ئەفسەری بریتانی وەکو راوێژکاری شەکلی لەتیپە قۆزاقیەکە [٤٠], پشتگیرییەکی مەعنەوی بەڕەزاخان دا لەکاتی کشانی بەسەر تاراندا , وەڵامی کۆلۆنێل سمث

جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە [٤١].

رۆڵی لەکودەتاکە کاتێك کەوتی ( داوام لێکرا راوێژکاری سەربازی پێشکەش بکەم و وەکو مەشق پێکەرێك لەوێ ئەو راوێژ کارییەم پێشکەش کرد ) [٤٢]نەك هەرئەوەندە بەڵکو بریتانیا سێ ئەفسەری گەورەی بەکارهێنا . [٤٣]بۆ بەشداری کردن لەکردەوەی کودەتاکە ئەوانیش هاورد Hawerd و سمارت Smart و نۆرمان Norman[٤٤]بوون ئەمانە چووبوونە جێگای ئەو ئەفسەرە روسانەی کەرەزاخان بۆرازی کردنی بریتانییەکان لە تیپی قۆزاقی لای بریبوون [٤٥]لەلایەکی تریشەوە جازانی لە کتێبەکەی ( سەرمایەداری و شۆرش لە ئێران ) باسی کردبوو کە بریتانیا توانی کەسایەتی لواو بۆ کودەتای ١٩٢١ بدۆزێتەوە رۆژنامە نووسێك کەئەویش سەید زیائەددین تەباتەبائی کە پێشتر هاوکاری لەگەڵ ئینگلیز کردبوو لیوایەکی قوزاقی ئەویش رەزاخان بوو بەبێ پەیوەستی ئەرستۆکراتی هەڵبژاردنەکەش لەکاتێکدا روویدا کە چەندین لە میرە ئەرستۆکراتییەقاجارییەکان ئامادە باشی خۆیان راگەیاندبوو بۆ ئاراستەکردنی کودەتاکەی [٤٦].

لەکاتێکدا کە کوتام لە مەکییەوە ناوی شەش کەسی پاڵێوراو بۆ جێ بەجێ کردنی کودەتاکە دەهێنێ [٤٧].

ئەوەی جەخت لەسەر ئەمەش دەکاتەوە برسی کوکس B.Cox لە کاتێکی زووەوە پێشینی ئەوەی کردووە کە رەزاخان ( ئەو کەسە بوو کەتوانی ئەنجامدانی گۆرانی داواکاراوی لە ئێران هەبێ ) [٤٨].

کودەتای شوباتی ١٩٢١ هیچ کاردانەوەی نەورژاند نەك هەرلەلای موفەوەزییەی بریتانی بەڵکو لەلالی هەموو ئەو بێگانانەش کە لەئێران بوون ئەوانەی لەهەر وروژانێکی گیروگرفت لەولاتدا دەتوقین لەمەشەوە سەیر نییە ئەگەر موفەوەزییەتی بریتانی ئەوانی دڵنیاکردبێتەوە لەوەی کودەتایەکە زیان بە بارودۆخیان لە ئێران ناگەیەنێ [٤٩].

بۆئەوەی لەدەوری خۆی ئەوروژێنێ موفەوەزیەتی بریتانی نوێنەرێکی خۆی لەگەڵ ئەمیر موعین نوێنەری ئەحمەدشا و ئەدیب ئەلسولتە نوێنەری سەرەك وەزیران بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ رەزاخان نارد , نامەیان لەشاو بریتانییەکان هەلگرتبوو بۆ رازی کردنی بە نەچوونە تاران بەم ژمارە گەورانە لەسەربازان [٥٠].

لەهەمان ئاراستەشدا , بریتانییەکان کاتێك بۆیان دەرکەوت کەبەهێزی دژایەتی کردنی میللی بۆ رۆلییان لە کودەتاکە کاریگەری لەسەر ناوبانگیان هەبووە بە رەزاخانیان راگەیاند کەرێککەوتنامەی ساڵی١٩١٩ لەگەلیاندا هەلبوشێنێتەوە , ئەمەش لەبەر ئەوەی پێیان وابوو کەدەتوانن بەرامبەر بە هاورێیەتی سەری دەسەلات لەئێران و مسۆگەرکردنی هەلوێستی بەرامبەریان واز لەرێککەوتنامەکەش بهێنن [٥١].

چوونە سەرتەختی ئێران

گۆران بەلەسەر خۆیی بەلام بەبەردەوامی روویدەدا [٥٢], رێگاش خۆش نەکرابوو لەبەردەم ( پیاوی ئێرانی ئاسنین ) [٥٣]ئەوەبووە ئەو سەربازە مازەندەرانییەی داوی شکۆمەندی بەدەستی بەهێزی گرتبوو زانی کەمانەوەی لەسێبەردا مایەی ئەوەیە کە ئاواتەکانی بەدی بهێنێت , بارودۆخی ناوەخۆی ئێران و تێروانین بۆشایەتی و کاریگەری تریش لەوانە بوویبیتەهۆی لەناوبردنی ئەوهیوایانەی بۆخۆی کێشابوون [٥٤].

لەیەکەم رۆژ کەهاتە تاران ئەحمدشای قاجاری دلنیاکرد کە کودەتایەکە نەخشەی بۆ کێشراوە و پلانی بۆداندراوە بەمەبەستی رزگارکردنی شایەتی لەشۆرش ئەویش رازی بوو [٥٥].

رەزا شا دەیزانی چی دەکات , لەوکاتەی بەهەموو شێوەیەك کاری دەکرد بۆ بەهێزکردنی شوێنی خۆی و سوپا , زیاتر لەشا نزیك دەبووەوە ئەوەبوو رۆژنامەی

( الاتحاد ) ی داخست , ئەو رۆژنامەیەی وتارێکی دژی ئەحمەدشا بڵاوکردبووەوە لەکاتی سەفەرکردنی شا بۆ ئەوروپا [٥٦]. بەلاَم لەهەمان کاتیشدا هانی شای دا بۆ مانەوە لەئەوروپا بۆ ئەوەی لەدەرەوەی ئێرانی بیهێڵێتەوە [٥٧].

رەزاخان لەماوەی پێنج ساڵ توانی خۆی بکاتە بەرزترین دەسەلآت لە کاروبارەکانی ناوەخۆ و دەرەکییەکان , توندرین دوژمنەکانی عەبقەریەتی ئەو رەت ناکەنەوە ئەوەی بە سەرکەوتوویی توندی نادرشای لەلایەك و وەسیەتە سیاسییەکانی ماکیاڤیلی لەلایەکی تر لەگەڵ یەکتری کۆکردەوە ئەوەبوو توانی سوپا یەکبخات و دەسەلآتێکی مەرکەزی دابمەزرێنێ و پیاوانی ئاینی رازی بکات و ئەنجوومەنی وەزیران کۆنترۆل بکات و ئەنجوومەنی نوێنەران مۆنۆپۆل بکات [٥٨]ئەو بریتانیایەی کەیارمەتی رەزاخانی دا لەکاتی جیێ بەجیێ کردنی کودەتاکە دوور نەبوو لەهەنگاوەکانی گەیشتنە تەختی ئێرانی ئەوەبوو جیێ دەستی بریتانی لەهەموو هەنگاوەکان و رۆڵی نەخشە بۆکێشراو بەپیێ ی پلانێکی بابەتیانە بۆ لابردنی ئەحمەدشای قاجار لەسەرتەختی ئێرانی دیاربوو [٥٩]. لۆرین لەبرووسکەیەکی نهێنی هاوکاری کردنی بریتانی لەگەڵ رەزاخان شرۆڤە کردبوو وتبووی ( زێدەرۆیی ناکەین بڵێین کەبەبیێ دان بۆ خۆداگرتنی حکومەتی بریتانیا ئەوەقورسی ئەرکی رەزاخان دەکرا مەترسی داربووایە و هەلەکانی سەرکەوتنی کەم بووایە ) هەروەها وتبووی ( دان بەخۆداگرتن گەیشتە رادەی یارمەتی دانی پراکتیکی و بەگەواهی دانی ژمارەیەکی زۆر لەئێرانییەکان ئەوەبوو سەرەرای ئەوەی داواکارییەکانی حکومەتی بریتانی نەچاسپاندرابوو ئەوە لە هەندیێ کاتی دیاریکراو لە داتە پینی ئابووری هاوکاری مەعنەوی لەلایان حکومەتی بریتانی بە حکومەتی ئێرانی بەخشراوە ) لەبەرئەوەی بەگوێرەی وەزیری موفەوەزی بریتانی لە تاران ئێران توانی (بەمەترسی دارترین قۆناغ لەبوونی خۆی دا تیێ بپەریێ [٦٠] بەتایبەتی دوای یارمەتی دانی بریتانی بۆ رەزاخان لەسەرکۆتایی هێنانی حوکمی

شێخ خەزعەل لەسەرمیرنشینی موحەمەرە کە لەسالّی ۱۹۲٤ پلان بۆ دانانی دەستی پێکردبوو [٦١].

گولەی رەحمەت لەرژێمی قاجاری درا ، ئەورژێمەی لەورۆژانەدا تەنها بنایەك بوو لەدار کەلەسەر پێچکەی داتەپیوو وەستابوو . شتێکی سەیر نییە کە بریتانیا لەقۆناغی دوای کودەتا تاکە راستی رۆڵی خۆی ئاشکرا بکات بۆ جەخت کردنەوەش لەسەر ئەورۆڵە دەقی نێردراوی وەزیری کۆلنییەکان چەرچەڵ بۆ برسی لۆرین سەفیری ولآتەکەی لە ئێران دەخەینە روو ئەوەبوو وتی : ( هیوادارین کەرەزاخان لە کودەتای دووەمیدا سەرکەوتووبێ .. و ئێمە پێمان ناخۆش نابێ کە بگاتە دەسەلآت لەئێران [٦٢].

ئەویش بەبروسکەیەکی نهێنی وەلآمی دایەوە وە تیایدا دەڵێ کە ( کەس نییە گومان لەوەبکات کە رەزاخان دەبێ بە شا [٦٣]. شتێکی بەسوود دەبێ لێرە باس لەکاردانەوەی سۆڤییەت بکەین بەرامبەر بەگەیشتنی رەزاخان بۆ تەختی ئێران لەرەلەری روون بوو بەرامبەر بەهەڵوێستێکی ئاوەها ئەوەبوو رۆژنامەی ( برافدا ) ی سۆڤییەتی رۆژی ۱۰ی کانوونی یەکەمی سالّی ۱۹۲٥ ئەوەی بەگوێرەی رای دەکیۆمێنتە بریتانییەکە وادیارە کە نووسەری وتارەکە زانیاری تایبەتی سەبارەت بەبارودۆخ لەئێران پێگەیشتووە بەبێ ئەوەی خۆی بیخاتە بەردەمی و داوای لێکرد کەبلآوی بکاتەوە نووسەرەکە وەسفی گەیشتنی رەزاخان بەدەسەلآت دەکات و دەڵێ : ( لە ئەنجامی ئاشتبوونەوە لەنێوان رەزاخان و هەندێ رەگەزی کۆنە پارێز لەوانەی کە لەکاتی هەوڵدانی دامەزراندنی رژێمی کۆماری دژایەتیان دەکرد .. رەزاشا پێش خستنی خێزانی قاجاری چووە گفتوگۆی دوور و درێژ لەگەڵ دژایەتی کەرانی پێشووی و بەڵێنی پێدان بەوەی کە پارێزگاری جیاووکەکانیان بکات ۹ هەر لەم ئاراستەیەشدا نووسی وتارەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ( لەئەنجامی هاوپەیمانیەتی کردنی رەزاخان لەگەڵ رەگەزە کۆنە پارایزەکان کۆمەڵە

پێشکەوتنخوازەکان دەکاتە قوربانی ئەوانەی کە لەپێشتردا پشتگیرییان لێکردبوو و دەچنە ریزی دژایەتی کردنی [٦٤].

لەلایەکی تریش برووسکەیەکی نهێنی کەولیەم تیرز بۆ وەزارەتی دەرەوەی بریتانیای ناردبوو دەربربوو لەنەتوانینی دەست نیشان کردنی هەلۆێستی سۆڤیەتی تیادا وتی : ( شتێکی ئاسان نییە هەلوێستی راستەقینەی حکومەتی سۆڤیەتی بدۆزینەوە رۆژنامەگەری سۆڤیەتی بەپارێز بوو لەبارو دۆخی ئێران و سیاسەتمەدەرانی سۆڤیەتیش بێدەنگییان هەلبژارد [٦٥]. کەچی راستی کارەکە ئەوەیە کە مۆسکۆ حەزناکات رەزا بگاتە تەختی ئێرانی و بەتوندی دژایەتی ئەمەی دەکرد لورین لە برووسکەیەکی نهێنی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بریتانی ئاماژەی بەوە کرد کە لەسەرچاوەی باشەوە زانویەتی کە وەزیری موفەوەزی سۆڤیەتی لە تاران ( بەتوندی دژایەتی ئەوە دەکا یان رازی نییە بەوەی کە رەزاخان ببێتە شا [٦٦]رەزاخان مەبەستی بوو هەموو بارودۆخەکان ئامادە بکا بۆ ئەوەی خۆی بەتەنیا لە گۆرەپانەکەدا کاریگەربێ ئەوەبوو توانی ئەنجومەنەکە والێ بکات کە نازناوە سەربازی و سڤیلییەکان هەلبوشێنێتەوە ئەم هەنگاوەشی پشتگیری کردنێکی جەماوەری فراوانی لە هەموو ئێراندا دەستەبەر کرد ئەوەی کە بووە مایەی ئەوەی ئەو کەسانەی لە دەوروبەری بوون خۆشیان بوێت و دوژمنەکانیش زۆر نازناویان لەدەست دا کە لە پێش خەلك پێ ی ناسرابوون [٦٧].

لە ماوەیەکی کورتیشدا دەستی گرت بەسەر دانان یان لابردنی وەزیرەکان و خەلكانی تریش تەنانەت لەسالی ١٩٢٣ کاتێك بووە سەرەك وەزیران لە سێبەری شایەك کە خاوەنی هیچ شتێك نەبوو لە ولاتەکەی لەدوای ئەوەی رەزاخان بەشێوەیەکی شەرگی دەسەلاتی دیکتاتۆری مسۆگەر کرد لە پاش ئەوەی بەشێوەیەکی پراکتیکی پێ ی درابوو کە داوای کرد بەشا دابنرێ لەسەر تەختی ئێران و رەشنووسی یاسایەك پێشکەش کرا لە لایان دامار و تەیمورتاشی و هەندێ

نوێنــەری لاینگــری تــر داوایــان کــرد کــە ئەنجوومەنەکــە راگەیانــدێك دەربکــات بەئەنجامی دەوڵــەتی قاجاری لــە ٣١ ی تــشرینی یەکــەمی ١٩٢٥ دەنگدان لەســەر پرۆژەکە کراو رەزامەندی لەسەر پیشاندرا , هەشــتا کەسی پــێ رازی بــوون پێــنج کەس دژی بوون و سی ئەندام لەکۆی (١١٥) ئەندامی ئامادەبوو دەنگیان نەدا [٦٨].

رەزاخان بە شای ئێران داندرا بەناوی ( ئیمبراتۆر رەزاشای پەهلەوی ) [٦٩].

ئەمەش دوای ئەوەی خۆی لەئاهەنگی تاج لەسەر دانان تاجی لەسەر خۆی نــا [٧٠], بەمەش رەزاخان هەموو هیواکانی بە ئاراستەی بــەدیهێنانی شۆرشــێکی گــشتی لــە ئێران کۆتایی پیێ هێنا [٧١].

١- جورج لنشوفسكي , الشرق الاوسط - الشؤون العالمية - ترجمة جعفر الخيـاط , بغداد , ١٩٥٩ ص٥٩ .

٢- رۆژئاواییەکان ئێستا هەوڵ دەدەن جەخت لەسەر مەســەلەی ئــاوە شــلتێنەکان بکەتەوە بۆ پاساو هێنانەوە بۆ دەست تێوەردانیــان لەناوچــەی کەنــداوی عــەرەبی بۆدەست بەسەر داگرتنی کانگانی پترۆل , راستی مەســەلەکەش ئەوەیــە کــە ئەمــە وردنییــە , ئەمــەش بــەهۆی ئــەو گەشــەکردنە تەکنــە لۆجییــە لــە رادەبــەدەرەی هەریەکە لە سۆڤییەت و ئەمریکییەکان پیێ ی گەیشتبوون .

٣ - أحمد عبدالقادر الجمال من مشكلات الشرق الوسط القاهرة / ١٩٥٥ / ٥٣٥

٤ - جهانگیز قائم مقامی , تحولات نظام ایران ازاغازقرن بـازدهم تـا سـالی ١٣٠١ . چاپ اول تهران , ١٣٢٦/ ص ٢٤ , د. علی اکبر بینا , تاریخ سیاسـی و دبلوماسـی ایران ازکلنا یـادر کـرکمن چـاپی ١١٣٤ - ١٢٤٣ , تهـران ١٣٤٢ - ١١٦ - ١٨ , د. صالح محمد العابد موقف بريطانيـا مـن النـشاط الفرنـسي الخلـيج العربـي ١٧٩٨ - ١٨١٠ , بغداد , ١٩٧٩ , ص ١٥٩ .

A.Z.Rubinsein

Soviet policy towarol , turkey , iran and afhanistan the

Dyanamies of Influence , u-s-a, ١٩٨٢ , p.٣

٥– احمد عبدالقادر . الجمال / المصدر السابق / ص ٥٣٦ , جورج لنشوفسكي / المصدر السابق u-s-a , ١٩٨٢ , p.٣ ص ٦٣

٦ – د . كمال مظهر احمد / دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر / بغداد / ١٩٨٥ / ص ١٠٤ .

٧ – ( دراسات أيرانية ) مجموع بحوث / مركز دراسات الخليج العربي / ترجمة عبدالجبار ناجي البصرة / ١٩٨٣ / ص ٦٦ .

٨ – A.Wilson The Gulf-london , ١٩٥٤ , p.٢٥٨ , R.Graham , Iran .
The illvison of power , London , ١٩٧٨ , p.٢٣.

٩ – م . ع منشور كركاني / سياست دولت شوروى درايران از ١٢٩٦ تا / ١٣٠٦ / تهران / ١٣٢٦ ص ٢٤ / لوريمر / دليل الخليج / القسم التأريخي / ترجمة مكتب امير دولة قطر / قطر / بل ص ٤٧٦ .

١٠ – محمد كامل عبدالرحمن / سياسة ايران الخارجية في عهد رضاشاه ١٩٢١ – ١٩٤١ رسالة ماجستير غير منشورة / بغداد / ١٩٨٦ / ص ١٣–١٤

١١ – مقتبس في اسعد محمد الجوارى / سياسة ايران الخارجية في عهد احمد شاه ( ١٩١٩ – ١٩٢٥ ) رسالة ماجستير غير منشورة / بغداد / ١٩٨٧ ص ٥٨ .

١٢ – د . كمال مظهر أحمد / المصدر السابق / ص ١٠٥ .

١٣ المصدر نفسه / ص ٣٨ .

١٤ – راشد البراوى / حرب البترول في الشرق الأوسط / القاهرة / ١٩٦٢ / ص ١٦٥ سليم و اكيم ايران في الحضارة / بيروت / ١٩٧١ / ص ١٢٥ / ريدبولا / بريطانيا و الشرق من أقدم العصور حتى ١٩٥٢ / بغداد / ١٩٧٥ / ص ١٦٣ .

١٥ – د . كمال مظهر احمد / المصدر السابق / ص ٤٠ – ٤١

١٦ – ( مذكرات شاه ايران المخلوع محمد رضا بهلوى ) مركز دراسات الخليج العربي / البصرة / ١٩٨٠ ص ١٧ / احمد عبدالقادر الجمال / المصدر السابق / ص ٥٤٠ .

١٧ – مقتبس من د . كمال مظهر احمد / المصدر السابق / ص ٣٨ .

١٨ – طلال مجذوب / ايران من الثورة الدستورية حتى الثورة الاسلامية ١٩٠٦ – ١٩٧٩ . بيروت / ص ٢٨٨ .

١٩ – د . كمال مظهر احمد / المصدر السابق / ص ٣٩ .

٢٠ – N.R.Keddie , Iran . Religion , Politics and Society , London , ١٩٨٠ . P.١٢٨ , M.A.Fzsimons , Empire by Treaty and The Middle Eastin the Twentienth century , Northre DARNE ١٩٥٤ , P.٢١.

٢١ – R.K.Ramazani , The Foregin police of Iran ١٥٠٠ – ١٩٤١ verginia , ١٩٦٦ , p . ١٧٥ .

٢٣ – ( The Times ) , March ٢٨ . ١٩٢١ .

٢٤ – R.K.Ramazani , op.cit , p . ١٧٥ .

٢٥ – د . كمال مظهر احمد / المصدر السابق / ص ١١٠ .

٢٦ – محمد كمال عبدالرحمان / سياسة ايران الخارجية / ص ٤٠ .

٢٧ – زید ئەددین لە سالی ١٨٨٨ لە دایك بوو / لە بنەماڵەیەکی ئاینی ناسراوی یەزد بوو / لەماوەی ١٩١١ – ١٩١٢ لە پاریس خوێندبووی رۆشنبیرێك بوو لە جۆری یەکەم خووی بە ئەدەب و شیعر گرتبوو و ئاگاداری مێژوو بوو , سەرکەوتوویی لە پیشەی رۆژنامە نووسی کاری کردبوو , و لە کۆتاییەکانی شەری یەکەمی جیهانی رۆژنامەی ( رەعد ) ی دامەزراندبوو ئەمەش ببووە سەرەنج راکێشانی رۆشەنبیرە ئێرانی و بێگانەکان کە گرنگیان بە مێژووی ئێران دەدا , بە

بوێری و حەزکردن لە موغامەرەکردن ناسرابوو لە راستیدا زیاتر لە داوێك هەیە کە سیفاتی زیائەددین و نوری سەعید لەگەڵ یەکتری کودەتاکەوە . بگەڕێوە سەر :

د . کمال مظهر احمد / المصدر السابق / ص ١٢٧ – ١٢٨ .

٢٨– رەمەزانی باس لەوە دەکات کە ئەو هاوڕێیە بەهار بوو ، ئەویش ساسەتمەدارو رۆژنامەنووس بوو .

٢٩ – R.K. Ramazani , op- cit , p.١٧٥ .

٣٠ – R.Graman , op.cit , p.٥٤.

٣١ – د . محمد کمال عبدالرحمن / سیاسة ایران الخارجیة / ص ٤٠ .

p.Tapper , The confict of tribe and state in Iran and Alghanistan , New York , ١٩٨٠ , p.٢٥

٣٢ – د . کمال مظهر احمد / المصدر السابق / ص ١٢٩ .

D.N – Wibber , contemporary Iran , London , ١٩٦٣ , p.٧٠ .

٣٣ – عبداللة رازی / تاریخ ایران / تهران / ١٣١٧ / ص ٧٦٣ – ٧٦٤ / فتح اللة همایونقز / مرد برزك تاریخ / جاب اول / دریهمن ماه / ٥٣٥ / ص ٦٣ نویخت / شانهشاه بهلوی / قسمت اول / مطبعة مجلس / بلا ص ٢٩ ( ایران بین عهدین العهد القاجاري – العهد البهلوی ) منشورات جدیدة البلاغ / بیروت / ١٩٣٤ / ص ٣٥–٣٦ / د . کمال مظهر احمد / المصدر السابق ص ١١٣–١٢٦ .

D.N. Wilber . Rize shah pohlevirs , The Ressurrction and Recontsuetion of Iran , New York , ١٩٧٥ , pp.٤,١٥ ,

R.Kapns cin ski , sha of shahs , New York , ١٩٥٣ , p.٥.

٣٤ – Abarahamien , Iran between two Revlution , New York . Jersy , ١٩٨٢ , p . ١١٧ .

٣٥ – محمد کامل عبدالرحمن / سیاسة ایران الخارجیة / ص ٣٧ .

F.Hallidday , Iran Dictatership and Derelepment , London ١٩٧٩ , p.٦٦.Iran, U-S-A , ١٩٧٥ , p.١٢.

٣٧ – R.K. Ramazani , op.Cit , p.١٧٧

٣٨ – محمد حسين هيكل / مدافع ايه الله / قصته ايران الثورة / القاهرة / بلا / ص ٣٦ / طلال مجذوب / المصدر السابق / ص ٢٨٨ .

٣٩ – مقتبس من محمد عبدالرحمن , سياسة ايران الخارجية / ص ٣٨

٤٠ – R.K. Ramazani , op , Cit , p.١٧٥ .

٤١ ئاماژە کردنی سەرەك وەزیران نەسرەت بەوەی کە کودەتاکە لەلایان کۆلۆنیل سمیث ئەنجامدراوە و موستە حیلە باوەر بکات کە وەزیر و موفەوەزیەتی بریتانی ئاگاداری ئەوەی نەبوون کە روویدا , بگەڕێوە سەر :

F.٠,٣٧١ / ٩٠٢٥ – E٩٧٢٠ / ٧٧ / ٢٤ , sir .p. Loraine to F.o , Tel .No ٢٨٧ . August , ٣٠ , ١٩٢٣ , p.٢

٤٢ – R.k. Ramazani , op . Cit , p . ١٧٥

٤٣ – مەلیکی قوراء بەهار باس لەوە دەکات کە رەزاخان پەیوەندی بەهێز و دۆستایەتی لەگەڵ ئەم کەسە ناوبراوانە هەبوو / بگەڕێوە بۆ ص٦٥.

٤٤ – R.K. Cottam , Nationlism in Iran , U-S-A .١٩٦٢ . P . ١٩٢ .

٤٥ – صلاح العقاد / السياسة الايرانية والاستعمار الجديد ( الساسة الدولية ) ( مجلة ) القاهرة العدد الرابع / السنة الثالثة / ١٩٦٦ / ص ٣٠ .

٤٦ -B.Jazani , Capitalizm and revolution in – Iran , London , ١٩٦٢ . p.p.١٢

٤٧ – R-W.Cottam . op . Cit , p . ١٩٢ .

٤٨ – M.Zonis , The poitical life of Iran , princetion , ١٩٧١

, p . ٢٠١ .

٤٩ – محمد كامل عبدالرحمن / سياسه ايران الخارجيه / ص ٣٨ .

٥٠ – ملك الشعراء / المصدر السابق / ص ١١٣ .

٥١ - R.W.Cottam , op .Cit . p . ١٩٤

٥٢ – E.Abrahmian , op . Cit , p . ١١٨ .

٥٣ – ( العراق ) جديده / بغداد / ٢١ حزيران ١٩٢٥ .

٥٤ – محمد كامل عبدالرحمن / سياسة ايران الخارجية / ص ٣٨ .

٥٣ – E.Abrahmian . ·p . Cit . p . ١١٨ .

٥٦ – ملك الشعراء بهار / المصدر السابق / ص ١٩٢ .

(Iran) ( Middle East Rresearch Institute University of pernnsy Irania ) . London . ١٩٥٨ , p . ١٨ .

٥٧ – F.O . ٣٧١ / ١٠٨٤٠ . Err ٢٥٢ , Tel very con Fidentideatial , p.

Loraire to F.O.No . ٥٣ . Morch ٢ . ١٩٢٥ , p.٣٣ , F.O . ٣٧١ / ١٠٨٤٠ . E٢٩٨٠ / ١٨ / ٣٤ , Tel . Con Fidentia , p.Loriant to F.O .No.٢١٧. June١٥–١٩٢٥ . p . ٢ .

٥٨ – R.K. Ramazani ,op. Cit .p.١٧٨.

٥٩ – محمد كامل عبدالرحمن / سياسة ايران الخارجية / ص ٣٨ .

٦٠ – F.٠,٣٧١ / ١٠١٤٥ , E ٢٤٢٣ / ٤٥٥ / ٣٤ , Sir p . Loraine to M.Mac Donatd , Tel . No . ٨٥. Feberuary rr , ١٩٢٤ , p . ٣ .

٦١– F.٠ ٣٧١ / ١٠١٣٧ – Majar . I . Ato F .O , British Legaoion , Tehran , October ٢٤ , pp . ٢١ – ٢٤

٦٢ – F.٠ ٣٧١ / ٧٨٠٩ , Tel . chmurchill to p . Loraine , No .

٣٦٩ .october , ٧ . ١٩٢٤ , p .١٧٥ .
٦٣ – F.٠ ٣٧١ / ١٠١٤٥ , E ٢٤٢٣ / ٤٥٥ / ٣٤ . Sir p . Loraine to M . Mac Donald , Tel . No . ٨٥ , February ٢٣ , ١٩٢٤ . p . ٣ .
٦٤ – F.٠ ٣١١ / ١٠٨٤٠ / E ٨١٤٥ / ١٨١٣٤ – M peters to Sir A.Chomberlain , Tel . No . ٨٩٠ , December , ١٩٢٥ .
I bid
٦٥ – F.٠ ٣٧١ / ١٠٨٤٠ / , Ell ٨٧٨٩ . Sir p . Lorainte to F.٠.
٦٦ – confidential , No . ٣٥٣ , November ٤ , ١٩٢٥ p . ١٣٩ .
٦٧ – ( The near East and andia ) , London , jun , ٢٥ , ١٩٢٥ , p . ٦٧٠ .
٦٨ – ( مذكرات رضا شاه ) ترجمة علي البصري / البصرة / ١٩٥٠ / ص ٢٣٢ .
٦٩ – سەبارەت بەو بابەتە بڕوانە :
( السياسة ) ( جديدة ) / ١٥ حزيران / ١٩٨١ ( المقتطف ) ( مجلة ) / المجلد ٦٧ / الجزء ( ٤ ) تشرين الثاني ١٩٢٥ .
٧٠ – محمد حسنين هيكل / المصدر السابق / ص ٤٧ / محمد وصفي أبـو مغلـي / ايران دراسة عامة / البصرة ١٩٨٥ / ص ٢٩٣ .
٧١ – M.E. Bonineand N.R.Keddie , Contiuty and change in moderen Iran , New York , ١٩٨١ , p.٢٥.

سەرچاوە : الدكتور صالح العمر، اسعد محمد زيدان، ايران في عهد رضا شـاه بهلـوي ١١٩٤١٩٢٥ـ

# سالنامەی نەزارەتی مەعاریفی عمومییە ( ١٣١٧ك )

وەرگێڕانی لە عوسمانییەوە : دلشاد هیوا

## ( پێشەکی )

(سالنامەی نەزارەتی مەعاریفی عمومییە[1] - سالنامەی وەزارەتی پەروەردە)، یەکێك لەو سالنامە گرنگ و دەگمەنانەیە کە تایبەتە بە ئەرك و فەرمان و ئامارەکانی هەموو خانە پەروەردەییەکانی سەر بە وەزارەتی پەروەردەی دەولەتی عوسمانی. ئەم سالنامەیە لە سالی ١٣١٧ی کۆچی لە لەلایەن (نەزارەتی مەعاریفی عمومییە)وە لە چاپخانەی عامرە لە (دارولخیلافە - ئەستەمبول)ی پایتەختی دەولەتی عوسمانی لە دووتوێی (١٤٩٦) لاپەڕەدا لەچاپ دراوە و بەرچاوڕوونییەکی تەواومان پێ دەبەخشێ لەسەر هەموو ئەو بڕیار و فەرمانانەی کە لەلایەن ئەم نەزارەتەوە بۆ تێکڕای دامودەزگا پەروەردەییەکانی دەولەتی عوسمانی دەرچووە. گرنگی سالنامەکە لەوەدایە کە زانیاری و ئاماری هەموو ویلایەتەکانی جیاکردۆتەوە و لەم نێوەندەیشدا بەشێکی ٢٠ لاپەڕەیی تایبەت بە (ویلایەتی موسل)ی تێدایە کە جگە لە (خانەقین و مەندەلی) کە لەچوارچێوەی ویلایەتی بەغدا دا ئامارەکانیان هاتووە، زۆربەی شار و شارۆچکە و گوندەکانی ئەوکاتەی کوردستانی لەخۆ گرتووە.

ئەوەی کە پێویست بە ڕوونکردنەوە بکا ئەوەیە کە لە وەرگێڕانەکەدا هەولم داوە پەراوێز بۆ ئەو ناو و زاراوانە دابنێم کە تایبەتن بە سیستەمی کارگێڕی و سەربازی عوسمانی ئەمەشم لە سەرچاوە ڕەسەن و باوەڕپێکراوەکانەوە وەرگرتووە و بەپێی پێویست ڕونکردنەوەم لەسەر داون.

## ویلایەتی موسڵ

| فەرمانبەرێتی | ناوەکان | پلە | مێژوو | ع | م |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| **بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە (مەعاریف)** | | | | | |
| وەکیلی بەڕێوبەری پەروەردە | محەمەد تۆفیق ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| فەرمانبەری ژمێریاری | عەباس ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ئەمین سندوق | میخائیل ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| فەرمانبەری فەخری مۆزەخانە | مۆسیۆ سێباستێن شاپل | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| **قوتابخانە ئامادەییەکان** | | | | | |
| **قوتابخانەی ئامادەیی موسڵ** | | | | | |
| مامۆستای بەڕێوەبردن و ژمێریاری پراکتیکی و تیۆری، مێژووی گشتی، ئوسوڵ دەفتەری[1]، زمانی فرەنسی، جەبر، داڕشتن و نووسین | محەمەد تۆفیق ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای زانستی ئایینی، عەرەبی، ئەندازیاری، زمانی فارسی و تورکی | ئیبراهیم ئەفەندی | ئەدیرنە ڕوئوسی[2] | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای جوگرافیا | شاکر ئەفەندی | یوزباشی[3] | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای زانیاری بەسود و پاراستنی تەندروستی | تۆفیق ئەفەندی | مولازمی یەکەم | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای زمانی تورکی | ئەحمەد عیزەت ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای وێنە | قاسم ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای خەتخۆشی | محەمەد سەعدی ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای چاودێر (پشکنەر)ی سەرەکی | ئەحمەد ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای چاودێر (پشکنەر)ی دووەم | عەبدولڕەحمان ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | | | |
| **قوتابییانی ئاماده (هەبوو)ی ساڵی خوێندنی ١٣١٤ ـ ١٣١٥** | | | | | | | | |
| شەوانە | | | | ڕۆژانە | | تێکڕا | | |
| بەکرێ | | بێ کرێ | | | | | | |
| موسڵمان | ناموسڵمان | موسڵمان | ناموسڵمان | موسڵمان | ناموسڵمان | موسڵمان | ناموسڵمان | خزمەتگوزار |
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٣٣٢ | ٩ | ٣٣٢ | ٩ | ٢ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| **قوتابخانەکانی ڕوشدییە**[٤] | | | | | |
| **قوتابخانەی ڕوشدییەی سلێمانی** | | | | | |
| مامۆستای یەکەم | عەبدولفەتاح ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای دووەم:<br>مامۆستای خەتخۆشی | عەبدوڵا عیرفان ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| قوتابی: ٣٠ خزمەتگوزار: ١ | | | | | |
| **قوتابخانەی ڕوشدییەی کەرکوك** | | | | | |
| مامۆستا | عەبدولقادر ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| جێگر | ڕەئوف ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای خەتخۆشی | عەبدوڵا ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| قوتابی: ٥٣ خزمەتگوزار: ١ | | | | | |
| **قوتابخانەی ڕوشدییەی ڕواندز** | | | | | |
| وەکیلی مامۆستای یەکەم | شێخ عەلی ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای خەتخۆشی | محەمەد عارف ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| قوتابی: ٣٠ خزمەتگوزار:١ | | | | | |
| **قوتابخانەی ڕوشدییەی ئەربیل** | | | | | |
| مامۆستای یەکەم | عەبدولحەکیم ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | |
| مامۆستای خەتخۆشی | محەمەد ڕەشید ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| قوتابی: ٣٥ خزمەتگوزار:١ | | | | | |
| **قوتابخانەی ڕوشدییەی سەلاحییە**[٥] | | | | | |
| بریکاری مامۆستای یەکەم | محەمەد ڕەفعەت ئەفەندی | ٠ | ٠ | | ٠ |
| مامۆستای خەتخۆشی | مستەفا ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| قوتابی: ٣٠ خزمەتگوزار:١ | | | | | |
| **قوتابخانەی ڕوشدییەی کچان لە ناوەندی ویلایەت** | | | | | |
| مامۆستای یەکەم (ژن) | هەڵوەشاوە | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای دووەم (ژن) | سەبیلە خانم | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |

| قوتابی: ٢٠ خزمەتگوزار:١ | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| **قوتابخانەی ڕوشدییەی سەربازی سلێمانی** | | | | | |
| بەڕێوەبەری قوتابخانە | عارف ئەفەندی | قول ئاغاسی[٦] | ٠ | ٠ | |
| مامۆستای وێنە | ئیبراهیم ئەفەندی | یوزباشی | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای زمانی فرەنسی | شەوقی ئەفەندی | یوزباشی | ٠ | ٠ | ٠ |
| ئەفسەری ناوخۆیی | نەقشی ئەفەندی | یوزباشی | ٠ | ٠ | ٠ |
| ئەفسەری ناوخۆیی | مستەفا ئەفەندی | مولازمی دووەم | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای ئیملا | عەبدوڵا ئەفەندی | رابیعە[٧] | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای عەرەبی | سەید محەمەد ئەفەندی | لە عیلمییەوە[٨] | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای فارسی | محەمەد ئەفەندی | لە عیلمییەوە | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای ڕێزمان | ڕەشید ئەفەندی | لە عیملییەوە | ٠ | ٠ | ٠ |
| مامۆستای خەتخۆشی | سەید شوکری ئەفەندی | لە مولکییەوە[٩] | ٠ | ٠ | ٠ |

**قوتابیانی ئامادە (هەبوو)**

| موسڵمان | ناموسڵمان | تێکڕا | خزمەتگوزار |
|---|---|---|---|
| ١٠٦ | ٠ | ١٠٦ | ٥ |

## قوتابخانەکان

| لیوا | قەزا | ناوی قوتابخانە | شوێنەکەی | مامۆستاکەی | ژمارەی قوتابی | دامەزرێنەر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| موسڵ | موسڵ | ئاغالەر جامیعی | بابەلجسر | جەلیلی سلێمان بەگ | ١٨ | ئیسماعیل ئاغا و براکانی |
| موسڵ | موسڵ | جامع ئەلپاشا | سوق کەبیر | موفتی محەمەد ئەفەندی | ١٠ | حاجی حسێن و سلێمان پاشالەر |
| موسڵ | موسڵ | عەبدیلیە | بابەلسەرای | عەبدولرەحیم ئەفەندی | ٥ | حاجی عەبدال |
| موسڵ | موسڵ | ئەحمەدییە | بابەلسەرای | یوسف ئەفەندی | ١١ | ئەحمەد ئەفەندی کاتبی عەرەبی |
| موسڵ | موسڵ | نعمانییە | سەراجخانە | عەبدولوەهاب ئەفەندی | ٨ | نعمان پاشا |
| موسڵ | موسڵ | یەحیا پاشا | سەراجخانە | عەبدولوەهاب ئەفەندی | ٧ | یەحیا پاشا |
| موسڵ | موسڵ | رابیعییە | رابیعییە | ئەحمەد ئەفەندی | ٦ | رابیعە خاتوون |
| موسڵ | موسڵ | حەسەن پاشا | رابیعییە | یوسف ئەفەندی | ١٥ | حەسەن پاشا |
| موسڵ | موسڵ | بابەلروتوب | بابەلروتوب | محەمەد ئەفەندی | ٥ | عەبدولا بن جەرجیس |
| موسڵ | موسڵ | نەبی شیت | گەڕەکی جوبە | عەبدولرەحمان ئەفەندی | ٢٩ | جەلیلی ئەحمەد پاشا |
| موسڵ | موسڵ | حاجی زەکەریا | بابەلجەدید | محەمەد ئەفەندی | ١٤ | حاجی زەکەریا |
| موسڵ | موسڵ | بابەلبەیز | بابەلبەیز | عەبدولفەتاح ئەفەندی | ٦ | محەمەد پاشا |
| موسڵ | موسڵ | مەحمودین | مەحمودین | عەبدولرەحمان ئەفەندی | ٦ | محەمەد پاشا |
| موسڵ | موسڵ | عومەرەین | بابەلجەدید | ئەمین ئەفەندی | ٢ | حاجی قاسم عومەری |
| موسڵ | موسڵ | نەبی یونس | گوندی نەینەوا | سەید حەسەن ئەفەندی | ٨ | نادیار |
| موسڵ | موسڵ | حاجی حسێن بەگ | بابەلمەسجید | محەمەد عەلی ئەفەندی | ١٢ | حاجی حسێن بەگ |
| موسڵ | موسڵ | حنیاتییە | گەڕەکی ئیمام ئیبراهیم | محەمەد ئەفەندی | ١٠ | محەمەد ئەفەندی |
| موسڵ | موسڵ | یونس ئەفەندی | ڕەشلکور | ئەسعەد ئەفەندی | ٤ | یونس ئەفەندی |
| موسڵ | موسڵ | عەبدولا بەگ | ڕەشلکور | ..عار محەمەد ئەفەندی | ٦ | عەبدولا بەگ |
| موسڵ | موسڵ | مەحمود بەگ | بابەلنەبی | محەمەد ئەفەندی | ٠ | مەحمود بەگ |
| موسڵ | موسڵ | نەبی جەرجیس | نەبی جەرجیس | مەحمود ئەفەندی | ٦ | نادیار |
| موسڵ | موسڵ | حەمولقەدۆ | مەیدان | ئەحمەد ئەفەندی | ٦ | حاجی عەبدولا |
| موسڵ | موسڵ | جەمشیدییە | جەمشید | محەمەد ئەفەندی | ١٠ | بەکر ئەفەندی |
| موسڵ | موسڵ | نەباتلحەسەن | قویومجیلەر | یوسف ئەفەندی | ٣ | شەهیدزادەلەر |
| موسڵ | موسڵ | جامع خەزام | جامع خەزام | داود ئەفەندی | ٢ | شێخ و حاجی خەزام |

| موسڵ | موسڵ | حاجی شەریف | بابلسەرای | ...عار زادە محەمەد ئەفەندی | ٥ | حاجی محەمەد عەلی و شەریف چەلەبیلەر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| موسڵ | موسڵ | نەبی دانیاڵ | نەبی دانیاڵ | حاجی سوڵتان ئەفەندی | ٩ | محەمەد پاشا |
| موسڵ | موسڵ | جیوبحاتی | بابەلجەدید | ڕەزوای محەمەد ئەفەندی | ٧ | لەلایەن خەڵکەوە |
| موسڵ | موسڵ | حاجیات | بابەلبەیاز | ڕەزوای عەبدولباقی چەلەبی | ١٠ | مەحزەرباشی |
| موسڵ | موسڵ | مەحزەرباشی | بابلنەبی | فەیزی زادە محەمەد ئەفەندی | ٣ | مەریەم خاتوون |
| موسڵ | موسڵ | جامع ئەلخاتون | حەوش ئەلخان | عەبدولڕەحمان ئەفەندی | ٤ | حسێن وەلی |
| موسڵ | ئامێدی | قوبهان | لەناو ئامێدی | موفتی ئەسعەد | ١٢ | سەید خان بەگ |
| موسڵ | ئامێدی | مەدرەسەی جەدید | لەناو ئامێدی | مستەفا ئەفەندی | ٨ | شێخ محەمەد ئەفەندی |
| موسڵ | ئامێدی | بامەڕنی | گوندی بامەڕنی | نەجمەدین ئەفەندی و سەعید ئەفەندی | ١٥ | شێخ عەبدولا |
| موسڵ | ئامێدی | بیروشك | گوندی بیروشك | شێخ عەبدولا ئەفەندی | ١٠ | شێخ عەبدولا |
| موسڵ | ئامێدی | شێخ مەعروف | گوندی دەرکل شێخان | شێخ مەعروف ئەفەندی | ٦ | شێخ مەعروف |
| موسڵ | ئامێدی | سەید نوری | گوندی بیسکی | سەید نوری ئەفەندی | ٦ | سەید نوری |
| موسڵ | ئامێدی | مایە | گوندی مایە لە ناحیەی بەرواری | تەها ئەفەندی | ٨ | قوباد پاشای خانەدانی ئامێدی |
| موسڵ | زاخۆ | قوتابخانەی عیلمیە | لەناو شارۆچکەی زاخۆ | مەلا ئەحمەد ئەفەندی | ١٤ | لەلایەن خەڵکەوە |
| موسڵ | سلێمانی | خانەقا مەولایی | دیرکەزێن (دەرکەزێن) | مەلا موسا ئەفەندی | ١٢ | مەحمود پاشای بابان |
| موسڵ | سلێمانی | باش چاوەش | سەرچەمەن | حاجی مەلا ڕەسوڵ ئەفەندی | ١٦ | عەبدولڕەحمان ئاغا |
| موسڵ | سلێمانی | مەلا عەلی خانەقاهی | سەرچەمەن | مەلا مەحمود کوری حاجی عەلی ئەفەندی | ٤ | مەلا عەلی نیزامی |
| موسڵ | سلێمانی | شێخ عەبدولکەریم | خوارتێکە | شێخ عەبدولکەریم ئەفەندی | ٧ | شێخ عەبدولکەریم |
| موسڵ | سلێمانی | شێخ مەعروف قەرەداغی | شێخ عەبدولڕەحمان | شێخ ئەمین کوری شێخ مەعروف | ١٠ | لەلایەن خەڵکەوە |
| موسڵ | سلێمانی | تەکیە | تەکیە | شێخ ئیسماعیل | ٣ | حاجی بەگ |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| موسڵ | سلێمانی | شێخ عەبدولای ئەربیلی | شێخ عەبدولا | مەلا محەمەد ئەمین | ١٢ | شێخ عەبدولا کوڕی شێخ ئەحمەد |
| موسڵ | سلێمانی | مەلا عەزموز | مەیدان | شێخ عەبدولرەحمانی عازبانی | ٥ | خەڵکی گەڕەك |
| موسڵ | سلێمانی | حاجی مەحمورین | سەرشەقام | مەلا قادر کوڕی مەلا عوسمان | ٥ | حاجی مەحمود ڕەشی |
| موسڵ | سلێمانی | خانەقای مەلا عوسمان | خانەقا | مەلا سالەح | ١٤ | مەلا عوسمان کوڕی حاجی ئیسماعیل |
| موسڵ | سلێمانی | مەحمود سورە | سەرشەقام | مەلا حسێن | ٨ | مەلا مەحمودە سورە |
| موسڵ | سلێمانی | شێخ یوسف | سەرشەقام | شێخ ئەحمەد | ١١ | مەلا عەلی |
| موسڵ | سلێمانی | مەلا عەلی | سەرشەقام | مەلا غەفوری کوڕی مەلا عەلی | ٦ | حاجی مەحمود ڕەش |
| موسڵ | سلێمانی | زوبەیدەخان | چەهارباغ (چوارباخ) | مەلا عومەری کوڕی مەلا محەمەد | ١٥ | زوبەیدەخان |
| موسڵ | سلێمانی | حاجی عەبدولرەحمان | مەیدان | حاجی ئەحمەد دەهایزوبی | ٨ | حاجی عەبدولرەحمان بەگ |
| موسڵ | سلێمانی | جامع کەبیر | کانی ئاسکان | مەلا ئەحمەدی شنیکی | ٨ | عەبدولرەحمان پاشای بابان |
| سلێمانی | سلێمانی | بن ئەبیق | بن ئەبیق | عەبدولا عیرفان | ٧ | مەلا عوسمان |
| سلێمانی | سلێمانی | شێخ قادر گولانی | قامیش | شێخ مستەفای کوڕی شێخ قادر | ٧ | عەبدولا پاشای بابان |
| سلێمانی | سلێمانی | مەلا گوندرون | کانی ئاسکان | مەلا گوندرون | ٢ | عەبدولا پاشای بابان |
| سلێمانی | سلێمانی | جامعی شێخ سەلام | شێخ سەلام | شێخ عەزیز | ٥ | شێخ عەبدولسەلام |
| سلێمانی | سلێمانی | حاجی ئاخان | کەوسەرە | شێخ مەعروف | ٨ | حاجی ئاخان |
| سلێمانی | سلێمانی | مەحمود ئاغا | سەرای | مەلا محەمەد ئەمین ئەفەندی | ٣ | مەحمود ئاغا |
| سلێمانی | سلێمانی | مەلا ئەحمەد هەرمەنی | بن ئەبیق | حاجای مەلا سالح | ٦ | سلێمان پاشای بابان |
| سلێمانی | سلێمانی | نەقیب | نەقیب | سەید ئەحمەد ئەفەندی | ٤ | نەقیبی پێشوو سەید ئەحمەد ئەفەندی |
| سلێمانی | سلێمانی | موفتی | سەید حەسەن | مەلا مستەفا | ٣ | عەبدولرەحمان پاشای بابان |
| سلێمانی | سلێمانی | شێخ عەبدولرەحیم بەرزنجی | شێخ محەمەد | سەید محەمەد بەرزنجی | ٨ | سلێمان پاشای بابان |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| سلێمانی | سلێمانی | شێخ محەمەدی خاڵ | خانەقا | حاجی شێخ ئەمین ئەفەندی | ٧ | سلێمان پاشای بابان |
| سلێمانی | سلێمانی | هەمزە ئاغا | شێخ مەعروف | شێخ مەعروف | ٥ | هەمزە ئاغا |
| سلێمانی | سلێمانی | شێخ ئەبوبەکر | سەرچەمەن | باباعەلی | ٤ | شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ ئەبوبەکر |
| سلێمانی | سلێمانی | جامعی دلرئاغا | سەرچەمەن | حاجی ئەمین | ٢ | محەمەد ئەمین دلرئاغا |
| سلێمانی | سلێمانی | خەیاتییە | محەمەد ساڵەح بەگ | مەلا محەمەد ئەحمەر | ٦ | حاجی عەزیزی خەیات |
| سلێمانی | سلێمانی | چاومار | شەقامی سەرا | حاجی مەلا ئەمین ئەفەندی | ٧ | مەلا ئەحمەد موفتی چاومار |
| سلێمانی | سلێمانی | شێخ ئەحمەدی تاڵەکی | کۆزە | مەلا مەحمود ئەصم | ٢ | عەزیز مەسروف |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید ١٠ | کانی چاولن | گوندی مەرگە | مستەفا ئەفەندی | ١٢ | هاوڕێکانی فەقێ قادر |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | مەلازادەکان | گوندی مەرگە | عەلی ئەفەندی | ٥ | مەجید بەگی سەلاحییەیی |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | کانی زمردەشن | گوندی مەرگە | عەبدولا ئەفەندی | ٣ | هاوڕێکانی حاجی محەمەد |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | جانان | گوندی مەرگە | مەلا عەبدولا | ١١ | محەمەد بەگ |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | بەیمون | گوندی بەیمون | مەلا محەمەد ئەمین | ٥ | قوخپەیرە |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | کوێخا محەمەد | گوندی کانی تو | مەلا ئیبراهیم ئەفەندی | ١٣ | کوێخا محەمەد |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | مەلازادەکان | گوندی گەنلو | مەلا عوسمان ئەفەندی | ١٥ | مەلازادەکان |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | مەلا غەزلیی | گوندی گسناو | مەلا غەزلیی ئەفەندی | ٠ | مەلازادەکان |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | قەلعەی دیزە (قەلادزێ) | گوندی قەلعەی دیزە | عەبدولڕەحمان ئەفەندی | ١٣ | حوسنی ئەفەندی قایمقام |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | بەشیر | گوندی بەشیرییە | حەنیفە مەلا ئەحمەد | ٧ | لەلایەن خەڵکەوە |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | مەلا عوسمان | گوندی مەرسونییە | مەلا عوسمان | ٩ | لەلایەن خەڵکەوە |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | مەلا ئیبراهیم | بیقلاس | مەلا ئیبراهیم | ١٠ | لەلایەن خەڵکەوە |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | شوران | گوندی شوران | مەلا محەمەد ئەفەندی | ١٥ | لەلایەن خەڵکەوە |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | شێخ محەمەد | گوندی تیمار | شێخ محەمەد ئەفەندی | ١١ | لەلایەن خەڵکەوە |
| سلێمانی | مەعمورەتولحەمید | شێخ عەلی | سەرکار (سەرکاو) | شێخ عەلی ئەفەندی | ٦ | لەلایەن خەڵکەوە |

